بیرەوەری رۆژانی سەختی خەبات
نووسەر: ئەحمەد کوردە
تایپ : خۆشیمان و دیدار کوردە
دیزاین : سەردان کوردە
ئامادەکردن :ئاری کوردە
پێدا چوونەوە :سەفین سابیر کوردە
بەرگ :رئووف خەتیبی
چاپ : چاپخانەی سید برایم ـ کۆیە

لە بەرێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی( ١٩٨ )سالی
( ٢٠٠٩ ) ی پێدراوە

پێشکەشەبە:

دایکی خوالێ خۆش بووم.

خوێنی گەش و پیرۆزی شەهیدان.

یادی ٣٣ ساڵەی خەباتی پێشمەرگایەتیم.

هەموو پێشمەرگەیەك کەبۆ ئازادی وسەربەخۆیی تێکۆشاوە .

## پێشەکی

**مامۆستا عوسمان کانی دەربەندی**

نوسینەوەی تەمەنێکی ٣٣ ساڵەی پێشمەرگایەتی بۆکەسێکی هەژاری وەك کاك ئەحمەد کوردە کارێکی وائاسان نیە کەخەڵکی بیری لێ دەکەنەوە بەتایبەتی بۆئەو کەسانەی کە لەگەڵ ئازارو مەینەتیەکانی ئەم گەلە دەژین چونکە کێشەی گەلی کورد کێشەیەکی تا بڵێ ی ئاڵۆز بووە ، بە دەیان کارەسات و سەر کەوتن و دابەزینی تێدا بووە ،زۆریش دوژمنی زەبەلاح و بچوك و هەمە چەشنی بەگژا هاتووە ، گەلانی دونیا هەوڵ و تێکۆشان و مەینەتی وخەباتی زۆرو خوێنی زۆریان ڕشتووە هەتا لەژێر ئالآی خۆیان دانیشتون یان ئازاد بوون، بێ گومان ئێمەش بەشێکین لەم جیهانە دەبێ وەك چۆن بووە تێکۆشان و شۆڕش لەدوای شۆڕش بکەین تا دەگەینە ئەو ڕۆژە پیرۆزە کە بەرز کردنەوەی ئالآی کوردستانە لەخاکی کوردستان ، کورد تاکو ئێستا دۆستی ڕاستەقینەی نیە و دوژمنی زۆر زیاترە لە دۆستی ، زیندوو کردنەوەی کارەکانی چەند ساڵی لەمەو بەر زۆر شتی بەنرخ و بەسود فێری نەوەی نوێی ئەمڕۆ دەکات و لەهەمان کاتیش دا زۆر برینی لەمێژینەش دەکولێنێتەوە بەلام گرنگیشە بنوسرێ بۆ ئەوەی نەوەی نوێ بزانێ ڕابردوی گەلەکەی بەچ قۆناغێك دا گەیشتۆتە ئێرە ، لەنوسینەوەی ئەم جۆرە یاداشتانەش بۆ پێشمەرگەیەکی وەك کاك ئەحمەد کوردە ئاسان نیە چونکە دەبێت هەقی کەس لەبیر نەکات ، جێ دەستەکان دیاری بکات ، دۆڕان و براوەکان بخاتە بەر دەستی نەوەی نوێ ،شۆڕش گێڕو خۆفرۆش لەیەك جیا بکاتەوە لەگەڵ ئەمانەش دڵی کەسیش لە خۆی زویر نەکات بۆیە نوسینەوەی ئەم جۆرە نوسینانە وردەکاری وماندوبونێك و کاتێکی زۆری دەوێت،

سی و سێ ساڵە کاك ئەحمەد کوردە بەشداره لەشۆڕش و خەبات ، لەهەموو شۆڕشەکان کەتوشی کزی ولاواز بوون هاتوون بەلام بەهیمەتی کەسانی سیاسی وسەربازی چەند پێشمەرگەیەکی وەك کاك ئەحمەدو بەهیممەتی گەل سەر لەنوێ کەوتۆتەوه سەرپێ ، شۆڕشی ئەیلول چەندساڵێکی خایاند بەزۆر قۆناغی ترسناك دا تێپەڕبوو، وەزۆر کاری باشی بۆ میللەت کرد گەلێك شەرو پێك دادانی لەگەڵ دوژمن کرد کۆمەڵێك شەهیدیشی لە پێناوی خاکی کوردستان دا ٠

ـ شۆڕشی نوێی کوردستان بەڕابەرایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەرۆژێکی دژوارو هەل و مەرجێکی زۆر سەخت کە حکومەتی بەعس لەو پەڕی دەسەلات وبەهێزی دابوو تینوی خوێنی گەلەکەمان بوو ، لەدوای شۆڕشی ئەیلول ڕژێمی بەعس وەك سەگی هاری لێ هاتبوو وای دەزانی لە کوردستان رۆڵەی قارەمان و شۆڕشگێڕ نەماوه ، هەر کەسێك بۆنی کوردایەتی لێ بهات یا لە سەری دەداو خوێنی گەشی دەپڕژاند ٠

بەعسیەکان و عەرەبە شۆڤێنیەکان دروشمی نەمانی نەژادی کوردیان هەلگرتبوو رۆژ بەڕۆژ زیاتر ئەو سیاسەتەیان بەکردەوه پیادە دەکرد دەیان ویست کورد نا ئومێد بکەن و هەستی کوردایەتی لەدڵ و دەرونی کورد دەربهێنن، پەرش و بڵاو وپەرتەوازەمان بکەن مەیدانی کوردستانیان بۆ بەجێ بهێڵین تا ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان مەرامی بۆگەنی خۆیان جێبەجێ بکەن ٠

لەڕۆژێك دا کە تاریکی باڵی ڕەشی ترسناکی بەسەر کوردستان دا هێنابوو کورد لەخاکی خۆی بە بێگانەو هاوولاتی ژمارە دوو و سێ حساب دەکراو شەڕەف و کەرامەت و مافەکانی کورد پێشێل دەکرا ، عەرەبە شۆڤێنیەکان چەقۆیان تیژ

دەکرد تا سەری میللەتەکەمان ببڕن ، هەڕەشە لە بوونی ڕەگەزی کوردی دەکرا ، ژیان لە کوردستان تاڵ کرابوو ، ڕۆژ بەڕۆژ پیلان لە سەر کورد زیاتر دەبوو ٠٠

لەو کاتەدا چەند تیکۆشەرو قارەمان وسیاسەت مەداروجوامێری ئەم میللەتە بەستەزمان و هەژارو بێکەسە بێ هیچ پشت و پەنایەکی دەرەکی بەچەند چەکێکی ژەنگاوی کەلە شۆڕشەکان لەژێر گڵ نرابوون و شاردرابوونەوە ڕوبەڕووی ئەم دەسەڵاتە وەحشیەو بەهێزەی ڕژێمەی بەعس بوونەوە ،بۆیە من دەڵێم تاوەکو میللەتی ئێمە بوونی هەبێت لەسەر ئەم خاك و نیشتیمانە دەبێت شانازی بکەین بەم تیکۆشەرانەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ٠

کاك ئەحمەد کوردەش یەکێکە لەم قارەمانانە کە پێ بە پێی ئەم شۆڕشە ڕزگاری خوازە بەژدار بووە تاك و ئەم ساتەش، زۆر کارەساتی جەرگ بڕو ڕووداوی سەیرو سەمەرەو جوامێرانەی بەسەر هاتووە .
کاك ئەحمەد کوردە یەکێك نەبووە لەوانەی ( ڕۆژی ڕەش ڕوو لە پاش بێ و لەڕۆژی خۆشیش سینگ لە پێش بێ ).

دوژمنانی میللەتەکەمان بەهەموو جۆرێك هەموو هەوڵێکی خۆیان تاقی کردەوە بۆ تاواندنەوەی شۆڕش هەر لە سەرەتاوە ،بەڵام بەخۆش حاڵیەوە بۆیان نەکرا ،دوژمنان دۆستایەتی شۆڕشە کا نیشیان هەر بە پیلان بوو ، بۆ ناژاوە نانەوەو تێك هەڵچوون ٠

ئەم شۆڕشە نوێ یە تووشی چەندین هەورازو نشێو بوو بەلام بەلێهاتویی سەرکردەکان و بە جوامێری و لەخۆ بردویی پێشمەرگە قارەمانەکانی تا دەهات

شۆڕش بەهێز تر دەبوو .هەموو بەرزاییـەکانیان نـزم کـردو نزمایەکانیـشیان پڕدەکردەوە و پیلانەکانی دوژمنیان هەرەس پێ دەهێنا ، ئەم کارانەو چـەندین کاری تری ژێر بەژێر هەر ئەوها بەئاسـانی نـەکراوە بـەڵکو بـەرژانی خـوێنی گەشی چەندین رۆڵەی قارەمانی گەلەکەمان کراوە ئینجا بەلەخۆ بردویی و چاو نەترسیی و خۆڕاگری میللەتی کورد ٠
شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بەهێزو بازوو وکۆڵ نەدان و شەو نخونی و خوێن ڕژانی پێشمەرگە دلێرەکانی ئـاگری کوردایـەتی لـە سـەر هـەموو لوتکـە چـیاکانی کوردستان کردەوە ،لەشۆڕشی نوێدا کاری ئەوەندە قارەمانانـەو پێـشمەرگانەو کوردانە کراوە دوژمنانیش درك بەم ڕاستی یە دەکەن ، دروست بوونی سەنگەرێکی نوێ بەرامبەر دوژمن و داگیرکەرانی کوردستان بووە هۆی شـڵەژانی دوژمنا نمـان لەڕەگ و ڕیشەوە ،هـەروەها بـووە هـۆی دروسـت بوونـەوەی هەسـت و ئەسـتی کوردایەتی ، شۆڕشی نوێ ئەم جارە تۆڵـەی خـوێنی کـوردی کردەوە،نەیهێـشت بەفیڕۆ بچێ ،لە کۆتـایدا هیوایی سەرکەوتن و تەمەن درێژی بۆ کـاك ئەحمـەد کوردە دەخوازم ٠٠٠

## کەسایەتی پێشمەرگە

پێشمەرگە ئەوکـــــــــەسەیە کەلەڕۆژگارە تاڵەکان چەکی شەرەفی کردە شان لەهەموو ئـارەزووە تایبەتیـەکانی خـۆی خـۆش بـوو لـە پێناوی ئـازادی وسەربەخۆیی و مافی ڕەوای گەلەکەی ،بەتەواوەتی تواوەی ناودڵی گەلە،ئەوەی ناوی بنێن ترس لەگیانی پێشمەرگە دانیە، پێشمەرگە کەسێکە تابڵێی بەوەفاو بەئەمـــەك و بـــەتواناو لەســـەر خۆیە،دڵـــسۆزی گـــەل ونیـــشتمانە ،گوێڕایەڵە،بەویژدانە،نهێنی پارێزە ،بەرگری کارە لەخاك وناموس وشەرەفی گەلەکەی ، پێـشمەرگە کەسـێکە مانـدوو نەناسـە ،کەسـێکە زۆرتـرین دووری بـە پێ بڕیـوە ، پێـشمەرگە کەسـێکە وەك ئـەژدیها چـۆتە خـەونی دوژمنـان

وەهەروەك فریشتەش چۆتە خەونی گەلەکەی ، پێشمەرگە کەسێکە موقنیع بــووە بەنان وئاوێك هەرەوەها بەجوتێ پێلاوی لاستیك ، پێشمەرگە هەموودەم پــشت ئەستووربووە بەشاخ وبەرزایی لەکوردستان ئینجا بەدڵسۆزی وبەدەنگەوە هاتنی گەلەکـەی ، پێـشمەرگە هــەردەم کۆسـپ بــووە بــۆ دوژمــن بە پێـچەوانەشەوە بۆگەلەکەی بۆتە پرد بۆپەڕینەوەیان، پێشمەرگە کەسـێکە سـەروماڵ وگیــانی خــۆی بەخــشیوە لــە پێناوی ئــازادی بۆگەلەکــەی ،خــۆینی بۆڕشــتووە ( شەهیدبووە،کەمئەندام بووە ،نابینا بووە ،کەڕولاڵ ) بووە،شەو نخونی کردووە ،میللەتی کوردی بەدونیا ناســاندووە ، پێـشمەرگە گــەرما و بــەفر و ڕەهێڵــەی نەزانیوە،رۆژگارە تاریکەکانی بۆگەلی کورد رۆشن کردووە، پێشمەرگە بۆلێـدانی دوژمن رەشەبا ناسایە لەڕەگ وریشە هەڵی دەتەکێنێ ، پیشمەرگایەتی کــارێکی ئارمزوو مەندانەیە دەگەڕێتەوە بۆ هەست وسۆزی نیشتمان پــەروەری وبــەهێزی بیروبـاوڕ ، پێشمەرگەیاتی دووجۆرە:-
یەکەمیان پێشمەرگەی چەك بەدەستەو چەکدارە لەدەشت وشاخ ودۆڵەکان .
دووەمیان بێ چەکەو کاری نهێنی وڕێکخستنە کەلەناوشار و دەست و پێوەنــدی دوژمن خۆی مەلاس دەداو زانیاری دەدا بە پێشمەرگەی یەکەم کەچەکدارە.
پێشمەرگە هەرچی لەسەری بنوسی هەرگیز تەواونابێ بەلام ئەوندە دەڵێم
***پێشمەرگە تاکە سەرمایەی میللەتی کوردە .***
دڵسۆزتان
ئەحمەدکوردە

## باسێـــك لەژیان

ئەحمەد کـــوردە ( ١٩٧٤ـ ١٩٨٩ )

من ئەحمەد کوڕی عزیز کوڕی رەسوڵ کوڕی حسن – لەدایك بـوی سـاڵی ( ١٩٥٧ ) باپیرم لە کوردستانی ئیرانەوە هاتووە بۆکوردستانی عێراق ،لەسـاڵی ( ١٧٦٩ ) ی زاینـی لەشـاری کۆیـە جێگیربووە،بـا پیرم لەتەمـەنی ٢٩ سـاڵی مـەلابووە قورئانی پیرۆزی ( لەبەربووە )، چوار براشی لەگەڵ بووە پاش ماوەیەك مانەوەی بە مەلایەتی لە کۆیە،جەلال بەگی فتاح بەگ ، خـەڵکی سـلێمانی بـووە،برای خانزادە جوانی فتاح بەگی سلێمانی لەکۆیە قائمقام دەبێت ،دەبێتـە بـرادەری باپیرم وخوشکێکی خۆی دەدات بە باپیرم بەناوی ( زولێخا فتـاح بـەگ ) ،دوای چەند ساڵێك باپیرم دووکوڕی لەوژنە دەبێت ،بـەناوی( حـسن وحـسێن ) دواتـر داوای لێکراوە بچێتە گوندی مام قلینج لەبەرئەوەی مەلایان نەبووە،ئەویش ژن وماڵەکەی و دووبرای دەبات ودەچێت بۆ گونـدی مـام قلیـنج ، پـاش ماوەیـەك برایەکی بـە نەخۆشـی لـەمام قلیـنج کۆچـی دوایـی دەکـات بـەناوی سمایـل ( لەبەرزاییەك لەنزیك گوندی دەینێژن تا ئێستاش ئـەم گـردە بـەناوی گـردی برای مەلای بەناوبانگـە ) ، برایەکـەی تـری بـەناوی( حمکـۆ ) بێزاردەبێـت و دەگەڕێتەوەبۆ کوردستانی رۆژهەلات ،دوو براکەی تـری بـەناوەکانی( بـرایم و عبداللـــە ) لەکۆیـــە ژن دەهێـــنن و جـــێگیر دەبـــن تائێـــستاش نـــەوەکانیان لەکۆیەن،باپیرم چـەند سـاڵێك دواى براکـانی بەمەلایـەتی لـە مـام قلیـنج

دەمێنێتەوە خانویکی خرا پۆکەی دەبێت، کە لە قوورو دار دروست دەکرێت سالێك لەسالەکان زستانی زۆر سەخت دەبێت، مەلا ڕەسولی بـا پیرم سـەفەرێك دەکـات بۆلای هەولێر بۆلای خزمەکانی لەعەشـیرەتی گـەراری، وادیـارە کـە ئـەویش ناونیـشانی خزمـانی خۆمـانی هـەبووە ئێمـەش لەبا پیرمانـەوە سـەرجەلەی نوسراومان بۆ بەجێ ماوە کـە ئێمـە لـە تـیرەی( گـەراری ) یـن ، تـا بـا پیرم دەگەرێتەوە هەردوو مندالەکەی و ژنە داماوەکەی بەبن خانووە شڕەکەیەوە دەبن ، لەوزستانە سەختە ژنەکەی مالئاوایی لەبا پیرم ومندالەکانی و خەلکی گوندی مام قلینج دەکات .مەلاڕەسولێ سەرگەردان و بێمـالێ دەمێنێتـەوە ڕۆژێکیـان لـە مزگەوت داوا لە خەلکی گوندی دەکات و دەلێت ئەگـەر ڕێگـام پـێ بـدەن بـڕۆم زۆرتـان لێ مەمنون دەبم چونکە ناکرێت من هـەر ڕۆژە و هـەر ژەمـەی لـەمالێك بەسەر ببەم بەدوومندالەوە زۆر شـوکر بـۆ کـاری خـوا وادیـارە قـەدەری مـن وەهایە، بەلام پیاو ماقولێ وریش سپی گونـــــدەکە زۆر ڕێزی لێـدەگرن و دلـی ئەدەنەوەو پێی ئەلێن خودا گەورەیەو سەبر بگرە، پاش چەند سالێك هەر لـەو دێ یە ، گەورە کچێکی ئەدەنێ بەناوی ( فاتیمە کوێخـا امـام )،مـەلا ڕەسـولی با پیرم لەگەلێ فاتیمە هەرلەو گوندە دەژین ، خوای گەورە دوو کوڕو دووکچی پێ داوە کوڕەکانی بەناوی ( عزیز،ڕەشید ) کچەکانی بەناوی ( زەینەبە ،ئامینە )

ـــ ( حـسن ) لەشـاری کۆیـە ژنـی هێنـاوە بـەناوی ( عیـشێ ) دووکـوڕی بەناوی( عومر وتـاهیر ) وە دووکچیشی بەناوی ( ئامینە ، ڕەحمە ) دەبێت

ــ ( حسین ) گەنج بووە وژن ومالی نەبووە ڕوی کردۆتەوە کوردسـتانی بـاکور بۆکاسبی بەلام تـائێستاش بێ سەروسۆراغە

ـ ( عزیز ) کەدەکاتە باوکم دوو ژنی هێناوە دایکی گەورەم بەناوی ( ئایشە حمد ) ئایشە کوڕی بۆنەژیاوە،کوڕێکی ناو زاهیری بووە بەلام مردووە، پێـنج کچیـشی

بووە بەم ناوانە (صافیە ، گوڵستان ، بەسێ ، شوکریە ، عائیشە ) باوکم ژنێکی تری هێناوە بەناوی (کلێ سمایل دەروێش ) خەڵکی گوندی مام قلینج بووە و کچی خۆیی پێداوە بەناوی (گوڵستان ) ،(کلێ ) سێ کوڕو سێ کچی بووە، کوڕەکان بەناوی ( سابیر ، محمد (ئەحمەد - ناسراو بە ئەحمەد کوردە ) بۆ ؟ لەتەمەنی ( ١٥ )ساڵیم لەنوسینەکانی باپیرم کەسەرجەلەی خۆی نوسیوەتەوە کە ئێمە لە هۆزی جافین لەتیرەی ( گەراری ) بۆیە بەناوی (ئەحمەد کوردە ) من بانگ کراوم لەلایەن ماڵەوەو خزمەکانمەوە، وەکچەکانیش بەناوی ( خونچە ، نەجمە ، فاتیمە ) باوکم فا تیمەی خوشکمی لە هەموومان خۆشتر ویستووە چونکە منداڵی گچکەی بووە، هەم بەناوی دایکی خۆی کردوەتەوە

ــ ڕەشید ڕەسوڵ حسن برا گچکەی هەمووان بووە بابم و مامم ڕەشید کە ئاغا دێت بۆ گوندی مام قلینج، لەسەر زەوی و زار باوکم لەگەڵ ئاغا و پیاوەکانی ئاغا ناگونجێت ،چەند جارێك هەڕەشەی لێدان و کوشتن لە باوکم دەکەن، جارێکیان پیاوەکانی ئاغا دەچن بۆ سەربانی ماڵی باوکم ،بەلام باوکم ئەو شەوە لەماڵ نابێت بەلام دایکی گەورەم یەکێك لە پیاوەکانی ئاغا دەگرێت و دەمامکەکەی لەسەر دەکاتەوە جنێوی پێدەداو دەڵێت تۆهاتوی عزیز بکوژیت !!!! ئەو شەوە پیاوانی ئاغا هیچیان بۆ ناکرێت و ڕادەکەن .دوای ئەوکاتە ئاغا دەزانێ بەهەموو توانای ئاغایەتی خۆی دەرەقەتی باوکم نایەت بۆیە هانا بۆحکومەت دەباتوباوکم بەگرتن ئەدات لەشاری کەرکوك بۆماوەی سێ مانگ ، لەماوەی ئەوسێ مانگە،ئاغا چەند ماڵێکی لەگوندی (کێلە سپی ) دەهێنێت بۆ لای خۆی لەسەر پارچە زەویەکی باوکم خانویان بۆ دەکات ،باوکیشم کە لەسجن بەر دەبێت لەگەڵ مامم ڕەشید کەژنی نابێت ماڵەکەیان باردەکەن بۆ ناوچەی هەولێر بۆ لای خزمەکانی باپیرم لە ناوچەی قوشتەپە

لەگوندی ( گردمەلا ) جێگیر دەبن ، زۆربەی ئەو گوندانەی رۆژهەلاتی هەولێر پێك هاتوون لەخزمەکانی ئێمە لەتیرەی گەرارین. لەبەر ئەوەی باوکم ومامم لەناوچەی کۆیە چووبوونە دەوروبەری هەولێر بۆیە لەوێ پێیان گووتوونە ( عزیز کۆیی و رەشید کۆیی )چەند ساڵێك لەو ناوچەیە ژیاون. مامم رەشید لەهەولێر لەخزمەکانی خۆمان ژنی هێناوە بەناوی ( زەینەبە ) کچێك ودووکوڕی لێ بووە بەناوەکانی

( سابیر، تاهیر، کافیە )، مامم رەشید لەگوندی حەساڕۆك جێگیر دەبێت، خەریکی جەرەب کڕین وفرۆشتن دەبێت ، رۆژێك رەشیدی مامم لەناوچەی موسڵ جەرەبی حەیوانی پێ دەبێت لەگەڵ چەند کەسێکی تر جەردە لێ یان دەداو دەیان کوژێت و ماڵەکەشیان دەبەن( جەردە واتە چەتە یان دزی رێگا ) سابیری ئامۆزاشم دوای باوکی حەساڕۆك بەجێ دێلێ و دەچێتە ناو شاری هەولێر هەر لەودەمەدا تاهیریش بەگەنجی لەناکاو دەمرێت. ئاغا وڕیش سپی گوندی مام قلینجیش دێن بەدوای باوکم ،دەیگەڕێننەوە ناوچەی کۆیە بۆ گوندی مام قلینج. بەم شێوەیە ژیانی باوکم بەردەوام دەبێت، لەگوندی مام قلینج، تاساڵی( ١٩٦٣ )پێشی ئەنفالەکەی حەرەس قەومی کەبەسەر کوردستان داهات بەچەند مانگێك ، باوکم کۆچی دوایی کرد. ماڵئاوایی لە هەردوو خێزانی و یازدە منداڵ وخەڵکی گوندی کرد وەکو هەموو ماڵەکانی گوندی مام قلینج ودێ یەکانی دەوروبەرمان ماڵەکەی ئێمەش کەوتە بەر درندایەتی شالاوی ئەنفالی عەرەبە شۆڤینیەکان لەکاتی هاتنی ( حەرەس قەومی ) ، هەردوو دایکە هەژارەکەم بێ سەرا مانەوە. هەرلەدوای باوکم دایکی گەورەم کچەکانی بەشوو داو خۆشی ماڵ ئاوایی لێ کردین وکۆچی دوایی کرد ،سابیری برام لەئێمە گەورەتر بوو لەگەڵ دایکم ماڵەکەیان بارکرد. بەمەبەستی کاسبی کردن

چووینە گوندی هەرمۆتە کەگوندی برا مەسیحیەکانە، ماوەی چەند سالێك لەوێ ماینەوە زۆر ڕێزیان لێ دەگرتین من خوێندنی سەرەتایم لەگوندی هەرمۆتە تەواو کرد ، دوایی ماڵمان بارکرد بۆ شاری کۆیە، کەماڵی مامم حسن وئامۆزایەکانم لەکۆیە بوون ، من لەکۆیە تا سێ ی ناوەندیم خوێند ، هێواش هێواش براکانم بەڕۆژ کاریان دەکردو بە شەویش ئەیان خوێند تاوای لێهات ئەوانیش لە نەخوێندەواری دەربازیان بوو

## پێناسەیەك بۆ گوندی مام قلینج

## گوندی مام قلینج لەچی یەوە هاتووە؟

لە سەردەمێکدا ئەوەی نوێژی بکردبا پێیان گوتووە سۆفی، پیاوێك هەبووە بەناوی باوەڕ،باوەڕ نوێژی کردووە ناوەکەشی بووە بە سۆفی باوەڕ،ئێستا ناوچەیەك هەیە لەسنوری گوندەکەمان پێی دەڵێن سۆفی باوەر بەناوی ئەو پیاوە ماوەتەوە ، سۆفی باوەر گوندێکی دامەزراندوە بەناوی کێلە برندان هەر لەسنوری ئەم مام قلینجەی ئێستا ،تاکو ئێستاش ئەم گۆڕستانە ماوەو پێی دەگوترێ گۆڕستانی کێلە برندان ،بەگوێرەی گۆڕستانەکە بێ دەبێ ئەو گوندە ژمارەی دانیشتوانی زۆر بوویێت ،سۆفی باوەر کوڕێکی هەبووە بەناوی مامە قنج ،مامە قنج تاقانە بووەو لە خۆشەویستیان ناوی نراوە مامە قنج ،لەو سەردەم تاعونێك دێت سۆفی باوەرو زۆربەی خەڵکی گوندەکە دەمرن بەو تاعونە ،دوای سۆفی باوەر ئەو گوندە بووە بە دوو بەش :-

بەشێکیان ئەومام قلینجەی ئێستایە بەناوی مامە قنج بووە ، بەلام بە گۆڕانی ڕۆژگار وردە وردە ناوەکەی گۆڕاوە بووە بە مام قلینج .

بەشەکەی تر لەرۆژهەلاتی ئەو گوندە کە پێی دەلێن دۆلە درێژە جێگیر بوون ، ئەوانیش لەژمارە زۆر بوون ،گۆرستانێکیان لە پارچە زەویەك داناوە بەناوی داریّ ،ئێستاش گۆرستانەکە ماوە ،ژنێك هەبووە بەناوی فاتیمە سەرپەرشتی ئەو بەشەی کردووە ،ئێستاش زەویەك هەیە بەناوی هەنجیر فاتیمە وادیارە ئەوکات باخچەو بەراوی هەنجیربووە ،کانی و ئاوەکە ئێستاش ماوە ،بەلام لەدوای هاتنی لەشکری عوسمانی هەموو خەلکی ئەو ناوچەیە لەگوندی مام قلینج کۆ بوونەتەوە من ئەم زانیاریانەم لە باپیرە گەورەم بۆیە جێ ماوە کەناوی مەلا رسولّ مەلا حسنە.لەدوای یەك گرتنەوەی هەردوو گوندەکە گوندی مام قلینج بەناوی مام قلینج ماوەتەوە تاکو ئێستاش ،گۆرستانەکان ئەو راستیە دەسەلمێنن کەوا گوندیکی دێرینە ( ٨ ) گۆرستانی گەورەی لیّیە بەناوەکانی (کێلە برندان ،شێخ محمد ، مام عارەب ، داریّ ،کوتکین ،سەیدۆکە ، برای مەلای ،قەبرستانی گەورە)٠

## پێکهاتەی گوندی مام قلینج :

گوندی مامقلینج پێکهاتووە لەم چەند بەرەبابە :-

ــ. بەرەبابی( مەلاڕەسوڵ ) بەرەبابی ئێمەیە عەشیرەتی گەراری

ــ بەرەبابی( سۆفی محمود ) ،عەشیرەتی مامەسێنین

ــ بەرەبابی( دەروێش سمایل ) ، عەشیرەتی مامەسێنین

ــ بەرەبابی (کۆخا ئیمام ) عەشیرەتی مامەسێنین

ــ بەرەبابی (کوێخا مستەفا ) لەبنەڕەتدا لەلای چەم چەماڵەوە هاتوون لە هۆزی هەمەوەندن

ــ لەگەڵ هاتنی ئاغاش بۆ دێ ی مام قلینج ئەم چەند ماڵە لەگەڵ ئاغا هاتوون بۆ مام قلینج پێکهاتوون لەم ماڵانە( ماڵی مەلاسورە، ماڵی سۆفی سمایل خەڵکی گوندی کێلە سپیانن( ماڵی مەلا سورە لەگەڵ ڕۆیشتنی ماڵی ئاغا ئەوانیش گوندیان جێ هێشتووە ) بەلام ماڵی سۆفی سمایلی کێلەسپیەتی ئێستاش ماینەوە.

ــ چەند ماڵێکی تری لێ بووە بەناوی ( شێخ سعیدوشێخ محمد ) ئەوانیش ماوەیەك لەدوای کۆچی دوایی باپیرم هاتونەتە مام قلینج ئێستاش هێندێکیان گۆڕەکانیان لەگۆڕستانی مام قلینجە ئەوانیش نەوەکانیان لەساڵی ( ٥٠ ) کان گەڕاونەتەوە شاری کەرکوك

## گوندی مام قلینج لەهەموو شۆڕشەکان دەوری کاریگەریان هەبووە

### لەشۆڕشی ئەیلول

ئەم ناوانەمان پێشمەرگە بووینە ( ڕەشید ئیسماعیل ، حەوێز سۆفی سمایل ، مجید سۆفی سمایل ، شفیق سۆفی سمایل ،ئازاد ڕەحمان ناسراو ( بەبێ بەش ) سابیر عزیز کوردە ، محمد عزیز کوردە ، ئەحمەد عزیز کوردە ناسراو بە ئەحمەد کوردە ، جلال وسوو ،حسێن ڕەسوڵ ، پیرۆت ئەحمەد، عەلی ئەحمەد ، واحێد وسوو ، غفور حمدامین ،ڕەسوڵ حمدامین ، مجید ئەمین ، زرار ئەمین، عوسمان ئەمین ( لەتۆپ خانە بوو ) ، بە هرام کریم ،فاتح ڕشید حمد، مەولود سمایل حمد ( مولود مام قلینجی ) ، جنگی سمایل حمد ، کاکە سوار سابیر ، محمود سمایل، خالیس مامە ،قادر حەمەسپی، ئیمام قادر ، خدر قادر ، عزیز حمد ، کانەبی بایز ، کریم بایز ، ڕەزا حەمەلان ، عزیز حەمەلان ، عباس لەشکری ، ڕەزاق وەسمان ) ئەوانە لەشۆڕشی ئەیلول بەشداریان کردووە تاکو مونتەمەرە شومەکەی جزائیر ساڵی ( ١٩٧٥ ).

هەر لەشۆڕشی ئەیلول دووشەهیدمان هەبوو بەم ناوانە( حەوێز سۆفی سمایل ناسراو بە عریف حەوێز ، مجید سۆفی سمایل ناسراو بە مجید کوردە ).

### لــە شۆڕشی نوێ

لە سەرەتای شۆڕشی نوێ لە ساڵی (١٩٧٦) ئەوانەی پەیوەندیان بەهێزی پێشمەرگەوە کرد ئەمانەن ( ئەحمەدعەزیز کوردە ، سابیر عزیز کوردە ، محمد عزیز کوردە، میرزا حەمەدامین (فەریق)، ئەحمەد بڕنەو، مەولود ئیسماعیل (مولود مام قلینجی) ).

لەساڵی (٨٠) بە دواوە ئەم ناوانە پەیوەندیان بەهێزی پێشمەرگەوە کرد ( ،ئازاد( مام بێ بەش )،مامەقالە، ئامانج تاهیر حسن ،جبارکریم،بەهرام رەشید،نادرامام، گەیلان سابیر رەشید ،حسین امام، ئەحمەد کریم ،عبدالخالق حمدامین (عەول)، رۆستەم حمدامین ،هاوار کۆخاسمایل ، صلاح حسن حسین، محمد کریم، شفیق ئیبراهیم،دلێر عومەر حسن، محمود عبدالله( رزگار) ،ناسیح رشید حمد،جبار عبدالله ،رەسوڵ حمدامین ، مۆفەق رمزا ،زاهیر رەشید ،رەئوف رەحمان ، سەلام سولێمان ، سەلاح مستەفا ،نازم تەها ئیسماعیل ،کازم تەها ئیسماعیل، ئیسماعیل مغدید ئیسماعیل ،میرزا حەمەلان،سعدی سمایل،احمد حسن عتیە، مەولود حەمە شەل ، عزیز حمد، کابان مستەفا،

ئەحمەد ئیسماعیل ،یەکێتی مجید ،شێروان زێنەدین ،جەمال جەلال ، کامەران سابیر رەشید، محی الدین فارس ، محمود سمایل ، محمود بایز، محمد رەنجە ).

## شەهیدەکانی مام قلینج لە شۆڕشی نوێ

( شەهیدئازاد ( مام بێ بەش ) ،شەهید ئەحمەد بڕنەو،شەهید یەکێتی مەجید ،شەهید صلاح مستەفا قادر ،شەهید شفیق ئیبراهیم ،شەهید رۆستەم حمدامین ،شەهید عزیز حمد ،شەهید سابیر عزیزکوردە ،شەهید کابان مستفا ،شەهید

ئەحمەد کریم ئیسماعیل ،شەهید شێروان زێنەدین ،شەهید جمال جلال وسوو ،شەهید محی الدین فارس ،شەهید زاهیر ڕشید حمد ،شەهید ڕزگار صالح حمد ،شەهید محمد عزیز کـــــــــــوردە ،شەهید محمود عبدالله (ڕزگار) ،شەهید گەیلان سابیر ڕەشید ،شەهید کامەران سابیر ڕەشید )

بۆیە دەتوانم گوندی مام قلینج بەگوندی شەهیدان ناوبنێم سوپاس و پێزانینم بۆ ئەوانەی لەخۆمان گەورەتر که بەو عەشق و ڕێزەی کوردایەتی گۆشیان کردین

## بیرەوەری ڕۆژانی سەختی خەبات

من (ئەحمەد عزیزکوردە) ناسراو بە (ئەحمەد کوردە) لەتیرەی گەراریم

لە دایك بووی سالی (١٩٥٧)م لەگوندی مام قلینج لەبنەماڵەیەکی مام ناوەندی پەروەردە کراوم دوو براو هەشت خوشکم هەیە، خوێندنی سەرەتایم لەگوندی هەرمۆتە تا سێ ی ناوەندیشم لەکۆیەخوێندوە,لەدوای گفتوگۆی سالی (١٩٧٤) لەگەڵ ڕژێمی عێراق وەکو هەموو خەڵکی کوردستان منیش لە گەڵ براکانم چەکی پێشمەرگایەتیم کردە شان، لە ناوچەی بیتوێن، لەهێزی بێتواتە، لە بەتالیۆنی یەك ،لای خلیل بارزانی ڕێك خراین، ئامرهێزی بێتواتە علی شەعبان بوو، جێگرەکەی خەڵکی بێتواتە بوو بەناوی مەلاقادر ،لەگەڵ دەست پێ کردنەوەی شەڕ لەگەڵ ڕژێم ئێمە جەبهەمان لەشاخی (حاجیلە) پێ سپێردرا،شاخی حاجیلە لوتکەیەکی بەرزە کە موسەیتەرە بەسەر ناوچەی بیتوێن ،لە مانگی (١٩٧٤/٥) دوژمن لەناوچەی بیتوێن بەدەبابەو تۆپی دوور هاوێژ هێرشەکانی خۆی دەست پێکرد، بۆ سەر سەنگەرەکانی هێزی پێشمەرگە لە (کلکەی کۆڕین) ،لوتکەی بەرزی شاخی حاجیلە ، پاشی شەو و

ڕۆژێك شەڕ کردن من بەسەختی برینــدار بــووم بــەتۆپی دەبابــە، تۆپخانــەی شۆڕشیش پشتیوانی شەڕەکەی دەکرد ، دوژمن زۆر مەبەستی گرتنی ئەو شاخەبوو ،چونکە شوێنێکی ستراتیژیە بۆ ناوچەکە، منیان بردە خوارەوە بەڕێ یان کــردم بۆ نەخۆشخانەی ئازادی لە حاجی ئۆمەران، بۆمــاوەی (٤٠) ڕۆژ لەنەخۆشــخانە مامەوە ،تـاوای لێهات هێواش هێواش چاك بوومــەوە، گــوێ درێــژێکی ڕەشــیان پێدام تـاك و پێی بگەڕێمەوە بۆ جەبهەکەی خۆمان،کەگەڕامەوە بۆ دۆڵی شاوریێ ،( دۆڵی شاوریێ شوێنێکی دڵگیرو شیرینە ، پێك هاتووە لە زیاتر لە بیست گونــد لەهەموو شۆڕشەکان لانەی پێشمەرگەبوون)، بارەگای بەتـالیۆنمان هاتبوونە دۆڵی گولان گوندی بەردانکە، بەلام لەدوای مـن (کەبرینــداربووم) بــەتـالیۆنی چوار زیاد دەکەن، لەهێزی بێتواتە، سابیری برام دەکەن بــەجێگری ســەر لــق، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك ڕەوانەی بەتـالیۆنی چــواریان دەکــەن لەگونــدی ( هەرتەل )،منیش ناوەکەم لەگەڵ ئەوان نقل ببوو بۆیە منیش بەڕێ کــەوتم بــۆ لای ئەوان ،بەسەرکەوتم بۆچیای ماکۆکی ســەرکەش کەناوچــەکانی بیتــوێن و خۆشناوەتی زۆربەی زۆری لــێ دیــارە، شــۆڕبوومەوە بــۆ گونــدی هەرتــەل کــە بەتـالیۆنی چوار لەوێ بـارەگایان دانابوو، جەبهەشیان لە چــیای شیــشار بــوو، بەلام کەگەیشتمە گونــدی هەرتــەل ،هەرتــەل چ هەرتــەل!! زۆر جــار باســی بەهەشــت ئــەکرێت، بــەلام هەرتــەل بۆخــۆی بەهەشــتێکە، بەلاپەڕەیــەك و دوولا پــەڕە باســی ناکرێــت، سەرچــاوەی ئــاوی زۆرە دارگــوێز وهــەنار وتــرێ ومیوەجاتی ئێجگار زۆر هەیە، تــووتنی بێــشەمای (ممتــاز) ی زۆرە،وا هەســت دەکەی ژنانیان لــەخاك و ولاتێکــی کــەوە هــاتوون جیاوازیــان زۆرە لــە گــەڵ دێهاتەکانی تر،خەڵکی ئەوێ یە زۆربــەیان خوێنــدەوارو کورد پــەروەرن ،لــە شۆڕشی ئەیلول پێشمەرگەیان زۆربوو، دوای چەند ڕۆژێك پــشوودان چــەکەکەی خۆم وەرگرتەوەو بەرەو جەبهە بەڕێ کــەوتم کەلەچــیای شیــشار بــوو ، چــیای

شیشار بەرزایەکەی (٨٠٠) مەتر دەبێت لەئاستی ڕووی دەریاوە ، لەزینوێ هەرتەلەوە ڕێی بۆدەچێت لەوێوە زۆر هەوراز نیە چونکە دەکاتە پشتەوەی شاخی شیشار کە دەگەیە سەرشاخی شیشار ، شیشار دەبێت بە سێ بەش :

بەشی یەکەم / زاڵە بەسەرگوندەکانی بێتواتە،دواوە ، داری شکارتە ٠

بەشی دووەم / زاڵە بەسەر گوندی نواوە ٠

بەشی سێیەم / زاڵە بەسەر گوندی نێوە ٠

ـ کاک دکتۆر خالید هێزێکی تایبەتـــــی پێك هێنابوو سەر بەبارەگای بارزانی بوو مەفقەڕیان لە گوندی بێ کێر دانابوو لەگەڵ هێزەکەی ئێمە لەچیای شیشار یەکترمان بەدل دەکرد.

ئێمە چەکی قورسمان لەم چەکانە پێك هاتبوو (دۆشکە،ڕەشاش بڕنەو ،بڕنەوی درێژ ،قازیفەی سەرشان ) بەلاَم دوژمن ( بەتۆپی دوورهاوێژ ،دەبابە ،تەیارە ) ڕۆژانە تۆپ بارانی سەنگەرەکانی ئێمەی دەکرد، پێشمەرگەی زۆر بەغیرەت نەبووایە خۆی ڕانەدەگرت ، ناوە ناوە دەبابەکان هێرشیان دەهێنا بۆ ناو گوندی بێتواتەو دواوە ، من دووجار بەمەفرەزە بە پارتی زانی لەگەڵ شەفیق زاهیر لەهێزەکەی کاك خالید بوو، دەچووین بە قازیفە تەقەمان لەدەبابەکان دەکرد جارێکیان زنجیری دەبابەیەکمان پساند دواتر دەبابەکەیان ڕاکێشا بەبەر چاوی ئێمە، بۆ ماوەی سێ مانگ دەبابەکان هێرشیان نەکردەوە بۆ پێشەوە ، دەمەوێت تۆزێك باسی کاك خالید بکەم ( پیاوێکی دەستە بالاَبوو لەڕۆیشتن زۆر نازابوو کەس لەگەڵی دەرنەدەچوو،لەنەخشە دانانی سەربازی زۆر بەهێز بوو ئەو شەوەی بیزانیبا هجوم هەیە بۆ خۆی دەچووە سەر شاخ بۆلای

پێشمەرگەکان)، شەویکیان دوژمن هێرشی بۆهێنابوون تالێ یان نزیك ببوونەوە پێشمەرگەکان ئاگادارنەبوون سەعات (١٢) شەو هجوم دەستی پێکرد پاشی (٢) سەعات شەرکردن دوژمن نەی توانی تەنها یەك لوتکە شاخ بگرێت ،بەلآم بەداخەوە بوو بەهۆی شەهید بوونی چەند فەرماندەیەکی زۆرقارەمان کەدووانیان سەر لق بوون (عریف جمیل داربەسەری ،مەولود باغەجنێری ،جەوهەر مستەفا ئیلنجاغی) وە برینداربونی شەفیق سۆفی سمایل مام قلینجی .ئێمە لەگوندی هەرتەل ژمارەمان وەك بەتالیۆنی چوار (١٥٠) پێشمەرگە دەبووین ،وەلەتەنیشت ئێمە چەند کەسێکی لێ بوو بەناوی ناوچە ئیش و کاری حیزبیان دەکرد، یەکیان بەناوی (ئەنومر نادر ئیلنجاغی) ئەوەی تر (سلیم کوێخا حەوێز خەڵکی تاڵەبانی گچکە).

فەرماندەی بەتالیۆنمان ملازم حسن خۆشناو، عریف سەمەد جێگری بوو، سەرلقی ئێمە دلشادی مامەی مام جەلال ،جێگرەکەی سابیر عزیز کوردە وصلاح عومەر مام یحیی، فەرماندەی پەل - سدیق مستەفا شیواشۆکی ، سەرلقێکی ترمان هەبوو بەناوی عومەر کادیر خەڵکی گوندی تاڵەبانی گەورە ،کاك خالید دۆشکەیەکی دانابوو دووسێ کەسی زۆر چوستی لەسەر دانابوو یەکیان عەرەب بوو ناوی( عەواد) بوو، ئێمەش لەلقەکەی خۆمان دووعەدەد رەشاشمان هەبوو یەکیان بەناوی (سەعید مغدید کۆیی ) ئەوەی تریان بەناوی (حمدامین مەرگەیی )ئەویش ماڵی لە کۆیە بوو ، لەدوای شەهیدەکانی هاوینی (٧٤) جەبهەی شیشارمان وەرگرت لەشەوی (١٠/ ١١ ی مانگی ٧-١٩٧٤) ئێوارە دوژمن هێزێکی زۆری کۆکردەوە بۆچیای شیشار بۆ جەبهەکەی ئێمە، سەعات (٩) ی شەو هجوم دەستی پێکرد ،دوای شەرێکی باش دوژمن شکا، سەعات ١٢ شەو هێرشی کردەوە ، دووبارە شکا ،سەعات(٥) بەیانی لەهەمان شەو هێرشی

کردەوە ،لەهێرشی ئاخیری من بەسوکی بریندار بووم ،گوللەیەك بەباقە ئەجمەی تفەنگەکەم کەوت ، چەکەکەم لەکار کەوت. ئەو شەوە چەند تفەنگی سەمینۆف و نارنجۆکی دەستی وخودەی سەربازی وزمزمەی ئاو و فیشەکی کلاشینکۆفمان دەست کەوت. بۆ بەیانی عریف سەمەد هات بۆ سەردانمان بۆ جەبهەکە. بینی من بریندارم و چەکەکەشم شکاوە. برادەرانیش زۆرباسی منیان کردو گووتیان"ئەم شەو هەر لە پێشەوە بووە".ئینجا کاك سەمەد نامەیەکی دامێ بۆ ئیدارەکەمان کە لە گوندی هەرتەل بوو. چوومە خوارەوە چەکەکەم بگۆڕم. نامەکەم دا بەو پیاوەی کەلە ئیدارە ئیشی دەکرد.گووتی" کوردەگیان ماشەلا ناوەکەت زۆر خۆشە! وادیارە کاك سەمەدیش خۆشی دەوێ چونکە ئەو تفەنگە بڕنەوە وەستانەی نەداوە بەکەس" لێی دووبارە کردمەوە گووتی"ناوت ئەحمەد کوردەیە"؟ گووتم" بەڵێ گووتی" زۆر باشە وەرە لەم دوو تفەنگە یەکێکیان بۆ خۆت هەڵگرە "، وەستەتێکی دار شوشەم هەڵگرت و گەڕامەوە بۆ سەرشاخ. ئەو چەکە ئەو کاتە لای هیچ سەر لق وسەر پەلێك نەبوو بۆیە منیش زۆر دڵم پێی خۆش بوو. تاگەیشتمەوە سەر شاخ زۆرم تەقە پێکرد. لەسەر شاخیش برادەران زۆربەیان تەقەیان پێ کرد چونکە شتێکی زۆرنایاب بوو.زستانی ساڵی( ١٩٧٥ ) ئێمە لەگــــــــــــەڵ بەتالیۆنەکەی سەید کاکە لەماکۆك یەکترمان بەدل دەکرد. لەچیای ماکۆك بەفر زۆر باری بوو. زۆر شەوان قوات خاسە بەسەر بەفر هجومیان دەکرد . لەنێوان ئێمەو ڕەبیەکانی دووژمن شوێنێکی ئەورایی ڕووتەن هەبوو. هەمووجارێك کەدووژمن هێرشی دەهێنا لەو ڕووتای یە دەست ڕێژمان لێ دەکردن هەموو جارێ دووسێ قوات خاسەیان لێ دەکوژراو بەجێ یان دەهێشت. وای لێ هاتبوو مەیتەکان زۆر ببوون. ناومان لەو شوێنە نابوو دۆڵی( مەیتان ) . ئەو ساڵە دوژمن نەیتوانی ئەو شوێنەی ئێمە بگرێت. بەلام بەفرۆکە ناپاڵمی بۆ فڕێ دەداین. تاکو مانگی

( ٤ ) ی ١٩٧٥ ئێمە لەوێ بووین،دواتر بەدل کراین، بووین بەهێزێکی گەڕۆك، جەوهەری برام سەرپەرشتی ئەو قواتەی دەکرد، هاتینە خوار بۆ دەشتی هەولێرو دەوروبەری دەشتی کۆیە ، ماوەی مانگێك لەخوارەوە بووین دەستی باشمان لەدوژمن وەشاند ، هێرشێکمان کرد بۆسەر سەربازگەی ڕوباری کۆیە ، دوو ئیڤامان سوتاندو١٢ سەربازمان لێ کوشتن، هەرلەو مانگە لوغمێکی دەبابەمان لەنێوان ڕەبیەی گرد چادرو ئامریەی کۆیە دانا لەبن ئیڤەیەك تەقیەوە، ئیڤەکەتێك شکاو سەرنشینەکانیشی هەموو کوژران،هەر لەو مانگەدا کەمینێکمان لەشیوی سامالْ ( جادەی کۆیە _ هەولێر ) دانا، لەوێش ئیڤایەك سوتا ، دوژمن بەو زنجیرە چالاکیە کەوتە پەلە قاژەو پەلاماری گوندەکانی دەدا دوو پێشمەرگەمان لەگەلْ بوو بەناوی ( مەلا علی ونیهاد )خەلْکی کۆیە بوون، ئیجازەی چەند ڕۆژێکیان لە کاکم وەرگرت کەوا بچن کەسو کاریان ببینن ، من هەتا گوندی شیلە لەگەڵیان چووم زۆرم پێ گووتن لەگوندی عەوداران نەمێننەوە گووتیان" باشە بەلآم لەگوندی عەوداران مابوونەوە کەچەند کیلۆمەترێك لەشارۆچکەی کۆیە دوورە، هەر ئەو شەوە ئیخباریان لێ دەکەن و جەیش وجـــــــــاش دەورەیان دەگرن و دەست گیریان دەکەن ، بەداخەوە پاش ماوەیەك لە بەندیخانەی موسلْ هەردووکیان لەسێدارەدران ، هەزار سلآو لەگیانی پاکیان.

ئێمە بروسکەمان بۆ هات و گەڕاینەوە بارەگای خۆمان لەگوندی هەرتەل.لەوێ کۆبونەوەکیان پێ کردین و پێ یان ڕاگەیاندین کەوا شای ئێران لەگەلْ سەدام حسین وەرەئیسی جەزائیر کۆبوونەوەیەکیان کردووە، سەدام حسین لەو مونتەمەرەی جزائیر پرۆتۆکۆلەکی ئیمزاکردووە بەگوێرەی ئەم پرۆتۆکۆلەش لەدوو شوێن، خاکی عێراقی داوە بەشای ئێران، بەشێکیان لەناو

ناو، لەشەتلْ عەرەب ، بەشێکیشیان لە وشکانی لـە خـاکی کوردسـتان ،ئـەو رێکەوتنەی شای ئێران و سەدام بووە هۆی ئەوەی کەوا هێزی پێشمەرگە دلْ سارد بکات و لەخەبات کردن ساردی بکاتەوە شـای ئێـران تۆپخانـەکانی خـۆی لای حاجی ئۆمەران کێشایەوە بۆ دیوی ئێران، وە خوالێخۆش بـوو ( مەلامـستەفا )ی رەحمەتیان بانگ کرد بوو بۆتـاران ،گفتـو گۆیـان لەگـەلْ کردبـوو، لـەبارەی راگرتنـی شەڕوچـالاکی سیاسـی وعەسـکەری کـە ئـەو دەنگوباسـە بلاْوبـۆوە، سەرکردایەتی ئەو کاتە نەیان توانی هێزێکی منەزەمی پارتی زانی رێك بخەن لە کوردستان، ئەو کاتە دوو رێگا داندرا بۆ هێزی پێشمەرگە، یـەکیان ئـاوای دیوی ئێران ببن لەگەلْ بارزانی چاومرێی رەحمـی خـوای گـەورەو شـا بکـەن رێگای دووەم حکومەتی عێراق لەبەهاری ( ١٩٧٥ ) لێبوردنێکی گشتی دەرکرد بـۆ هەموو خـەڵکی کوردسـتان کـە بگەرێنـەوە بـۆ عێـراق، بـەلاْم ئـەوەی ئێمـە گوێمـــان لێ دەبوو کادیرەکانی ئەو سەردەمە باسـیان دەکـرد کـەوا بـارزانی بەتلیفۆن پەیوەندی گرتووە لەگەلْ گەورە پیـــــــاوانی ئـەمریکا، بەلاْم پێدەچوو ئەمریکایەکان لە مونتەمەرەکەی جەزائیر ئاگاداربوون ، بۆیـە وەلاْمی مەلا مستەفایان نەدابۆوە حکومەتی عێراق زۆری هەوڵدابوو لەگەلْ شا کەوا سەرکردایەتی کورد وەك پێویست داڵـدە نـەدات لـەئێران بۆئـەوەی بـە ناچاری بگەرێنەوە بۆ عێراق، بەلاْم شـائەوەی قبـولْ نـەکردبوو ، ئـەوە بـوو لەبەهاری ساڵی ( ١٩٧٥ ) بەزۆری زۆرداری بە پیلانی چـەند دەوڵـەتێك شۆڕشـی کوردیان لەناوبردو هەرەسیان پێهێنا ، بۆیە جارێکی تریش وەکـو شۆڕشـەکانی تر خەڵکی کوردسـتان بێ ئومێد بـوون و بەشـێکی ئـاوای دیـوی ئێـران بـوون، بەشێکیشی بە لێبوردنەکە گەڕانەوە بـۆ نـاو کەسـوکاری خۆیـان ،مـن لەگـەلْ براکانم و کۆمەڵێك لەو پێشمەرگانەی کە لەگەڵمان بوون گەڕاینەوە بۆ دەشتی کۆیە بۆ گوندەکەی خۆمان ، ئەو کاتـە خـەڵك زۆر لـەڕژێم دەترسـا ، ئـەمان

دەزانی چۆن تەسلیم بەرژێم ببینەوە ، سابیری برام گووتی" من لە کۆیە پیاوێك دەناسم بەناوی ( محمد عبدلله ) مەسئولی ناوچەی پارتی کارتۆنی بوو ئەوان لەگەڵ حکومەت بوون دیار بوو نامەیەکی بۆ نووسی،ئەویش جوابی دایەوە،نووسی بووی بەیانی دێمە دواتان ،رۆژی (١٩٧٥/٦/٢١ ) ئیڤای عەسکەری لەگەڵ کاك محەمەد هاتن بەدوامان دا ئێمە سواری ئیڤەکان بووین ، بەلاّم زۆربەمان لەبەر گریان قسەمان بۆ نەدەکرا، من برنەویکی درێژم پەیدا کردو برنەوە کورتەکەم شاردەوە ،تەسلیم بەرژێمم نەکردەوە، گەیشتینە شاری کۆیەو هەر لەو مقەرە چەکەکانیان لێ وەرگرتین و هەر بەو ئیڤایانەش رەوانەی فیرقەی ( ٤ ) ی کەرکوکیان کردین ، ئەو ساڵە دونیا سەرما بوو باران زۆر بوو، ( ١٥ ) شەو لەفیرقەی چوار ماینەوە ، پرسیارو وەلاّمیان لەگەڵ کردین زۆربەی ئەو کەسانەی کەجوابیان دەداوە دەیان گووت من ( چاچی بووم ) یان( تەباغ بووم ) یان ( لەنانەواخانە کارم کردوە ) هێندێکیشیان دەیان گووت من خەربەندە بوویم ( خەربەندە ) بەمانای وولاغ بەخێوکەر دێت ، نۆرە گەیشتە سەر من لێی پرسیم گووتی" تۆ چیت کردووە من گووتم" پێشمەرگەی جەبهەبووم دەستی لەسەر شان دانام و گووتی" ( بشرفی انت صبع ) ،منیش ئەوکاتە عەرەبیم نەدەزانی بە موتەرجیمەکەم گووت ئەوە دەڵێت چی گووتی" دەڵێت بەس ئەو کورە راستی گووتوە و پیاوێکی ئازایە دوا جار گووتی" تۆ کێت لەگەڵە ،بانگیان بکە، تاکو وەرەقەتان بۆ بکەم، ئازادبن و برۆن ، منیش بانگی ئەوانەی خۆمانم کرد ئەوانەی لەو کاتە دیاربوون ئینجا عەدەم تەعروزی بۆکردین بەناوی ( عائیدون لصف الوطن ) هەر یەکەی ( ٥٠ ) پەنجا دیناریشیان پێدان ، ئینجا بەئیڤا ئێمەیان هێنایە گەراجی کەرکوك لە ناو کەرکوك ئازادیان کردین، بەراستی باوەرمان نەدەکرد عەفوەکە ئەوها بێت چونکە تەحقیقەکان هاکەزایی بوو ئینجا سواری سەیارە بووین و هاتینەوە بۆ

کۆیە ، دەمەوێت ناوی ئەو کەسانە بنووسم کەلەگەڵمان بوون ( دلشادی مامەی مام جلال ،سلاحی مام یحیا ،حمەدامین مەرگەیی ، کەریم هەینی ، محمود حەوێز، محمد حەوێز ،سعید مغدید ،ئیبراهیم سابیری هونەرمەند، ئیسماعیل سابیر ،ئازاد( مام بێ بەش ) ،رەسوڵ حمەدامین، سا بیر عزیزکوردە ، محمد عزیزکوردە ،صدیق مستەفا ومام محمود شیواشۆکی ،ئەحمەد کوردە ،صەلاح عەلائەدین ،علی ئەبی خەڵکی دۆڵی شاورێ بوو،علی رەشاش خەڵکی گوندی سەرکەندی خەیلانیان بوو، پیاوێکی دەنگ خۆش بوو جاروبار حەیرانی بۆ ئەگووتین، ،ئەحمەد هەرتەلیماڵەکەشی هەرلەنزیك بارەگاکەی خۆمان بوو ، عریف سەمەد،ملازم حسن خۆشناو ، ،دوو کوڕی ترمان لەگەڵ بوو بەناوی ( مەلا علی ونیهاد صدیق ) ئەوانە ئیجازەیان وەرگرتبوو لەگوندی عەوداران بەدیل گیران وپاش ماوەیەك ئیعدام کران وە داوای لێبوردن لەو کەسانە ئەکەم کەوالەگەڵمان بوون و ناوەکانیانم لەیاد نەماوە ،

ئێمە هەر لەکۆیە خانومان بەکرێ گرت و ماڵەکەمان کۆکردەوە هەمووومان بەیەکەوە بووین چونکە تەنها سابیری برام ژنی هێنابوو بەلام دائیرەی ئەمنی کۆیە تەحقیقی زۆریان لەگەڵ کردین ، فایلیان بۆ کردینەوە هەرکەسە بەناوی خۆی پێشیان گووتین ئێوە بۆماوەی شەش مانگ بۆهەرکوێ بچن دەبێت ئاگاداری ئێمەبکەنەوە، من بیرم کردەوە کەوا تا زووە کارێك بدۆزمەوە باشترە چونکە وا دیارە مراقەبەمان لە سەرە ، زاوایەکمان هەبوو ناوی( مەلا خدر ) بوو چایەخانەیەکی بچکۆلانەی هەبوو چایەخانەکەم لێ وەرگرت بۆ ماوەیەکی باش کارم لەم چاخانەیە دەکرد ئەو کاتە هێزی سەربازی لەناوکۆیەو دەوروبەری کۆیە زۆربوو هەموو جومعەو پێنج شەمان چایەخانەکەم پڕدەبوو لە جوندی عەرەب منیش زۆرم مەراق بوو فێری قسەکردنی عەرەبی ببم تاوای لێ هات زۆر

بەجوانی بەعەرەبی قسەم دەکرد، من موالیدم ( ١٩٥٧ )بـوو مـانگی ( ١٩٧٦/١٠ ) دەبووین بە سەربـاز بـەلام قـەرارێك هـەبوو بۆئـەو موالیـدەی ئێمـە لـەباتی سەربازی دەمان توانی ببین بە پۆلیسی محەلی بۆماوەی ( ٥ )ساڵ بۆیە من وچەند کەسێکی تر چووین معامەلەی دامەزراندنی پۆلیسیمان لەهەولێر تـەواو کـردو هێنامانەوە بۆ کۆیـە دەبوایـە رەزامەنـدی دائـیرەی ئـەمن وەربگیرێـت هـەموو معامەلاتەکانیان رەوانەی دائیرەی ئەمن کرد کەگەڕایـەوە بـۆ تەجنیـد لەسـەر ناوەکەی من خەتێکی سوری لێ درابوو بەکتابی سـڕی ئاگاداریـان کردبوونـەوە کەوا من پێشمەرگەبوومەو نابێت لە پۆلیسی محەلی وەربگیرێم،مـن لـەکۆتـایی لـە ( ١٩٧٦/١٠/١٠ ) موڕاجەعـەی تەجنیـدم کـرد ئـەو جارەیـان بـۆ سـەربازی لە( ١٠/١٨ )ی هەمان ساڵ لە کۆیەوە رەوان کـراین بـۆ هـەولێرو لەوێـشەوە بـۆ بەغداد لەوێشەوە بۆ معەسکەری ئەبوغرێب ،بەڵێ پێش ئەوەی بچم بۆ سەربازی لەگەڵ سابیری برام باسی ئەوەمان کردبوو ئەوا من بچمە دەرێ چونکە تازە کەم کەمە پێشمەرگە لەبناری قەندیل و شاخەکانی کوردستان پەیدابـبۆوە ،چـوونم بۆ عەسکەری تـەنها بـۆ شـوێن بـزری بـوو ،لەبـەرواری ( ١٩٧٦/١٠/٢١ ) جلـی سەربازیمان لەبەرکرد بۆماوەی یەك هەفتە جومعەو پێنج شەمی بەسەر داهـات من لە ناو معەسکەر حەربەیەکم پەیدا کرد سیمی دەورەی معەسکەرەکەم بڕی لـە پەنایەك ڕێگایەکی باشم کردەوە سبەینەکەی رۆژی جومعە بەدۆست وبـرادەرانم گووت من دەچمەوە ئەوەی دێتەوە ،من کوڕێکم لەگەڵ بوو بەناوی میرزا حمـدامین کوڕی خوشکم بوو هەرچۆنێك بێت گەیشتینە ( نـەهزە ) سـواری سـەیارە بـووین بەرەو کەرکوك،لەکەرکوکەوە خۆمان گەیاندەوە کۆیە چونکە بەجومعـەو پێـنج شەمان سەیتەرەکان جوندیان ڕانەدەگرت گەیـشتینەوە مـاڵی خۆمـان ، بـەلام دەرنەدەچووین لەماڵی ئێمە من برادەرێکم هەبوو بەناوی ( عبـدالقادر ئیمـام ) ناردم بەدوایدا، هات بۆلام پێم گووت من دەچمە دەرەوەو سـابیری براشـم زۆری

خۆش دەویست گووتی" قادر گیان تۆ وەرە ئەو نامەیەم بۆ بنوسە بۆ دکتۆر خالید چونکە تۆ خەتت لەهەمووومان خۆشترە ئینجا کاکم سابیر نامەکەی بۆ( دکتۆر خالید ) نووسی دیاربوو کەلیمەی سرپان لەبەیندا هەبوو ئێمە دوو شەو لەکۆیە ماینەوە دوعا بوونم لە دایکم و براو خوشکەکانم وئەوکەسانەی کەوالەوێندەر مەوجود بوون خواست وبەرێ کەوتین کاکم تا گوندی هەرتەلی بەهەشت لەگەڵمان هات لە گوندی هەرتەل کورێکی لێ بوو بەناوی ئەحمەد هەرتەلی لەشۆرشی ئەیلولیش برادەرمان بوو کاکم ئێمەی تەسلیمی ئەحمەد هەرتەلی کردو ئەو گەڕایەوە کاکم گووتی" من دەگەڕێمەوە هەرچۆنێك بێت ماڵەکەمان باردەکەم بۆ هەولێر چونکە هەولێر شارێکی گەورەیە خۆمان دەشارینەوە .ئەو شەوە ئێمە لەماڵی کاك ئەحمەد ماینەوە بەلاَم نەی هێشت خەڵکی ناودێ ئێمە ببینن بەیانی زوو بە پێشمان کەوت ولەرێگای دەرە هەرتەل بەسەری خستین ولەسەر شاخ من گووتم" تۆ دەبێت بگەرێیتەوە چونکە من ئەو رێگایە شارەزام ساڵی (١٩٧٥/١٩٧٤ )پێشمەرگەبووم رۆژ بوو بە( ١٩٧٦/١١/١ ) . لەگەڵ کاك میرزا رێگای چوارسەعات و نیوی ساوسێوۆکە- وەرتێمان گرتەبەر .لە سەر ئاوی ساوسێووکە توشی جەماعەتێکی پێشمەرگە بووین مەرپان سەربرِی بوو گۆشتیان لێ نابوو دابەشیان کردبوو لەبەردەمیان بوو پیاوێکی بەتەمەنیان لەگەڵ بوو پێیان دەگووت مام سەید ، مام سید بانگی منی کردوگووتی" وەرە تۆلەگەڵ من نان بخۆ و میرزاش لەگەڵ پێشمەرگەکانی تر دانیشت بۆ نان خواردن بەدەم نان خواردنەوە مام سەید گفتوگۆی لەگەڵ دەکردم پرسیاری لێ کردم تۆ خەڵکی کوێی وناوت چیە؟ گووتی" مەترسەو قسە بکە من سەید کاکەم هەر خۆی گووتی" ئەوەش کاك قادر مستەفایەو ئەوەیان ئەحمەدخانەوئەوەشیان سلێمان بیرێژیە بەڵێ منیش پێم گووت من ناوم ئەحمەد کوردەیەو برای سابیرم خەڵکی مام قلینجم گووتی" سابیر باش دەناسم

ولەشۆرشی ئەیلول لەجەبهەی ماکۆك جاروبار ئێمەیان بەدل دەکرد مام سەید زۆر هەوڵی دا لای ئەو ببین بە پێشمەرگە وئەچین بۆ لای کاك خالید بەلام من پێم گووت نامەی ناوشارم بۆ هێناوە هەر دەبێت کاك خالید ببینم گووتی" زۆر باشە پێش ئەوەی برۆین من گووتم" مام سەید ئێوە چۆن دەژین وکێ یارمەتیتان ئەدات ؟ گووتی" لەو رۆژانە لەدەشتی حەریر ئەو مێگەلە مەرمان هێناوە هی حکومەتەو دەیان فرۆشین وقات و پێلاوی بۆ پێشمەرگەکان پێ دەکرین تەنزیمەکانیشمان لە ناو شار ئابوونە کۆدەکەنەوەو بۆمان رەوانە ئەکەن گووتی" قەراریش وایە مام جلال بگەرێتەوە بۆ کوردستان پارەو ژمارەیەك چەك لەگەلْ خۆی دا بهێنێت ئینجا مام سەید گووتی" مادام هەر ئەرۆن لەزینوێ ئەستێرۆکان لامەدەن بۆ وەرتێ بەسەرکەون وشۆربنەوە بۆگوندی زارگەلی لەوێ پیاوێکی لێ یە بەناوی کاك ئەحمەدی زارگەلی شەو لەماڵی ئەوان بن و سەلامی منیشی لێ بکەن،رۆیشتین و بۆ ئێوارە گەیشتینە گوندی زارگەلی چووینە ماڵی کاك ئەحمەدی زارگەلی زۆر رێزی لێ گرتین و ئێوارە دیوەخانەکەی پربوو لە پیاو تا درەنگانی شەو شەوێکی خۆشمان بەسەر برد ،زارگەلی گوندێکی ( ٣٥ ) ماڵی دەبوون رووبارێکی گەورە بەتەنیشتیدا ئەهاتە خوارێ وهاشەی دەهات بەیانی کەهەلسایین لە خەو بۆ دەم وچاوشوشتن چووین بۆ سەر رووبارەکە تەماشام کرد لە هەمووماڵەکان لەلولەی سۆپا دارەکان دووکەڵ بەرز دەبۆوە بەلای منەوە دیمەنێکی زۆر زۆرغەریب بوو هەر لەسەر ئاوەکە دانیشتم وقەلەم ودەفتەرەکەم دەرهێنا ئەم شتانەم نووسی ، میرزا گووتی" ئەوە چی دەکەی ؟ گووتم" شتێك لەسەر گوندی زارگەلی ودیوەخانەکەی کاك ئەحمەد دەنوسم ئەگەر هاتوو ماین رۆژێك دادێت دەیان نوسمەوەو بلاوی دەکەمەوە ،ئینجا گەراینەوە بۆدیوەخان و میرزا وردەوردە بۆکاك ئەحمەدی گێرایەوە گووتی" خالم لەدەفتەری یادەوەریەکانی لەیەکەم

ڕۆژی پێشمەرگایەتی ناوی تۆو گوندی زارگـەلی تۆمـارکرد ،کـاک ئەحمـەدیش پێکەنی وگووتی" کاکە گیان خەڵکی کوردستان کەمی مایەلـەم دیوەخانـە نـان ئەخواو گوزەر ئەکات تۆچۆن دەی نووسیتوبلاوی دەکەیتـەوە ، نا نمـان خـواردو بەڕێ کەوتین بەرەو گوندی لێوژێ کاک ئەحمەدیش تعریفی پیاوێکی بۆ کـردین بەناوی جەوهەراغـەی لێـوژێ شـەوێکیش لای جەوهەراغـە ماینـەوە ئـەویش پیاوێکی قسەخۆش وناوداری ناوچەکەبوو جەوهەراغە گووتی" منـیش بڕیـارم داوە خۆم و خزمەکانم ببم بە پێشمەرگە چونکە زۆر دڵم بە پەیدابونەوەی شۆڕش و پێشمەرگە خۆشە، لەوێش بەڕێ کەوتین بەرەو قرناقاو پشت ئاشان مقەڕێکی پێشمەرگە لەناو مەکتەبەکەی قرناقاو بوو ، چوومە لایان و زۆربەیانم ناسـی کەئەو مقەڕە مقەڕی سجن بوو ئـەوانیش عایـدی کـاک خالیـد بـوون ( چـەتۆی کەریمەسوور —ئامرمەفرەزە بوو ) ناوەکان ( شەهید سەرباز ،ئەمیر عبدالباقی ،تـالیبی خاڵـە ئەسـوەد ،جەعفـەری خاڵـە ئەسـوەد ،خـدر خۆشـناو ،وە چەند پێـشمەرگەیەکی تـر......... ) ئـەو شـەوە لای ئـەوان ماینـــەوە قرناقاو پشت ئاشان دوو گوندی لەسەریەکن ولێك نـزیکن بـەیانی دوای نـان خواردن بەڕێ کەوتین بۆ بناری لوتکەی قەندیل گوندی ئەشقولکە کـاک دکتـۆر خالید مقەڕەکەی لەوێ بوو ڕێگاکە هەوراز بـوو مـیرزا مانـدوو ببـوو لەهاتنـە دەرەکە پەشیمان ببۆوە دەی گووت بزانە چیمان لـەخۆمان کـرد بـەلام دوایـی پێشمەرگەیەکی زۆر باش دەرچـوو ، چـووینە مقەڕەکـەی کـاک خالیـد ،کـاک خالیـدیش لـەوێ بـوو نامەکـەی کـاک سـابیرمان دایـێ ونامەکـەی کـردەوەو خوێندیەوەو زۆر بەخێرهاتنی کردین ولەخەڵکی کۆیەی پرسی و گووتی" لەناو شارەکان چۆن باسی ئێمە دەکەن پرسیارەکا نمان جـواب دایـەوە، ئێمـە چـەند ڕۆژێك لای کاک خالید لەمەقەڕەکەی ئەو ماینەوە پێشمەرگەیەکی لێ بوو ناوی حەمید بوو چاوێکی تانەی لەسەر بوو حمید گووتی" ئەگەر پێتان خۆشە لەگەڵ

میرزا من قسە لە گـەڵ کـاك خالیـد ئەکـەم بۆنـەوەی جەولەیـەکی خـواریٚ بکـەین ،دونیاش بەرەو زستان دەچوو بناری قەندیل زۆر سارد بـوو ئێمـەش ڕازی بـووین کـە جەولەیەکی خواریٚ بکەین ،حمید بـەکاك خالیـدی گـووت و کـاك خالیـدیش ڕازی بوو.کاك خالید هەندێك قسەی بۆ کردین وباسی بزوتنەوەی سوسیالیستی بۆ کـردین وگووتی" کەچوونە خوارەوە جەولە بکەن وباسی پێشمەرگەو دروست بوونەوەی شـۆڕش بکەن بۆ خەڵك ،میرزای خوارزام دەمانچەیەکی کەمالی قەدیمیـەکانی هـەبوو منـیش بڕنەوە کورتەکەم مابوو لە ماڵە خزمێك لـە گونـدی شـارد بوومـەوە بـەڕیٚ کـەوتین هاتینە خواریٚ ،حمید بڕنەویکی درێـژی پـیٚ بـوو لەناوچـەی بالیـسان تووشـی ئەحمەد خانی بـۆلی بـووین چـەند پێـشمەرگەیەکی لەگـەڵ دابـوو.لەگـەڵ ئەحمەدخان ماوەیەك جەولەمان کرد لەگوندەکانی سکتان وکاموسەك وجـەلی و سماقوڵی ،ئێمە لەگوندی سماقوڵی ئـاوابووین بـەرەو گونـدەکانی ڕۆژ ئـاوای کۆیە ،لەویٚ لەکاك ئەحمەد دابـڕاین ،ئەحمـەدخان گـە نجێکی بالآبـەرز بـوو تـابلێی ئینسانێکی قۆزوڵ هاتوو بوو وە پیاوێکی زیرەك بـوو ئـەو فەترەیـەی کە پێکـەوە جەولـەمان دەکـرد بـۆم دەرکـەوت کـەوا خۆشەویـستی جـەماوەرو جوتیارانی ناوچەکەیە، ئێمە چووینە گوندی شێخەڕوان (١) کم لەجادەی کۆیە - هەولێر دوورە لامان دا ماڵی مام واحێد کوڕێکی هەبوو بەناوی تۆفیق تاسـەر جادەکە لەگەڵمان هات و دەیگـووت منـیش حـەزم لـیٚ یـە بـبم بە پێـشمەرگە بەلآم لەبـەر بـاوکم بەتەنهایـە ،تۆفیـق لەسـەر جـادە گەڕایـەوە و ئێمـەش بەرەو گوندی مام قلینج ڕۆیشتین ، میرزا ماڵی باوکی لەویٚ بوو کەدەکاتە ماڵە خوشکی منیش تـاقیبی ماڵی خۆمانم کرد گووتیان" ماڵتان لـە کۆیـە نـەماوە من تێگەیشتم کەوا کاکم بڕیارەکەی خۆی جیٚ بەجیٚ کردووە ( مـاڵی بـارکردووە لە کۆیەوە بۆ شـاری هـەولێر ) ، مـیرزا دەمانـچەکەی خـۆی دەرهێنـا لەگـەڵ ئەختێك فیشەکی ژەنگاوی من ئەو سەفەرەی چەکەکەی خۆم بەر دەست نەکەوت ئەوەی چەکەکەم لادانا بوو ناوی ( زین الدین سمایل ) بوو بە سـوتفە ئـەو

کاتە ئەویش لەلایەن رژێمەوە گیرابوو جەولەیەکمان کرد بۆ گوندەکانی رۆژ هەڵاتی کۆیە ،حمید زۆر شارەزابوو لەو ناوچانە دەچووینە هەر گوندێك ئەمین سندوقی جەمعیەی فەلاحی هەبوو کەلەلایەن بەعسەوە دانرابوون و کەم کەمە پارەیان لا دانرابوو پارەکانمان لێ وەردەگرتن و کۆبونەوەیەکیشمان بەخەڵکی گوندەکە دەکرد خەڵك بەزۆری ئارەزوی بینینی پێشمەرگەی هەبوو چونکە هەموو کەس باوەڕی نەدەکرد کەوا شۆڕش هەڵگیرساوەتەوە ،ئێمە سەردانی مەجید ئاغامان کرد لە گوندی کانی بی کە پیاوێکی ناوداری ناوچەکە بوو دیار بوو زۆر دۆستی دکتۆر خالید بوو ڕێنمای کردین و سڵاووڕێزیشی هەبوو بۆ کاك دکتۆر خالید، لەوێشەوە سەردانێکی حەمەبۆری ئەلیاسەسوورمان کرد کەچەند ماڵێك بوون پێك هاتبوون لەکوڕو برازای خۆی شەوێك لای کاك حاجی حەمە بۆرماینەوە (گوندی ئەلیاسەسور) شوێنێکی پەناو چاك بوو بۆ پێشمەرگە چونکە دێ یەکە لەناوشاخ ودۆڵ بوو ،لەوێشەوە چووینە گوندی بۆگد کەئەو کاتە گوندی بۆگد (١٠٠) ماڵێك دەبوون موختارێکیان هەبوو بەناوی کوێخا وەهاب چووینە ماڵی کوێخا وەهاب کە دیوەخانێکی گەورەی هەبوو خێزانەکەی کوێخا وەهاب زۆر تەکلیفی مانەوەی لێ کردین وادەر کەوت کە پێشمەرگەی زۆر خۆش دەوێت کوێخا وەهاب ئەمین سندوقی جەمعیەی فەلاحی بوو ، نزیکەی (١٥تا ٢٠) پیاوێك کۆبوونەوە لەماڵی مام وەهاب ئێمە سەرەتا وامان هەست کرد کەغەرەزیان لە گەڵمان خراپە من ڕومانەیەکم دەرهێناو لە ناو دەستم گرت و لەبەر دەرگا ڕاوەستام کوێخا گووتی" دڵتان هیچ نەکات من بۆیە ئەو پیاوانەم بانگ کردووە کەبەیانی حکومەت نەمگرێت تا ئەوانە شاهێدبن کە پێشمەرگە پارەی جەمعیەی بردووە، مەبلەغێك پارەمان لێ وەرگرت و سەردانێکی گوندی کلێسەمان کردو لەوێشەوە چووینە گوندی ئیلاالله ئەکسەریەی گوندی ئیلاالله شێخن یان سەیدن بەڵام بەڕاستی زۆر ڕێزیان لێ گرتین و خۆشحاڵی خۆیان

دەربڕی کەسێ پێشمەرگەیان بینیوە ، شەوو رۆژێك لەو دێ یە ماینـەوە چـونکە ناوچەیەکی بەدارو بارو شاخاویەو شوێنێکی دڵ گیرە ، رەزو باغ و میـوە جـاتی هەیە لە سەر شاخ ، ئینجا لەوێوە بەگشتی جەولەیەکی ناوچەی خەلـەکانمان کرد تا دەگاتەوە خـدران ،لەگونـدی خـدران پیاوێـك تراکتـۆرێکی پـێ بـوو بەداخەوە ناوەکەیم لە یاد نەماوە چواردەورەی عارەبانەکەی گوشی( تـەلیس ) بۆری لێ دابوو داوام لێ کرد گووتم" ئێمە پێشمەرگەینەو زۆر هـیلاکین ئەگـەر بمان بەی بۆ لای گوندی حاجیاوە (ئەسـریلان ) ئـەویش گـووتی" ماوەیـەك ئەبێت بەجادەی قیرڕدا بڕۆین ئەوێرن؟ میرزاش گووتی" بـەڵێ دەوێـرین ، مـن لەلای سایەق سواربووم بێ چەك میرزاو حەمیدیش لەناو عارەبانەکـە دانیـشتن تـا ئێمەی گەیاندە گوندی حاجیاوە ،حاجیـاوە ئـەو کاتـە تـەنها گونـد بـوو موجەمەع نەبوو لەوێوە بەرێ کەوتین بە پێیان بەرەو دۆڵی شاورێ لامـان دا دێ یەك لەقەت شـاخی مـاکۆك بـەرووی رۆژهـەلاتی مـاکۆك ئـەو گونـدە نـاوی قەلاسەیدەیە ، قەلا سەیدە ئەشکەوتێکی لێ یە پێی دەڵێن ئەشـکەوتی (بێـت کار) بێت کار لەبێکارەوە هاتووە ئەو ئەشکەوتە بەچـوار گۆشـەیی لـەژوورەوە (١٠تـا١٥) مەتـر پان دەبێت دوو جۆر ئـاوی تێدایـە ،ئاوێکیـان بـەدلۆپ دێتـە خوارەوەو دەتوانی ئـاوی لێ بخۆیتـەوە ئـاوی دووەم لەسـەرووی ئەشکەوتەکە لەژوورەوە زۆر بەخێرایی دێتە خوارەوەو ئاوێکی زۆرە هـیچ کەسـێك ناتوانێـت ئاوی لێ هەڵێنجێت من زۆر پرسیارم کرد بۆ نهێنی ئەم ئاووجۆگەیە بەلام کەس زانیاری لەسەر نەبوو باوەرم وایە ئەو شۆرش وحکومەتانەی لەناوچەکە هەبوون تا ئێستا پشکنینی باشیان بۆ ئەشکەوتی (بێت کار) نـەکردووە ،ئینجـا ئێمـە لەوێوە گەراینەوە بۆ سەرکردایەتی و بۆلای کاك خالید ،دەنگوباسـی خـوارێ و جەولەکەی خۆمان لە گەڵ ئەحمەد خان هەمووم کرد بـەرا پۆرتێك و تەسـلیمی کاك خالیدم کرد لەگەڵ ئەو برە پارەیەی لە جەمعیاتـەکانمان هێنابوو.کـاك

خالید بەکارەکانی ئێمە زۆر دڵ خۆش بوو گووتی" ئێوە ئێستا ئازادن بۆ هەر ناوچەیەك کە پێشمەرگایەتی لێ بکەن ، من ومیرزا پسولەی نەقل مان وەرگرت بۆلای کاك قادر مستەفا بۆ دەشتی هەولێر کاك حەمیدیش لای کاك خالید مایەوە ئینجا ئێمە بەرێ کەوتین بۆ دەشتی هەولێر ،بەرواری (١٩٧٧/١/٥) ئێمە کاك قادرمان بینی لەگوندی کانی سوسکە لەناوچەی دێدەوان نامەکەی کاك خالیدمان پێ داو زۆر کەیف خۆش بوو ،هێزی پێشمەرگە ئەو کاتە زیاتر ئیشوکاری هۆشیارکردنەوەی جەماوەر و رێکخستنی کوڕی گەنج بوو بۆ پێشمەرگایەتی ،ماوەی دوومانگ من ومیرزاو هاورێ کاوە مخموری بێ چەك لەگەڵیان دەسوراینەوە ،قادر مستەفا برنەوێکی پەیدا کرد دای بەمن،لەمانگی (١٩٧٧/٢) دوو کوڕ بوون بە پێشمەرگە لە گوندی (قەمبەر) یەکیان بەناوی حەمەخان ،ئەوەی تر بەناوی (ئەحمەد ئۆمەر ) لەدوایی دا ناوەکەی بوو بەئەحمەد قەمبەری زۆری پێ نەچوو حەمەخان دانیشت بەلآم کاك ئەحمەد مایەوەو بوو بەفەرماندەیەکی باش، کاك قادر برنەوەکەی لەمن وەرگرت ودای بەکاك ئەحمەد قەمبەری ئەوەی لەبیرم مابێت ئەو کاتانە ئەو چەند مەفرەزەیە لە دەشتی هەولێر هەبوو ( قادر مستەفا ،جلالی کوێخا رەفیق ، عبدالرحمان سۆنەگۆلی ، وەسمان بەگی گەرەوان ) بەهەموومان نزیکەی (٤٠) کەسێك دەبووین ئەمەش ئەوناوانەی کەلەیادم ماون :-

١. قادر مستفا

٢ کاوە مەخموری

٣ عزیز کەلەکی

٤. میرزا حەمەدەمین

٥. عبدالرحمان سۆنەگۆلی

٦ مستەفا گۆران

٧. حوسێن دۆشکە

٨. محەمەد عزیز خەڵکی قولقولە

٩. جەلالی کوێخا ڕەفیق

١٠. قاسمی برازای جەلالی کوێخا ڕەفیق

١١. بکر عزیز

١٢. وەسمان بەگ

١٣ علی قەڵغانی

١٤. محەمەد عبدالرحمان

١٥ ئەحمەد کوردە

١٦ ئەحمەد قەمبەری

١٧ ئەحمەد سماقە

١٨. حەمە خان

١٩ تایەر سماقە

٢٠ ئەحمەد قادر خەڵکی سێکانی

.٢١ یوسف

## لێدانی شورتەکانی حیمایەی نەوت لە شیواشۆک ١٩٧٧

شەریکەی شیواشۆک کۆمەڵێك ڕەبیەی قوەی سەیاری لێ بوو ( شورتەبوون ) هەموو ئێواران دووسەیارە پڕ حیمایە دەهاتن شەو لەشەریکە دەمانەوەو بەیانی دەگەڕانەوە وەکو قوەتێکی ئیحتیات ( تەواری ) لەمانگی( ٢ )کاك قادرمستەفا منی نارد بۆ تاقیب کردنی ڕەبیەکان وئەو سەیارانە، لەگەڵ شوانەکانی داربەسەرو شیواشۆك بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك بووم بەشوان، ڕۆژانە دەچووینە ناوڕەبیەکان ونزیك ڕەبیەکان زۆر بەجوانی شوێنێکی باشم هەڵبژارد بۆ لێدانی ئەو سەیارانەی کە ئێواران لەکۆیەوە دەهاتن بۆ شەریکە، شوانەکانیش ئەمانەبوون ( جەمال ئیلنجاغی ،برایم سماقەیی ،سەباح علی مەولود ، محەمەد ئەحمەد داربەسەری ) ئینجا گەڕامەوە بۆ لای کاك قادرو مەوزوعەکانم بۆ گێڕایەوە،شەوی ( ٢١/ ٢٢-٢-١٩٧٧ ) هاتینە گوندی داربەسەری گەورە ،هەر ئەو شەوە من لەگەڵ کاك قادرو ئامر مەفرەزەکانی تر هاتین ئەوشوێنانەم پیشان دان کەدەست نیشانم کردبوون هەر ئەو شەوە گەڕاینەوە بۆ گوندی داربەسەر، بۆ بەیانی هاتینە ناو شاخەکانی کۆلکەبی باخچەدارێکی قەیسی لێ بوو خاوەنەکەی ناوی مام مەولود بوو بە ڕۆژەوە لەوێماینەوە چونکە شوێنێکی زۆر عاسێ بوو نزیکەی ( ٢٠ ) دەقیقە لە شوێنی چالاکیەکەمان دوور بوو سەعات ( ٤ )ی عەسر هێزمکەمان کرد بەسێ بەش بەشێك لەگەڵ کاك قادر لەگەڵ کاك جەلال بۆ کەمینی یەکەم بەلای کۆیەوە

،بەشی دووەم لەگەڵ کاك عبدالرحمان سۆنەگۆلی لەگەڵ وەسمان بەگ و جەماعەتەکەی بۆ کەمینی دووەم بەلای شەریکەوە ،شوێنەکە وابوو ئێمە رۆژ مابوو هاتین لەشوێنەکانی خۆمان دامەزراین، مەفرەزەیەکیشمان لە پشت خۆمان بەجێ هێشت سەعات پێنج وچارەگ سەیارەکان لەکۆیە هاتن بەلام بەسوتفە لەباتی ئەوەی دووسەیارەبن ئەو رۆژە سێ سەیارە بوون بەلام ئێمە تازە ناچاربووین دەبوایە تەقەبکەین ئەگەر نا هەر کەشف دەبووین وتوشی شەڕ دەبووین هەردوو کەمینەکە زۆر بەچاکی هەدەفەکانی خۆیان پێکاو دووسەیارەکەی پێشەوە ئیبادەکران بەلام سەیارەکی دواوە تۆزێك دوور لەئێمە دابەزین وشەڕێکی باشیان کردو نەیان هێشت ئێمە بچینە سەر سەیارەکان تاوای لێ هات تاریك داهات شورتەیەك هجومی کردو نەدەگەڕاوە تەقەیان لێ کردوو کوشتیان منیش بەغار غارم داو چەکەکەم هێناو هاتمەوە، چەکەکە کلاشینکۆفێکی روسی بوو ،ئێمە نهێنیمان کەلیمەی هجوم دانا بوو هجوم دەستی پێکردو هەرکەسە لەئاستی خۆی کشایەوە ، هێزێکی دوژمن لەکۆیەوە هاتن و لەشەڕەکە نزیك بوونەوە بەلام ئێمە دوور کەوتینەوە بۆئەو شوێنەی کەبەرۆژ لێی بووین، سەرژمێری پێشمەرگەکان کرا دووپێشمەرگە دیار نەبوون یەکیان (کاك عبدالرحمان سۆنەگۆلی بوو) ئەوەی تریش ( محەمەد عبدالرحمان جەماعەتی وەسمان بەگ ) کاك عبدالرحمان هەر لەوێ شەهید دەبێ و قواتەکەدێن و تەرمی پیرۆزی بەدوای سەیارە ڕادەکێشن دەیبەنەوە کۆیە ،خەلکی کۆیە بەم کارە نیگەران ببوون محەمەدیش بەبرینداری چووبۆوە گوندی داربەسەری ( علی مەولود )،من وهاوڕێ کاومو ئەحمەد سماقە گەڕاینەوە بۆشوێنی شەڕەکە هەرچۆنێك بێت خۆمان گەیاندە ئەو شوێنەی کە بۆ کاك عبدالرحمان دانرابوو ، تاکە پێلاوەکی وشەو ئاوێنەی لەوێ کەوتبوو دۆزیمانەوەو گەڕاینەوە و دلنیابووین بەتەواوی کەشەهید بووە ،گێڕانەوەی

ئەو کارەساتە لە سەر لاپەڕە کاغەزێك زۆر ئاسانە بەلأم بی هێنیتە پێشچاوی خۆت بە کردەوە لە سالّی ( ۱۹۷۷ ) کارێکی زۆر گەورەو ترسناك وزۆر گرانە، ئێمە گەڕاینەوە لای کاك قادروبرادەران لەگوندی سماقـە ،بـۆ ڕۆژی دواتـر خـەلّکی ئیلنجـاغ و داربەسـەر ڕێ یـان بـەناو شـەریکە دابـوو کـەبۆ کۆیـە ئـەهاتن، شوانەکانیش هەر وەك چەند ڕۆژە چووبوونەوە بۆ ناو ڕەبیـەکان شـوانەکانیان گرتبوو لەگەلّ چەند هاولأتیەك کەچووبوون بۆ شـار زۆر زۆریـان لێـدابوون و چـەند ڕۆژێکیـان هێـشتبونەوە لای خۆیـان دوایـی بـەریان دابوون، لەگونـدی داربەسەر جوا بمان بۆهات کەبریندارێکی پێشمەرگە لەوێ یە ،ئینجا من لەگەلّ وەسمـــان بـــەگ وجەماعەتەکـــەی چـــووینە گونـــدی داربەســـەرو محەمەد عبدالرحما نمان لەگوێ درێـژێك بـارکردو چوویـــــــــــــن بـۆ گۆمەشـینی سەیدان،گۆمەشینی سەیدان گوندێکی گەورە بوو ڕژێم نەخۆشخانەیەکی لیّ دانا بوو بردمانە نەخۆشخانەکەو تەداویان کردو لەگەلّ سەید حوسێن باوکی سـەید حمدامین تـا سەر جادەی کۆیە هەولێر وەسمان بەگ و جەماعەتەکە یمان بـەڕێ کرد.

من وکاك سەید گەڕاینەوە ، سەید حـسێن تـەنزیمی بزوتنـەوە بـوو ئێـستا نەببووە پێشمەرگە ،چەند مانگێك دوای ئەو مەوزوعـە بـوو بە پێـشمەرگە لای سەید کاکە،ئەم چالاکیە دەنگ دانەوەیەکی گەورەی هەبوو لەناوچەی هەولێرو کۆیە ، برایم سماقە بۆی دەگێڕامەوە کەشوڕتەکان چۆنیان لیّ دابوون دەیگووت لیّ یان دەداین ودەیان گووت ( انت قاتل شرطی ) ئەمنیش لـە بـەر خۆمـەوە دەم گووت ( ئەمنی چی و حاری چی ئەحمەد کوردە قاتل شـرطی ) مـن هەرچـەندێك پێدەکەنیم ئەوان زیاتر لێیان دەدام چونکە ئـەوان نـەیان دەزانـی مـن بەچـی لەبـەر خۆمـەوە پێدەکـەنیم ، بەداخـەوە ئـەم داسـتانە بـەخوێنی گەشـی

( عبدالرحمان سۆنەگۆلی ) تەواو بــوو ،شـەهید عبــدالرحمان ســۆنەگۆلی دوو خێزانی هەبوو لە ئەسڵ خـەڵکی سـێکانی دەم زێ بــوو لەســۆنەگۆل دادەنیـشت کۆمەڵێك منداڵی بێ باوکی لە دوای خۆی بەجێ هێشت هــەزاران سـڵاو لــەڕوحی پاکی شەهید ( عبــدالرحمان ســۆنەگۆلی ).ئــەوەی دەمــەوێ باســی بکــەم لــەم ئەبەردیە مەفرەزەکانی کاك قادرمستەفا وکاك عبدالرحمان ســۆنەگۆلی وکــاك وەسمـان بەگ وکاك جەلالی کوێخا ڕەفیق بەشداربوون..

## گەشە کردنی هێزی پێشمەرگەو دەشتی هەولێر لە ساڵی (١٩٧٧)

### تەشکیلەی هەرێمی (٨)

ـ کاک سەعدی گچکە : ئامر هەرێمی (٨)٠

ـ کاک فارۆق سدیق (مامۆستا فارۆق) ڕابەر سیاسی هەرێم٠

ـ کاک قادر عزیز بەرپرسی لقی چواری بزوتنەوە٠

ـ کاک جەمال خۆشناو / کادیر٠

ـ پێشمەرگەکانی کاک سەعدی (ئەحمۆ چەمرگەیی ، موحسین حەمشین ،یاسین قادر ، عەباس عزیز ،زیاد گچکە ، فەرخ قەراجی ، فەریق هەمزە سێکانی ، شاهین عزالدین پردێی ، تاهیر گاوەرە (تاهیرە کوێر) ، مام علی)٠

ـ کانەبی چاوشینیش چەند پێشمەرگەیەکی لەگەڵ دابوو ( خولەی برای ، علی گاور ، کانەبی ، بەهرام ).

ـ کاک قادر مستەفا ، ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵ بوو:-

(ئەحمەد کوردە ، میرزا حەمەدامین ، کاوە مەخموری ، مستەفا کەنداری، ئەحمەد سماقە ، تاهیر حەمەبۆر سماقەیی ، بەکر عزیز بەردە سپی ، عزیز

کەلەکی ( پێشمەرگەیەکی ئازاو و جیٚ دەست دیاری شۆڕشی ئەیلولیش بوو مەلەوانێکی چاکیش بوو )، علی قەلغانی ، محەمەد عزیز قولقولەیی ، محەمەد رەسولٚ سێگرتکانی ، حەمە خان قەمبەری ، ئەحمەد قەمبەری ،حوسێن مەنتك ( حوسێن دۆشکە ) ، جەلال کوێخا رەفیق بەردە سپی ،قاسمی برازای ، پیاوێکی تێکۆشەر بەناوی عبدالرحمان سۆنەگۆلی تازە لە ئێران گەڕابۆوە دوو مالٚ و خێزانی هەبوو لە شۆڕشی ئەیلولیش فەرماندەبوو.

ــ علی سالٚح کادیری کۆمەلە بوو ئەم پێشمەرگانەی لەگەلٚ بوو ( سەدرەدین ، علی ئاومالٚی ، ئەسعەد ئاومالٚی ، ئەحمەد قادر سێکانی ، دلێر کانی لەلەیی ).

تەشکیلەی هەرێمی ( ١٢ ) ی خۆشناوەتی

ــ سەید کاکە ئامر هەرێم

ــ کاک سەید کەریم جێگر هەرێم ( لەشۆڕشی ئەیلولیش فەرماندەی بەتالیۆن بوو لەهێزی سەفین ).

ــ مامۆستا کاوە / کادیر

ــ کاک سلێمان بیرێژی فەرماندەی مەفرەزە

ــ کاک ئەحمەد خانی بۆلی

ــ کاک حەوێز هیرانی / لێپرسراوی لقی خۆشناوەتی

ــ کاک عبدللە مەندێری

ــ کاك عزیزی ڕابی فەرماندی مەفرەزە

ــ مام تەها کاوانی مەلای حاجی ڕەسوڵیش ئەم پێشمەرگانەی لەگەڵ دابوو (بەکر حەمەد ، نادر مەنتك ،عوسمان لاوە ، هتد.........

ــ د. خدرمەعسوم ( دەتوانم بڵێم تاکە دکتۆری هێزی پێشمەرگە بوولەناوچەی هەولێرکە کۆڵە پشتی لە پشت بێ ولە گەڵ ئێمە جەولە بکات ).

- ئەم پێشمەرگانەش ئەوەی لەیادم ماوە :-

( یوسف دیگەڵە ،نەریمان ،ئازادوشێرزادخۆشناو، سەید حوسێن گۆمەشینی ،سەیدجبار، سەیدحوسێن گۆمەتالی، سەید کەمال ، سەباح جەمیل ، باپیر گورزەیی ، ئەحمەد گورزەیی، سامی سەید عوبێد ، سەلیم کێشکە ، مام زرار ( هێمن )،ئەحمەدجەمیل ،عوسمان سابیر، سامی قادر ، خالید سابیر، زرار مەندێری ، مشیر هیرانی ، ئەحمەد هیرانی ، شکور ، حوسێن بابۆلی ، شێخە بابۆلی ، سلێمان بابۆلی ، عبداللە سابیر ، سمکۆ ،شەریف بەرەکەیی ، جەوهەر بەرەکەیی ، عبداللە بەرەکەیی ،بێستون ،یوسف ، نادر گەرۆتەیی ،شینەی بۆلی ، وەسمان بەگ ، محەمەد عبدالرحمان ، حەمەلاو ، سامان گەرمیانیش تازە لەئەورووپا گەڕابۆوە لەگەڵیان جەولەی دەکرد بۆ ماوەیەك دواتر گەڕایەوە بۆ ناوچەی سلێمانی، چەتۆی کەریمەسورو شێخ جەواد بێدەری ئەوانیش لە ڕۆژهەلاتی کۆیە بوون دەوری ( ١٧ ) پێشمەرگەیەکیان لە گەڵ بوو

ــ کاك مەلابەختیار لەسەرکردایەتی کۆمەڵە ڕەوانکرابوو بۆدەشتی هەولێر بۆنەدوە کردن بە دێهاتەکان بۆ گەشە کردنی کۆمەڵە جاروباریش دەچووە ناو هەولێر.

## چوونمان بۆ ناوهەولێر بۆ ئەنجامدانی چالاکی یەك( ١٩٧٧/٢/٢٨ )

من وهاوڕێ کاوەو پێشمەرگەیەك بەناوی ( ئارام ) گەیشتینەناو هەولێر، چەند نارنجۆکێکمان ( ڕومانە ) برد کەواچالاکی بکەین لەناو هەولێرسەیارەکی ئەژدەمان بۆدەسنیشان کرابوو ،مەوعیدێکمان دانا پاش دوو ڕۆژ یەکتر ببینینەوە بەلآم من ژمارە تەلەفۆنی ماڵی خوشکم دابوو بەهاوڕێ کاوە خۆشم چووم بۆماڵی خوشکم چونکەماڵی خۆمانم پێ نەدەزانی، لەڕێگای ماڵی خوشکمەوە ماڵی خۆمانم دۆزیەوە ئەمجارەش لەگەڵ دایکم و ماڵی خۆمان بەیەکتر شادبووینەوە ،ماڵەوەمان دەترسان چونکە دائیرەی ئەمن بەدواوەیان بوون لە بەر ئەوەی من پێشمەرگە بووم کاکم پێ ی باش بوو بگەڕێمەوە ماڵی خوشکم، بۆشەوی دووەم گەڕامەوە ماڵی خوشکم هاوڕێ کاوە تەلەفۆنی بۆکردم. گووتی" بە پەلەوەرە بۆفلکەی سێتاقان چاوەڕێت دەکەم منیش زانیم شتێك بووە چووم بۆلای هاوڕێ کاوە گووتی" با بەڕێ کەوین بگەڕێینەوە چونکەئەو کوڕەی لەگەڵمان بوو خۆی تەسلیمی دائیرەی ئەمن کردۆتەوە تەکبیرمان کرد کە بگەڕێینەوە لەگەڵ هاوڕێ کاوە چووینە ماڵی خۆمان ئاگادارمان کردنەوە کە شتێکی ئاوا ڕووی داوە ئێمە دەگەڕێینەوە. چووین بۆئەو شوێنەی کە سەیارەکانی بەستی شەرغەی لێ ڕادەوەستا پرسیارمان کرد ئۆرەی کام سەیارەیە؟ پیاوێك هاتە پێش و گووتی" سەرەی منە دەچمە گوندی بایزاغا پێنج تاشەش پیرەژن لەناو سەیارەکە دانیشتبوون. زیلە قەدیمەکانی عەسکەری بوو ئێمەش سوار بووین و بەڕێ کەوتین بەرەو بنەسلآوەو لەوێشەوە بۆ کورداوە ،گەیشتینە گوندی چەمرگە لەسەر جادەکە ئیژغالی عەسکەری لێ بوو سەیتەرەکیان دانابوو من وهاوڕێ کاوە مشەوەش بووین چونکە هیچ

هەویەیەکمان پێ نەبوو یەك ونارنجۆکیشمان پێ بوو هاوڕێ کاوە گووتی" ئەگەر داوای هەویەیان لێ کردین نارنجۆکەکانیان پێ دادەدەین وهەڵدێین پیرێژنەکان هەستیان پێ کرد گووتیان" هاکوڕم چیتانە؟ منیش گووتم" هەردووکمان هەویەمان پێ نیە ژنەکان وەك شێر ئێمەیان کردە کوڕی خۆیان و هەریەکەمان بووینە کوڕی یەکیان ناوی خۆمانیشمان پێ گووتن،گەیشتینە بازگەکە دوو جوندی وەستابوون ئێمەش خۆمان لە پەنای پیرێژنەکان نابوو جوندیەکان بەدەست ئیشارەتی سەیارەکەیان داین و گووتیان" بڕۆن. پیاوێکی بەتەمەن ناوی مام سمایل بوو کە ڕەت بووین لە سەیتەرەکە گووتی" هەتیوە لوسکەینە پێم ناڵێن کێوە دەچن؟ کاوە جوابی دایەوە گووتی" حاجی ئێمە پێشمەرگەین دیار بوو حاجی زۆر سوعبەت چی بوو گووتی"( ئەگەر گوتم بن ) ئێمەش نارنجۆکەکانمان دەرهێناو گووتمان" حاجی بە تەمابووین لە بازگەکە جوندیەکان بکوژین ،حاجی یەك بەخۆی هاواری کردو لە سەقفی سەیارەکەیدا گووتی" ڕاگرە دادەبەزم پیرێژنەك هاواری کردو گووتی" سمەی شینەی واز لەم کوڕانە بێنە، سایەقی سەیارەکە ڕایگرت ئاگای لەو هەموو بەزمە نەبوو لەسەرەوە. کە ئەویش زانی نارنجۆکمان پێ یە ئەویش هاواری کردو گووتی" ماڵم کاول بوو پێشمەرگەم بارکردوە، ئینجا من بۆم دەرکەوت حاجی باوکی برادەرێکی خۆمە بە ناوی ( خەلیل ) کەوتینە دەمە تەقێ لە گەڵ حاجی گووتم" من برادەری خەلیلم گووتی"( لە تری تۆو خەلیل بەم ) گەیشتینە گوندی ڕەسوڵ بسکۆر هاوڕێ کاوە گووتی" کوردە گیان بادابەزین تاحاجی هینـــــــــــــــی نە کردوین! دەستی پیرێژنەکانمان ماچ کردو دوعابوونمان لێ خواستن ، لە کۆتاییدا زۆر سوپاسی هەموو پیرێژنەکانی گوندەکان دەکەم چونکە وەك دایکمان وابوون

## چالاکیەك لە دەشتی هەولێر :-

هێنانی مێگەلێك مەڕی زاو و حەزیرەی حکومی لە گوندی ( دۆڵە بەکرە ) لەزستانی ( ١٩٧٧ ) زیاتر لە سەدو پەنجا مەڕی زاومان دەست بە سەرداگرت و هێنامان، بەڵام فرۆشتن و سەرف کردنی ئەو مەڕانە زۆر زەحمەت بوو چونکە مەڕەکان هەمووی گوێیان سمرا بوو ئەڵقەیان لە گوێ بوو،کەم کەس دەی وێرا ئەم مەڕانە بکڕێت یان بەخێو بکات ، پیاوێك هەبوو بەناوی عبداللەی مەلا محەمەدی نێرەگێن گووتی" من مەڕەکان سەرف دەکەم،بەلآم باوکی بەکاك سەعدی گووت ئەو مەڕانە مەدەن بە عبداللە چونکە هەمووی دەخوات،لەڕاستیشدا وا دەرچوو مەڕەکانی هەموو سەرف کردو کەمێکی پارەکەی داوە بەشۆڕش، مەلا محەمەد پیاوێکی قسەخۆش ومەلایەکی ڕوّح سووك بوو، حوجرەیەکی هەبوو کەدەچووینە گوندی نێرەگێن لەحوجرەی مەلا کۆدەبووینەوە،ماڵی مەلا منداڵەکانی هەمووی کوڕبوون کچیان نەبوو خێزانەکەی بەتەمەن بوو بۆیە هەرچی کەسێك بچوویایە ئەم حوجرەیە دەبوایە بۆ خۆی چالێ بنێت یان سفرە ڕا بخات بەکوردی وکرمانجی دەبووایە کارێك بکات

## *چوونمان بۆناو هەولێر لەگەڵ کاك سعدی گچکە ١٩٧٧*

لەکاتی تەواوکردنی چالاکی هێنانی مەرە حکومیەکان ،کانبی چاوشین سەیارەیەکی جێب وەسەتی پێ بوو ،لەشوێنی چالاکیەکە کاك سعدی بانگی

کردم گووتی""کوردە تۆ لە گەڵ کانبی چاوشین سواربە بەڵام چی کردو چوو بۆ هەر شوێنێك لەگەڵی بە دواتر کە هاتیەوە بۆم بگێڕەوە ،دیاربوو کاك سعدی شکێکی لە کانەبی هەبوو ،من وکانەبی و دوو پێشمەرگەی کانەبی سواری جێبەکە بووین ،کاك سعدیش پیکابێکی پەیداکردبوو لەگەڵ هەندێك پێشمەرگە سواربوون وڕۆیشتن،هەندێك پێشمەرگەش حەیوانەکەیان پێش خۆدا، کانبی ڕۆیشت بۆگوندی جل بەسەر لەوێ لای دا ماڵە سەیدێك دوومەڕو دوبەرخی لەسەیارەکە داگرت ،دواتر گەڕاینەوە گوندی نێرەگین لای کاك سعدی لەوێ کاك سعدی لەماڵی مەلا محمد نێرەگینی بوو چووم بۆلای وبۆم باس کرد کە من و کانبی چووینە کوێ هەر لەو کاتەدا کاك قادرمستەفاش گەیشتەلامان ،کاك سعدی هەندێك قسەی بە تەنیا لەگەڵ کاك قادر مستەفا کردو دواتر بانگی منی کرد گووتی" ئەوە قسەم لەگەڵ کاك قادر کردوە لەئێستاوە تۆ لەگەڵ من دەبیت بۆماوەیەك منیش گووتم" ئێوە چۆنتان پێ باشە باوابێ دواتر لێك جیابووینەوە ئێمە ( دەستەکەی کاك سعدی ) چووینە گوندی میرکە لەوێ تراکتۆرێکمان پەیداکرد کاك سعدی گووتی" ئەحمەد کوردە تۆ ماڵی حاجی ئەحمەدی بزندز پێ دەزانی؟ منیش گووتم" بەڵێ لە ماڵە ڕەشماڵ نشینەکانی نێوان کانی سوسکەو ڕەسووڵ بسکۆرە ؟ گووتی" زۆرباشە بەس تۆلە لای سایەق تراکتۆرەکە سواربەو بڕۆ بۆماڵی حاجی ئەحمەد، خۆی و پێشمەرگەکانی تریش چوونە ناو عارەبانەی تراکتۆرەکە ( یەکێك لە خاسیەتەکانی کاك سعدی گچکە ئەوەبوو لە پێشی سەیارەوتراکتۆر سوار نەدەبوو ) ،ڕۆیشتین،ماوەی چارەگە سعاتێکمان مابوو بگەینە بزندز تراکتۆرەکەم ڕاگرت و دابەزیم وسوڕامەوەلای کاك سعدی گووتم" دابەزن وبەسایەقی تراکتۆکەشم گووت "کاکە بە خێرچی خوات لە گەڵ " کاك سعدیش گووتی" ها کوردەگیان چ بکەین؟ منیش گووتم "کاك سعدی لەوکەندە کانیەکی

لیّ یە بابچینە سەر ئەو کانیە خۆت ئەزانی ئێمە چالاکیمان کردووە و مەڕومالاتی دوژمنمان هێناوە بەیانی کۆپتەر وەك چاوئێشە لەوڕەشمالانە دەگەڕیّ " کاك سعدی گووتی" ئەحمۆ بۆ قسەیەك ناکەی ( مەبەستی ئەحمۆ چەمرگەیی بوو ،یەکێك بوو لە پێشمەرگە قارەمانەکانی دەستەکەی کاك سعدی ) ئەحمۆش هاتە وەلاّم و گووتی" کاك سعدی تۆ مەفرەزەکەی قادر مستەفات پەك خست ودەستەکەی خۆمانت بەهێز کرد ( مەبەستی گواستنەوەی من بوو لە مەفرەزەکەی کاك قادرەوە بۆ دەستەکەی کاك سعدی )،من خەڵکی ئەو ناوچەیەم بەقەد ئەحمەد کـــــوردە شارەزای ئەو ناوچەیە نیم .کاك سعدیش گووتی" ماڵی مام ئەحمەد چەندی ماوە ؟ منیش گووتم "چارەگە سعاتێك" گووتی" باشە بەقسەی ئەحمەد کوردە دەکەین ،شەو لەلای کانی وناوەکە ماینەوە ،لەگەڵ گزنگی بەیانی کۆپتەر وەك ریشۆڵە بە ئاسمانی ناوچەکە بلاّوبوونەوە بەلاّم هیچیان دەست نەکەوت و بیّ زیان لە سعات ١٠ی پێش نیوەڕۆ گەڕانەوەو ناوچەکەیان بەجیّ هێشت ،ئێمەش چووینە ماڵی حاجی ئەحمەد لە بزندز نیوەڕۆ نانمان خوارد،دەمەو ئێوارە کاك سعدی داوای لە حاجی ئەحمەد کرد سیّ ولاّخمان بۆبهێنیّ ،من وکاك سعدی وئەحمۆ چەمرگەیی بەسواری ولاّخەکان رۆیشتین چووینە چەمرگە،وابڕیار بوو من لە چەمرگە بمێنمەوە بەلاّم کاك سعدی بڕیارەکەی گۆڕی و گووتی" وەرە لەگەڵمان ،دنیا تاریك داهات ،لەوێشەوە چووینە شینایی یەکانی خاتووناوە کەچەندکیلۆ مەترێك لە گەڕەکی باداوەی شاری هەولێر دوورە ،لەویّ لە کاولە خانویەك دابەزین کاك سعدی گووتی" کوردە تۆ دەوێری لێرە بمێنیەوە من وئەحمۆ دەچینە ناو شار زۆرمان پیّ ناچیّ ؟ منیش گووتم" فەرموون بڕۆن ،ئەوان رۆیشتن،منیش ولاّخەکانم بەستایەوەوخۆشم چوومە ناو کاولە خانووەکە وخۆم ماتدا ، پاش ماوەیەك گەڕانەوە ،بەلاّم من هیچ ئەم پرسی چوون بۆکویّ یان چتان کرد

،هەندێك نانیشیان بۆمن هێنابوو،سواربووین وگەڕاینەوە بۆ چەمرگە،( بەلاّم من دوایی زانیمەوە کەئەوان چووبوونە ماڵی خدر چەمرگە لەوێ باسی منیشیان کردبوو خدر چەمرگەش گووتبووی خۆزیا بتان هێنابا ئەوەخزمی خۆمە سلاّویشی بۆ ناردبووم ) ،لەچەمرگەشەوە هەر بەو شەوە چووینەوە بۆبزندز، لای پێشمەرگەکان لە ماڵی حاجی ئەحمەد ، بۆبەیانی ،حاجی ئەحمەد حەیوانێکی بۆسەر برین نیوەڕۆکەی خواردمان ، پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو بەناوی ( تاهیر گاوەرەیی ) چوو بوو بۆ بەدل کردنی واجبات لە بەرزایی پشت مالاّن ،لەرێگا سەگەکانی ماڵی حاجی ئەحمەد هێرشی بۆ دەکەن ئەویش لە ترسی خۆی فیشەکێکی لەسەگە گەورەکە دابوو حاجی ئەحمەد بەو کارەی تاهیر زۆر دڵ گران بوو بەلاّم بۆچاك کردنەوەی دڵی مام ئەحمەد کاك سعدی تاهیری چەك کرد دواتر دوعابونمان خواست و رۆیشتین،گەیشتینە گوندی بانی ماران لەوێ لەگەڵ کاك قادرمستەفا و برادەران یەکترمان گرتەوە ۰

## گرتنی پێشمەرگەیەك لەلایەن کۆپتەرەوە

ماوەیەك بوو کۆپتەر بە مەفرەزە دەگەڕا رۆژێك زۆربەی هێزەکان لە بانی ماران بووین لە زستانی ( ۱۹۷۷ ) پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو بەناوی ( فەیسەڵ ) پیاوێکی کورد پەروەرو بەدین بوو برادەرانی کۆمەڵە زۆر داوایان لێ دەکرد کە ببێت بە کۆمەڵە بەلاّم کە باسی ( مارکس ولینین )یان دەکرد ئەو دەکشایەوەو دەیگووت " من نوێژ دەکەم "ئەویش هاتبووە دەستەکەی کاك سعدی ئەو رۆژەی لەبانی ماران بووین داوای مۆڵەتی کرد بچێتە گوندی شاخە پێسکە بۆئەوەی چاوی بە کەس وکاری بکەوێت و خۆشی بشوات بەلاّم بەیانی بەرۆژ ئێمە ماینەوە لە گوندی بانی ماران لەسەعات( ۱۱بۆ۱۲ ) من و فەریق هەمزە حەرەس بووین لە سەعات ( ۱۲ ) بەدل کراین،چووینە ماڵی مام عومەر کەماڵی

لە تەنیشت مزگەوتەکە بوو بۆ نان خواردن ، ئێمە خەریکی نان خواردن بووین ئەوانەی لە پێش ئێمە نانیان خوارد بوو گەڕابوونەوە مزگەوت گوێ یان لە دەنگی کۆپتەر دەبێت وکاک سەعدی دەڵی ناو گوند بە جێ بێلن بەرەو دۆڵەکەی خوار ئاوایی بڕۆن، من و فەریق کە خەبەریان داینێ پێشمەرگە لە ناو دێ نەمابوو کۆپتەریش لە ئاسمانی دێ یەکە جەولەی دەکرد لەخوارووی مزگەوت بە چەند مەترێك کانی و ئاوێکی لێ بوو لە بەر ئاوەکە گەلە تودرك ( داری تودرك ) ی لێ بوو تەیر نەبێت هیچ شتێك ناتوانێت نزیك ئەو دارانە ببێتەوە ،ئاسمانی دێ یەکەلە بەر تۆزی پەروانەی کۆپتەر بزر ببوو سێ کۆپتەر نیشتبوونەوەو چەند کۆپتەرێکیش جەولەیان دەکرد،منوفەریق گەیشتینەلای دارەکان کورد گووتەنی جۆنیانی فەریق خۆی هەڵدا ناو تودڕکەکان منیش بەدوای ئەو،کەوتینە بن دارەکان وبزر بووین ( خوێنەری بەڕێز بیهێنە پێش چاوی خۆت مرۆڤ ئەو هەموو هەزار دڕکەی لە گیانی ڕابچێت و خوێنی لێ بێ و ئازاری هەبێت بەلام لەترسی جەیش و کۆپتەریش نەوێرێت نوقتەبکات ) دەنگی کۆپتەرەکان بڕاو بەرەو شاخە پێسکە بەڕێ کەوتبوون ، فەریق حەڕبەی دەرهێناو هێواش هێواش دارەکەی دەبڕی تاوای لێ هات ڕێگای خۆمانی کردەوەو هاتینە دەرەوە بەرەو لای مزگەوت بەگیانی خوێناویەوە بەڕێ کەوتین و پێشمەرگەکانی تریش لەخوارەوە هێواش هێواش ئەهاتنەوە بۆ ناو دێ،سەربازەکان لەبانی ماران کەسیان ئازار نەدابوو دکتۆرێکیان لە گەڵ ببوو داوای لە خەڵکەکە کردبوو ئەوەی نەخۆشە با بێت چارەسەری بکەم هەندێك لە خەڵکەکە داودەرمانیان وەرگرتبوو وەك وحەبی سەر ئێشەو شتی تر هەموومان کەگەڕاینەوە بۆ لای مزگەوت من و فەریق ئەتکووت پشیلە جنجڕۆکی لە دەموچاوی داوین،من کاك سەعدیم کەم بینی بوو پێ بکەنێت ،بە پێ کەنینەوە گووتی " ئافەریم ئەوە چیتان کردووە ؟ وەزعەکەمان بۆ گێڕایەوە کە چۆن بەو

تودڕکەوە بە پەند چووین کاك سەعدی گووتی" خۆحەشاردان بەشێکە لەدەست کردنەوە ، برادەرانیش زۆرمان پێ پێ کەنین ،کۆپتەرەکان کە گەیشتبوونە شاخە پێسکە بەهەمان شێوەی بانی ماران چواردەوری دێ دەگرن و فەیسەڵ قادر ئیسماعیلی پێشمەرگەش دەست گیر دەکەن وزۆر زەختی لێ دەکەن کەلەکوێ لەگەڵ جەماعەتتان یەکتر ئەگرنەوە مەوعیدتان لەکێندەرە ، پێشتر باسی فەیسەڵم کرد کە پیاوێکی بەویژدان و جوامێرو نیشتیمان پەروەر بوو ،قواتی کۆپتەرەکانی بە ئەنقەست بەهەڵە بەرەولای حاجی کاکۆل بردبوو کە لەوێ هیچی لێ نەبوو کۆپتەرەکان زۆر گەڕابوون هیچیان نەدۆزیبۆوە ناچارگەڕابوونەوە،هەر لەوکاتە دوو هاوولاتی بە ناوەکانی ( مام فارس ومام کریمە رەش ) دەستگیر دەکەن بە کۆپتەر دەیان گوازنەوە ،دواتر لە ڕێگای موختارەوە ئازاد دەکرێن ،فەیسەڵیش ماوەیەك لە زیندان بوو دواتر بەداخەوە لەسێ دارەدرا هەزاران سلاّو لەگیانی پاکی ئەو کەڵە پیاوە.

## چیای هەورێ و شەهید بوونی مەلای حاجی ڕەسوڵ لەساڵی ( ١٩٧٧ )

کاك مەلا فەرماندەی مەفرەزەبوو لە هەرێمی ( ١٢ ) ی خۆشناوەتی لـە شـەوی ( ١٠/ ١١ ) ی تشرینی دووەمی ساڵی( ١٩٧٧ ) ئێمە هێزەکانمـان لەگونـدی جـەلی بوو شەو لە مزگـەوت خـەوتبووین لـە بەرەبـەیان پاسـەوانەکان هـەموویان هەڵساندین و گووتیان" چوار دەورمان گیراوە ،هێزەکـان پێـك هـاتبووین لـە دەستەکەی کاك سعدی ودەستەکەی کاك سید کاکە ودەستەکەی کاك سید کـەریم وکـاك مەلابـەختیارو مەفرەزەیـەکی کادیرەکـانی کۆمەڵـە ومەفرەزەکـەی ئەحمەدخان ومەفرەزەکەی مەلای حاجی ڕەسوڵ , ئەحمـەدخان لەگـەڵ مـەلای حاجی ڕەسوڵ بەدوو پێشمەرگەوە ئێوارە چووبوونە گوندی سکتان بـۆ ئـەوەی چاویان بە کەس وکاریان بکەوێت ،ئێمە لەگوندی جەلی توشی قوونـە شـەڕێك بووین لەگەڵ سەربازەکان تـالەنـاو دێ دەرچووین نزیکەی سێ سەعاتی مابوو بۆ ڕۆژهەلات ئێمە لەناوچەکە دوورکەوتینــەوە چــووینە گونـدی هـاوڕێ لـەوێش بەسەرکەوتین بۆ سەر چیای هەورێ ،لە چیای هەورێ لەسەر شاخەکە بووین بە دوو بەش بەشێکیان کاك سعدی گچکەو کاك مەلابەختیار ،بەشەکەی تر سلێمان بیریژی وسەید کاکە،( علی کۆ ) ماوەیەك بوو تەسـلیم ببـۆوە هـاتبووە گونـدی هیزۆپ ئەحمەد خان و دوو پێشمەرگەکەی خزمـی خـۆی بـوون دەیـان باتـەوە تەسلیم بە ڕژێمیان دەکاتەوە ،مەلای حاجی ڕەسوڵ بەتەنها دەمێنێتەوە بـەڕێ دەکەوێت بەرەو چیای هەورێ بۆ لای ئێمە لە پشت گوندی سکتان لە گوندی گۆڕە شێر توشی کەمینی سەربازی ڕژێم دەبێت بەداخەوە هەر لەوێ شـەهیدی دەکـەن ئێمەش لەسەر چیا گوێمان لە تەقەکان بوو هەموومان خۆمـان کـۆکردەوەو لـە

شاخەکە دابەش بووین بەلام سەربازەکان لە دوورەوە بە دووربین ئێمەیان کەشف کردبوو وەختێکمان زانی کەلە کۆپتەرێکمان بۆ هات، نزیکەی (١٠) کۆپتەر دەبوون کۆپتەرەکان زۆر نزیك ببوونەوەو دەیان ویست جوندی ئینزال بکەن (دابەزاندن) من ئەو کاتە لەگەڵ کاك سعدی بووم بەینی ئێمەو سەربازەکان(٣) کم دەبوو لەلای سەید کاکەو سلێمان بیرێژی بوو بەتەقە لەگەڵ کۆپتەرەکان ،لەکۆپتەرێکیان داو گڕی گرت و بەرەو لای شاری رانیە رۆیشت کۆپتەرەکان لای ئێمەش نزم بوونەوە ئێمەش لەکۆپتەرێکمان داو هەر لەنزیك خۆمان کەوتەوە لە گوندی ئەسپین دارە،دەمەو ئێوارە ویستمان بچینە سەرکۆپتەرەکە هێزێکی زۆری رژێم هاتبوونە گوندی ئەسپیندارە نەمان توانی بچینە سەرکۆپتەرە شکاوەکە، پەرینەوە بۆ گوندی گەرۆتەو شەو لەوێ ماینەوە بەیانی چووینە سەرچیای سەفین ،شەهید بوونی مەلای حاجی رەسوڵ و چوونەوەی ئەحمەد خان کەلێنێکی لە هەرێمی (١٢) دروست کرد ،هەزاران سلاو لەگیانی کاکە مەلاو گشت شەهیدانی رێگای رزگاری خوازی گەلەکەمان

## شەهیدبوونی حەمەغفور ئاغجەلەری ١٩٧٧

تازە دەهات شۆرش دەست بالا دەبوو هەرێمەکان دامەزرابوون ،هەرێمەکان گەرابوونەوە شوێنەکانی خۆیان ،هێزی پێشمەرگە گەشەدارو بەشەوق بووین،هێزەکان لەگوندی سێگرتکان کۆببووینەوە بۆجێ گۆرکێ و رێکخستنی هەردوو هەرێمەکەو لق وناوچەو مەفرەزەکان ،دکتۆر خدر مەعسومیش هاتبووە خواری بۆجەولەکردن بەناوی خەتی گشتی ،ئەویش جاروبار کۆبوونەوەی بە دێ یەکان دەکرد بەناوی خەتی گشتی لەناویەکێتی نیشتیمانی کوردستان چونکە یەکێتی هەرلەسەرەتاوە بەنیمچە بەرە ناودەبرا،هەرلەوکاتە لە(١٩٧٧/٧/٢٣) ئێمە خەبەرمان بۆهات کەمەفرەزەیەکی سەر بەقیادەی مۆقەتە بەناوی قادر

فەرەج بۆسەی بۆمەفرەزەیەکی یەکێتی ناوەتەوە ،ئەوانیش کەوتوونەتە بۆسەکەوە حەمەغەفورئاغجەلەری وهاوڕێکانی شەهید دەکات وئینجا دەگەڕێتەوە ناو ڕژێم،بەشەهید کردنی حەمە غەفوروهاوڕێکانی قالەفەرەج بوو بەسەرۆك جاش ،لەدوایدا پیاویکی زۆر خراپی لێ دەرچوو بەرامبەر خەڵکی کوردستان ،دواجار خۆشی کوژرایەوە.هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی فەرماندەی قارەمان حەمە غەفور ئاغجەلەری وهاوڕێکانی (ئەنور کەریم ،ئەحمەد محمد ،عبدالله تۆفیق ،حەمید عەزیز ،ڕەمەزان سەعید ،ڕەزا عومەر) و سەرجەم شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردوکوردستان.

## هاتنە دەرەوەی برایەکانم ١٩٧٧

موختار برایەکانم ئاگادار دەکاتەوە کەوا سەردانی دائیرەی ( ئەمن ) بکەن چونکە لەکۆیەوە ماڵیان هاتبووە هەولێر لە گەڕەکی سێتاقان بەڵام کاکموان ناچن بۆ دائیرەی ئەمن، هەرلەزستانی ١٩٧٧ یەکسەر بە عایلەوە هاتنە دەرەوە لە گوندی سماقە ماڵێکی سەفەریان پێک هێناوە لەگەڵ ئێمە بوون بە پێشمەرگە ،چوار پێنج مانگێك پێشمەرگە زیادی دەکرد دوو گەنج لە کۆیەوە هاتن بۆ لامان بوون بە پێشمەرگە بەناوی (شێروان حەمەدەمین ،ناومان لێ نا نامانج ،ئەحمەدئیسماعیل (ئەحمەد بڕنەو)) بەم شێوەیە پێشمەرگەی کاك قادر مستەفا کرا بەدوو مەفرەزە بڕیاریاندا من بکەن بەئامرمەفرەزە بەڵام من ڕەتم کردەوە بۆ سابیری برام کە لەشۆڕشی ئەیلول جێگری سەر لق بوو برادەرانیش پێ یان خۆش بوو قبوڵیان کرد هەر لەومانگانە تەنزیمی کۆمەڵە لە هەولێر کەشف ببوون زۆربەیان گیرابوون هەندێکیشیان ڕایان کردبوو بۆلای ئێمە بۆدەشتی هەولێر بۆناو هێزی پێشمەرگە. بەیانیەك لە گوندی میرکە دەچووینە دەرەوە بۆپشتی دێ شاخێکی عاسێ ی لێ بوو چونکە دەبوو هەموو ڕۆژێك بەیانیان لەدێ بچینە دەرەوە. گەیشتینە ناوشاخەکان دونیا بەرەو ڕووناکی دەهات ئەوشوێنەی ئێمە مەبەستمان بوو چەندکەسێك لەوێ ملە قوتەیان بوو سەریان دیاربوو ئێمەش چواردەورەمان گرتن ودەنگماندان ئێوە کێن؟جوابیان دایەوەو گووتیان" ئێمە پێشمەرگەین لێ یان نزیك بووینەوەو دەرکەوت ئەوکەسانەبوون کەلەهەولێر ڕایان کردبوو بەڵێ ناوەکان ئەوانەبوون

( محمد عجم، جـە وهـەر گردەسـۆری ، حـسین زیل، محمـد زێنـدین ) هـەموویان ئەندامی کۆمەڵە بوون ئەوانیش رێکخران ، پاش چەند رۆژێـك کـورێکی تـریش هات بەناوی ( کمال هەرقل ) ئەویش لەگەڵ کـاك محمـد لەگـەڵ مەفرەزەکـەی کانۆچاوشێن داندران هەموویان بێ چەك بوون محمد عجم دەمانچەیەکی چواردە خۆری لابوو پاش ماوەیەك جەولەکردن رۆژێك کانۆچاوشێن دەچێتە ناو هەولێرو دەگەرێتەوە دیاربوو لەگەڵ حوکمەت پەیوەندی کردبوو بـە سوتفە کابرایـەك دەبینێت کەوا لـەدائیرەی ئـەمن دێتـە دەرەوە .کـابرا ئاگـاداری کـاك سـعدی دەکاتەوە کە کانبی بینیوە لەدائیرەی ئەمن ،کـاك سـعدیش ئاگـاداری هـەموو مەفرەزەکانی کردوە کە لـە نزیکـەوە چـاودێری کـانبی بکـەن بـە تایبـەتی محمدعجم کادیری کۆمەڵە کە لەگەڵ مەفرەزکـەی کـانبی بـوو لەبـەهاری ١٩٧٧ لەگوندی بەرد بڕ رۆژێك کانۆ چاوشێن جەماعەت کۆدەکاتەوەو دەڵێت مـن پەیوەندیم کردوە بە حوکمەت ئەوەی دێتەوە لەگەڵم ناهێڵم حوکمەت هیچی لێ بکات ئەوەی ناشهێت هەر برای منە کەسی بەزۆر نەبرد بوو، محمد عەجەم داوای لێ دەکات کە چەکێکیان بداتێ چونکە ئەوان بێ چەك بوون ئەویش تفـەنگێکی ( پەرەشوتیان ) دەداتێ یەکتر ماچ دەکەن محمد عەجەم ومحمد زێنـدین وکمـال هەرقل و هتد... بەرەو هێزی پێشمەرگەو کانبی وبرادەرانی بـەرەو نـاو رژێـم دەرۆن.یەکەم چالاکیش کەکردیان ماوەیەك دوای تەسـلیم بوونـەوەیان هاتنـە گوندی بانەمۆرد مام جـەباریان دەسـت گیرکردلـە نێـوان بەلـەبان وبانـەمۆرد شەهیدیان کرد.. ( مام جەبار ) خەڵکی گردەسۆر بوو هەرلەبەر کـاری رێکخـستن دەربەدەری دەشت ببوو، پێشمەرگەی شۆرشـی ئـەیلولیش بـوو.دواتـر لەگونـدی نێرەگێن کاك سعدی مەفرەزەکانی کۆکردەوەو پێ ی گووتین تازە مـن دڵنیـابووم کە کانبی خائینە لەبەرئەوەی دەستی سوور کرد بەخوێنی مام جەبار بۆیە دەبێ زۆرئاگاداری خۆتـان بن.

## چۆن کاک مەلا بەختیارم ناسی

لەساڵی ١٩٧٧ لەدەشتی هەولێر جەولەمان دەکرد کاک مەلا بەختیارو کاک سامان گەرمیانی ماوەیەکی باش لەدەشتی هەولێر مانەوە کادیری کۆمەڵەلە پێش هەمویان کاک عەلی ساڵح هاتبووە دەرەوە دوایش کاک شاخەوان و کاک رێباز لە دوای ئەوانیش محەمەد عەجەم، بەهاتنی کاک مەلا بەختیارو هاتنە دەرەوەی ئەو کادیرانە پێشمەرگە رۆژ بەرۆژ دەخزانە ناو رێکخستنەکانی کۆمەڵە،زۆربەی رۆژەکان لە مزگەوتی لادێ یەکان کۆرو کۆبونەوەمان دەکرد کاک مەلاسمیناری سیاسی بۆدەگێراین ،ئەوکاتە کۆمەڵەی مارکسی لینین بووین رۆژانە باسی لەیەکسانی دەکرد لەگوندی ئۆمەرگومبەت بەرۆژەوە چووینە ئێوان سماقەو ئیلنجاغ بۆ نان خواردنی بەیانی ،جاهەبوو ماستی هێنابوو هەبوو هێلکەی هێنابوو هەبوو نانی رەقی هێنابوو بەلام کەچامان لێنا کاک مەلابەختیار قوتوێك شیری دەرهێناو لەگەڵ پەرداخێك ودەستە کێکێکی گەورە،تۆزێك لەئێمە دوورکەوتەوە منیش لەدڵی خۆم گرت ،بۆ ئێوارەی داهاتوو وەکو شەوانی ترکۆرو سمینار دەستی پێکردەوە کاک مەلا قسەی بۆکردین ودوایش گووتی" کێ رەخنە یا قسەی هەیە؟ من دەستم بڵند کردو گووتم"کاک مەلا بەختیار تۆ هەموو شتەکانت زۆرباشەو خۆشت گەنجێکی قسە خۆشی وخەریکە لای هەمووان خۆشەویست دەبی بەلام بۆ دەبێ ئێمە نانی رەق بخۆین وجەنابیشت کێك وشیر بخۆی؟ کاک مەلا بەختیار رەخنەکەی قبوڵ کردوگووتی" من ئەم دوو سێ رۆژە نەخۆش بووم بەلام جارێکی تر ئەوە دووبارە نابێتەوە منیش سوپاسم کردو کۆرەکەش کۆتایی هات.

## دروست بوونی دوو کادیر

کاک ڕێبازو کاک شاخەوان عەباس هاتبوونە دەرێ بەلاّم ئەوان سەردانی لای کاک ئارامیان کردبوو بەکادیر گەڕابونەوە دەشتی هەولێر، هەردووکیان بەکادیری کۆمەڵە ناسرابوون ئیش وکاری ڕێکخستنیان دەکرد بەتایبەتی کاک شاخەوان جاروبار سەردانی ناو هەولێریشی دەکرد ،کەلەقەرەداغ گەڕابوونەوە بۆدەشتی هەولێر یەکەم شەو لەبەستی شەرغە کانۆچاوشێن مام جەبار ڕەمی دەکات، لەنزیک گوندی شیوە پیران کانۆوان هیچ ئاگایان لەکاک شاخەوان وکاک ڕێباز نابێت بەڕێکەوت گوللەکان هەندێکی بۆلای ئەوان دەچێت کاک ڕێبازو کاک شاخەوان وادەزانن کەمینەو بۆنەوانە ،ئیترئەوانیش لەیەکتر دادەبڕێن کاک ڕێباز ئێوارە بەکوێ داهاتبوون بەوێدا گەڕابۆوە ،کاک شاخەوان بۆلای دێدەوان ،من ئەوشەوە لەگەڵ سێ پێشمەرگەی ترلەگوندی میرکە بووین بەیانی هەڵکشاین بۆ نێوان میرکە وسماقە باخچەیەکی بچکۆڵەی لی بوو هەندێك بنەداری قەیسی لێ بوو لەبن دارەکان خەوتین وەختێك هەستامەوە تەماشام کرد یەکێك لەبەرزایی یەکەی پشت سەرمان وەستاوە کلانشینکۆفێکی بەحراوی لەشان بوو ئێمە برنەوێك و دەمانچەیەکمان لابوو بەلاّم ئەوزوو هاواری کرد خۆتان تێك مەدەن منیش پێشمەرگەم،هاتەلامان وخۆی بەئێمە ناساندو گووتی " من شاخەوانم برادەرێکی تریشم لەگەڵ دابوو بەناوی ڕێباز بەلاّم شەوتەقەیان لێ کردین و لەیەکتر دابڕاین،لەو ڕۆژەوە کاک شاخەوانم ناسی لەدوایدا بووین بەبرادەرو بەعەشیرەتی خۆمان دەرچوو ،شاخەوان داوای کرد کەوا یەکێکمان لەگەڵی بچین، هاوڕێ کاوە لەگەڵی چوو

بۆسۆراخی کاك رێباز ماوەیەك گەڕابوون نەیان دۆزیبوۆوە ،دواتر لە دەمێ یەکترمان گرتەوە،شەهید رێبازیش بەرەو رۆژهەلاتی کۆیە بۆ لای چەتۆی کەریمە سور چووبوو، پاش ماوەیەك لەگەڵ ئەویش یەکترمان گرتەوە ٠

## رووناکی ژیانی پێشمەرگە

## کورتە باسێك لەسەر ژیانی شەهیدی سەرکردە شەهید ئارام

من خۆم کاك ئارامم نەبینیبوو بەلأم کاك شاخەوان عباس وکاك رێباز کە چووبوون بۆ ناوچەی قەرەداغ بینیبوویان ،کە گەڕانەوە بۆ دەشتی هەولێر زۆر گۆڕانیان بەسەر داهاتبوو ، ئەوان زۆر باسی بلیمەتی و زیرەکی ولێ هاتوویی کاك ئارامیان بۆ ئێمە دەکرد ،دەڵێم بەداخەوە کەوا من لەگەڵ برادەران بە دیداری کاك ئارام رانەگەیشتم ، ئێمە هەر لەدوورەوە کاك ئارامان خۆش دەویست بەقەد ناوی پێشمەرگە

کاك ئارام خۆی ناوی شاسوار جلال بوو خەڵکی شاری سلێمانی بوو ، دەرچووی کۆلێژی بازرگانی بوو، بە کۆی دەنگی ئەندامانی کۆمەڵە بەسکرتێری کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان هەڵبژێردرابوو ،بڕیار وابوو کاك ئارام جەولەیەکی دەشتی هەولێر بکات بەلأم زۆر بەداخەوە پێ نەپرژا ئەم سەفەرە بکات بۆ لای ئێمە لەدەشتی هەولێر ،لە رۆژی ۱۹۷۸/۱/۳۱ لە گوندی تەنگی سەری ناوچەی قەرەداغ بەدەستی گەلە جاشێکی خۆ فرۆش شەهید کرا ، هەزاران سلاو لەگیانی پاکی کاکە ئارامی سەرکردە.

## کانۆ چاوشین دەستی کرد بەڕاوە پێشمەرگە

لەهاوینی ساڵی ١٩٧٧ خەڵکی لادێ لەسەربان دەخەوتن ،ماڵی کاك قادر مستەفا وماڵی ئێمە لە گوندی سماقە بوو.بەم هۆیەوە ئێمەزیاتر دەچووینە گوندی سماقە.ئێوارەیەك دابەش بووین بە ماڵەکان کاك قادر مستەفا لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك چووبۆوە ماڵەکەی خۆی ئەحمەد سماقەش ماڵی لەوێ بوو ئەویش چووبۆوە ماڵی خۆی من وجەوهەری برام چووبووینە ماڵی خۆمان و ڕەنجاوی برام لەگەڵ هاوڕێ کاوە چووبوونە ماڵی مام ئەحمەد کە ماڵەکەیان لەسەربەرزایی یەك بوو لەلا پەرگی گوند،چەند پێشمەرگەیەکیش لە ناو دێ بوون جاشەکان ئێوارە دوور بەدوور چاودێری ئێمەیان کردبوو ، هاوڕێ کاوە لەگەڵ ڕەنجاولە سەربانی ماڵی مام ئەحمەد دادەنیشن بۆنانی ئێوارە ئێمەش هەموومان لەناودێ بووین جاشەکان دێنە پێش وتەقەیان لێ دەکەن ماڵ ومنداڵی مام ئەحمەد دوو کوڕی بە ناوەکانی ( عومەروعەلی ) وژنێکیان بریندار دەبن زۆر بەسەختی،ڕەنجاو وهاوڕێ کاوە لێ یان دێنە دەست و ورووبەڕووی جاشەکان دەبنەوە بەشەڕێکی (١٠) دەقیقەیی لێ یان دەدەن ئێمەش کۆبووینەوەو بەڕاکردن سەرکەوتین بۆلای شەڕەکە کەگەیشتین ،جاشەکان لەناو میگەلەمەڕی مام ئەحمەدەوە تەقەیان کرد بوو بۆیە پێشمەرگەکان ناچار ببوون تەقەیان لە جاش و میگەلەکە کردبوو جاشێك کوژرابوو بەناوی( کانبی ) دوو ( بەرانی ) ناوحەیوانەکەش کوژرابوون کەخاوەنی مەڕەکە بەڕێز مام ئەحمەد زۆرخۆشی دەویستن هەر بەوشەوە برینداڕەکانیان گواستنەوە بۆشاری کۆیە ،کانبی چاوشین ودەستەکەی بەڕاکردن ڕایان کردبوو.هەر ئەوشەوە کاك قادرماڵ ومنداڵی خۆی ڕاگواست بۆگوندی ئاوماڵ

کەچەندکیلۆمەترێك لەسماقەوە دوورە،بۆیەیانی کۆپتەرهات وجەیشیش بە پیادە ،بەهاواری جاشەکانەوە زۆر گەڕابوون بە دوای ماڵی پێشمەرگە بەلام خۆشبەختانە ماڵ ومنداڵی ئێمەیان نەناسی بوو کەدایکم وبراژنم وخوشکم بوون .زۆر ئەزیەتی مەلای گوندوخەلکەکەیان دابوو بۆئەوەی ماڵی پێشمەرگەیان پێ بلێن.بەلام شایانی ووتنە ئەم گوندە زۆر زۆر یارمەتیدەری پێشمەرگەو ناندەر بووینە وە ئەو رۆژەش جلی ژن ومنداڵەکانی خۆیان لەبەر ژن ومنداڵی پێشمەرگە کردبوو بۆئەوەی نەناسرێن.وەلەهەمووشیان زیاتر ماڵی مام ئەحمەد کەبەزەرەری گیانی ومادی بەرگریان لە پێشمەرگە کرد. ئێستاش هاتووچۆیان دەکەم وەك وەفایەك بۆجوامێریان لەو رۆژە رەشانەدا.هاورێ کاوە مەموری لەم شەرە رەشاشیکی پێ بوو لەکاتی تەقەکردن وەستابوو رومانەیەکی پێ بوو ئەلقەکەی دەرهێنابوو بەلام رومانەکەی رانەوەشاندبوو کەمن گەیشتمەلای رومانەکەی لە ناو دەست بوو بەلام دەستی شل ببوو لێم پرسی ئەوە چیە ؟ گووتی" ئەلقەی رومانەکەم دەرهێناوە فرێمداوە گووتیشی رەشاشەکەم راوەستاوە بەلام جاشەکان شکان منیش دلم نەهات رومانەکە فرێ بدەمە ناو مەرەکان بۆیە لەناو دەستم هێشتۆتەوە .منیش گەرام ئەلقەکەم دۆزیەوەو بە ئەسپایی تێم خستەوە.

## کاك سعدی گچکە پیاوی ئازای خۆش دەویست ۱۹۷۷

ماوەیەك بوو مەفرەزەکەی جەوهەری برام لەگەشەکردندابوو ،دووچەکی زیادمان هەبوو کاك قادر مستەفا دەیویست ئەوچەکانە لەکاکم وەرگرێ وبیدات بەمەفرەزەی تر کاکیشم رازی نەبوو،رۆژێك کاك سعدی هاتەگوندی ئۆمەرگومبەت ،بەرۆژەوە چووینە نێوان سماقەوئۆمەرگومبەت چونکە ئەوێ شوێنیکی عاسێ بوو جەیش نەیدەتوانی بێتە ئەوێ ،کاك قادر بەکاك سعدی

گووتبوو بۆ مەسەلەی چەکەکان ،بەلام کاکم هەر ڕازی نەبوو ،کاك سعدی ئامر هەرێم بوو،بە کاکمی گووت من پێشمەرگەی وەك تۆم ناوێ چەکەکەت دانێ و برۆ بۆکوێ دەچی خوات لەگەڵ،منیش لێ یان نزیك بووم ،لەگەڵ کاکم تاخمەکەم کردەوەوچەکەکەم دانا ،بەلام کاك سعدی گووتی" کوردە من لەگەڵ تۆم نیە چەکەکەت هەلگرەوە ،بەلام من قبولم نەکرد،ڕەنجاوی برام لەلوتکە شاخێك بەرامبەر بەئێمە حەرەس بوو ،کاك سعدی دوو پێشمەرگەی نارد کە ئەویش چەك بکەن،بەلام ڕەنجاوی برام چەکەکەی سوارکردو گووتی" من بە ئێوە چەك ناکرێم باسعدی خۆی بێت،ئێمە هەمووومان گوێمان لە قسەکان بوو، پێشمەرگەکان گەڕانەوەو کاك سعدیش گووتی" لێ ی گەڕێن،حسێن دۆشکەو عەزیزکەلەکی و جەوهەرگردەسۆری و محمد عەجەم دەستیان لەملی ئێمە کردو بەزۆر چەکەکانیان داینەوە،دەستیان لەملی کردین وچاك بووینەوە،کاك سعدیش پەشیمان بۆوە لەوبڕیارە بە پەلەی کەدای ،چونکە ئێمە گەر بڕۆیشتباینایە خەلکمان زۆر لەگەڵ بوو ،بۆیە دەلێم کاك سعدی پیاوی ئازای خۆش دەوێ،چونکە دواتر ڕەنجاوی ماچ کردو زۆریش پشتی پێ دەبەستا.

## شەڕی حەسەن مترب لە پایزی ١٩٧٧

لەبەرئەوەی ماوەیەك پێشتر کانۆچاوشین بەچەند کەسێکەوە تەسلیمی ڕژێم ببۆوە کاك سەعدی گچکە هێزەکانی کۆ کردبۆوە بەیەکەوە دەگەڕاین وجەولەمان دەکرد، سەید کاکەش لەخۆشناوەتی یەوەهاتبوو ،لەدەم بەستی شرغەو ئەو ناوچانە بووین بەرەو دێدەوان بۆمەنتکایەتی بەرێ کەوتین گەیشتینە گوندی جل بەسەر کەگوندێکی سەیدانە لەوێ دیاربوو دەنگوباسی جاشەکان هەبوو گوایە لە پشتی بانەمۆرد لەڕەشماڵەکانی خدرقازین ( مالی خدرقازی تاکە ماڵ بوون کەبەبەردەوامی لەخزمەتی پێشمەرگە دابوون

پیاویان کەم لەماڵ دەبوون کچێکیان هەبوو بەناوی مێرەم هەرجارەکی ئێمەدەچووین فەرمووی لێ دەکردین وسۆپایەکی قشپلی بۆپێ دەکردین چاپەستە رەشەکەی دەخستە سەرو دەیگووت پیاومان بۆچیە هەردەم خۆی لەریزی پیاوحساب دەکرد،کەبەراستیش وابوو ) کاك سعدی چەند مەفرەزەیەکی نارد بۆتاقیب کردنیان لەوێ دەنگو باسیان وەرگرتبوو کەوا کانۆچاوشێن لەلای گوندی دوو شیوان وحسن متربن ،ئێمە شەوی ٢٠\٢١-١٢-١٩٧٧ بەرێ کەوتین بۆ پشتی گوندی حسن مترب، لەبیرمە من رەشاش برێنێکم پێ بوو قورسایی یەکەی شانزە تاحەڤدە کیلۆ دەبوو جارویار لەرێگا کاك سعدی دەیگووت یارمەتی کوردە بدەن با نەکەوێ،لە پشت دێ ی حسن مترب تووشی پیاوێکی بەتەمەن بووین لێمان پرسی جاشەکانی کانۆ لەدووشیوانن یان لە حسن مترب ؟ ئەویش گووتی" والەئێوارەوە لەدێی حسن متربن.کاك سعدیش بانگی حسێن دۆشکەی ( پێشمەرگەیەکی ئازاو چاونەترس بوو لەشۆرشی ئەیلولیش لەسەر دۆشکە بوو ) کرد گووتی" خۆت بگەیەنە ناو دێ بزانە لەکوێ ولەماڵی کێن،حسێن رۆیشت ودوای کەمێك هاتەوە گووتی" هێندێکیان لەمزگەوتن ئەوانیتر لەماڵێکن.ناوی ماڵەکەو شوێنەکەی دەزانی لەبەرئەوەی حسێن خۆی خەڵکی ئەوێ بوو.کاك سعدی مەفرەزەیەکی خۆی و مەفرەزەیەکی حسێن دۆشکەی دانا بچنە ناودێ بۆ دووشوێن یەکیان بۆسەرمزگەوت ئەوی تر بۆ سەر ئەو ماڵەی جاشەکانی لێ بوو.مەفرەزەکەی جەوهەری براشم داندرا بۆئەوبەری گوند لای رۆژئاوا کە پێك هاتبوو لەم پێشمەرگانە (ئەحمەدکوردە ، محمد رەسوڵ ،رەنجاو،میرزا حمدامین* ئازاد خۆشناو و شاخەوان عباسیش لەگەڵ ئێمە داندران* ) شەهید رێبازوسامی قادرو شێرزاد خۆشناو کەوتنە سەرووی ئێمە.سەیدکاکەو مەفرەزەکەی لەگەڵ کاك قادرمستەفا وعزیزکەلەکی لەولاتری ئەوان.بەگشتی دەوری گوندەکەمان تۆق کرد بە مەفرەزەکانی هێزی پێشمەرگە.کاتژمێر ٤٥-١٠

دەقیقەی شەو لەهەموو لایەکەوە بوو بەتەقە جاشەکان ڕایان کرد بەلای ئێمەدا .ئێمەش تەقەمان لێ کردن وگەڕانەوە بۆناودێ بەلام زۆر بەداخەوە پێشمەرگەی قارەمان محمد ڕەسولْ سێ گرتکانی شەهیدبوو شەڕەوری نیو کاتژمێری خایاند لەم شەڕەدا( ٤ )جاش کوژران بەناوەکانی( عەلی گاور، حەیدەرحسێن عارەب، عەلی سمایل، محمد سالەیی ) ،گوێ درێژێکمان لەگوند هێنا شەهیدەکەمان ( محمد ڕەسولْ سێ گرتکانی ) لەگەلْ ڕەشاشەکەی من لێ بارکردو بەرەو دێدەوان وبەستی شەرغە بەرێ کەوتین، بۆبەیانی یەکەی گەیشتینە گوندی میرکە. لەگوندی میرکە لە پشتی دێ جەنازەکەمان دانا تاوەکو نانێکمان خوارد ئیسراحەتێکمان کرد دواتر بەرێ کەوتین بۆئێوان گوندی سماقەوئۆمەرگومبەت کەشوێنێکی زۆرعاسێ یە ( سەختە ) ماینەوە تاکو ئێوارە کاتێ تاریک داهات.لەبەرئەوەی من تاکە پێشمەرگەبووم کەزۆرلەم ناوچەیە گەڕابووم زۆری هەرە زۆری شوانەکانی ئەم ناوچەیەم دەناسی، یەکێك لەوانە ( خدرحاجی قادر ) ی خەلکی ئۆمەرگومبەت بوو، دەمەو ئێوارە خۆم گەیاندە خدر و لەگەلْ مەڕەکەی بەرەو ئۆمەرگومبەت ڕۆیشتینەوە، محەمەدی حاجی قادرو عومەرحاجی عبداللەم ئاگادار کردەوە لەناو ئۆمەر گومبەت کەئێمە شەهیدێکمان هەیە، چونکە ئەوانیش لەناودێ دەترسان حوکمەت بزانێ هاوکاری ئێمەیان کردوە بۆیەزۆر بەنهێنی ئەوان هاتن لەگەلم پاچ وخاکەناسیان هێنا بۆسەرگۆڕستانی ئۆمەرگومبەت لەبەرزایی یەکانی پشتی دێ هەربەم شەوە گۆڕمان بۆهەلْ کەندو بەجل وبەرگی خۆی شەهیدە کەمان تەسلیم بەخاك کرد ئینجا چووین بۆناو دێ بۆحەسانەوە ،کەسوکاری شەهید محەمەد ئەیان زانیبوو محەمەدشەهیدبووە دوای چەند ڕۆژێك خەبەرمان بۆناردن .وەشتێك تامردن لەیادی ناکەم ئەوەبوو شاهین ڕادیۆیەکی بچوکی پێ بوولەنزیك جەنازەی شەهید محمدی دانابوو گۆرانی حەسەن زیرەکی دەگووت

( ئەی وەی بارانە ئەسمەران چاویان جوانە ) ، منیش لێ ی چوومە پێش پێم گووت کاک شاهین ئەو شەهیدە برادەری خۆمانە چۆن دەبێ ئەو ڕەفتارە بکەی ئەویش پێ کەنی گووتی" کوردەگیان ئەم شەو کاک محەمەدەوشەوێکی تر من وتۆین"

## چالاکیەك لەهەموو رادیۆ وکەناڵە جیهانیەکان باسکرا

بۆناساندنی پێشمەرگە، بۆدەنگدانەوەی هەڵگیرسانەوەی شۆڕش زۆرشت هەبوو دەمان کرد لەساڵی ۱۹۷۷ ،مەفرەزەیەکمان چووبوونە ناوچەی کەندێناوە لەسەر ڕێگای مەخمور هەولێر، ئێوارەیەك سەیتەرەیەك دادەنێن لەنزیك زورگەزراو، سێ کەسی ئەجنەبی( بیانی ) دەستگیر دەکەن، یەکێکیان ئافرەتێك دەبێ ، پێشمەرگەکان ئینگلیزی نازانن بنوسن نامەیەکی بە عەرەبی بۆدەنوسن کەوا ئەوان لەلایەن هێزی پێشمەرگەی ( یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ) گیراون،کچەکە بەردەدەن وهەردوو پیاوەکەش دەهێنن بەرەو ناوچەی بەستی شەرغە ،لەنێرەگێن یەکترمان گرتەوە ئەجنەبیەکان خەڵکی وولاتی ئەڵمانیا بوون، لەگوندی نێرەگێن تەسلیم بەمن ومیرزاو مستەفا گۆران وکاوە مەخموری کران، ئێمە دووا نمان بەچەك ودووشمان بێ چەك بووین ،لە نێرەگێن لە کاك قادروبرادەران دابڕاین، هاتینە گوندی بایزاغا شەو لە وێ بووین ،بەیانی کات ژمێر ( ٥ ) دەرچووین بۆهەرەتەکانی پشتی گوند، ئەشکەوتێکی لێ یە پێی دەڵێن ( سەرگەڕان ) لەناو ئەشکەوتەکە کانیاوێکی لێ یە بۆهاوینان شوێنێکی زۆرخۆشە ،حەرەسیا تمان دانابوو وەك عادەتی خۆمان هەردوو ئەجنەبیەکەشمان لابوو، یەك لە حەرەسەکانمان خەوت بۆوە لە کاتی حەرەسیات ،کاتێك بەخەبەر هاتم تەمەشام کرد ئەجنەبیەك نەمابوو ئینجا بانگی برادەرانم کرد گووتم"یەك لەوانە ڕای کردووە چۆن دەبێت لەحەرەسیات

بخەونەوە؟! ئەوانم بەجێ هێشت وخۆم ڕامکرد بەرەو گوندی بایزاغا بەدوای ئەجنەبیە ڕاکردوەکەدا، لەپشت گوندی توشی شوانێك بووم پرسیارم لێ کرد گووتی"""کات ژمێرێك دەبێت بێرەدا ڕۆیشتوە منیش گەڕامەوە لەترسی ئەوەی نەوەك کۆپتەربێت وبیدۆزێتەوە،چونکە ئەجنەبیەکان خەبیری ئەوت بوون ،هەر لەورۆژە شوێنەکەی خۆمان بەجێ هێشت وبەکەندو دۆڵدا کەوتینەڕێ تاگەیشتینە نزیك ڕێگای هەولێر کۆیە،شەو چووینە ماڵی حاجی کاکۆل لەپشت جادە عائیلەکی گەورەبوون مەڕداربـــــــــوون ،بۆبەیانی دەوروبەری کات ژمێـر( ٨ ) گەلـە کۆپتـەرێك لەهـەولێرەوە هـاتن بـەئاسمانی گوندەکانـدا دەسوڕانەوە ، دوایی خەبەرمان وەرگرت شوانێکی گوندی بەردبەرچاوی لێ ببـوو کـە کـابرای ئەجنـەبی لـەناو دەغڵێـك هـاتبووە دەرەوەو چـاکەتێکی شـینی لەبەردابوو چاکەتەکەی لەبەرکردبـــــــــوەو بۆکۆپتەرەکـــــــانی ڕاوەشاندبوو کۆپتەرەکانیش یەکیان دەنیشێتەوەو هەڵی دەگرێت ،ئەو ڕۆژە تـا درەنگانێك لەئاسمانی ناوچەکە مانەوە، کاك قادرو بـرادەران دەچـنە بـەینی نێـرەگێن وقەمبـەر ڕادیـۆی ئێـف ئـێم دەکەنـەوە قـسەکانی کۆپتـەرەکانیان وەرگرتبوو کەوا ئەورۆژە بەو واجبە دەرچووینە،ئینجا برادەران تێدەگەن کـەوا یەك لەو ئەجنەبیانە ڕای کردووە وکۆپتەر دۆزیویەتیەوە ،ئێمەش بەرێ کەوتین ونـەوەی تـرمـان گەیانـدە ناوچـەی خۆشـناوەتی لای کـاك سـعدی، بردیـان بۆسەرکردایەتی لەرێگای ئێرانـەوە تەسـلیم بەدەوڵەتەکـەی خـۆی کرایـەوە، ڕفاندنی ئەوانە بەس بۆئەوە بوو کەوا خەڵکی دەرەوە بزانن پێشمەرگەو شـۆڕش هەیە لەکوردستانی عێراق،چونکە بەعس وای لەخـەڵك گەیانـدبوو کـەواهیچ جۆرە چەکدارێك یان شۆڕشێك نیـە بـەلام ئـەوە بووبەدەنگدانەوەیـەکی بـاش بۆپێشمەرگەی یەکێتی زۆربەی ئیزاعەوکەناڵە عالەمیەکان باسیان کـرد ئـەوە زۆر گەورەبوو لەشۆڕشی نوێ لەساڵی ١٩٧٧

## پەڕینەوەمان بۆ رۆژهەڵاتی کۆیە

بڕیارماندا کەجەولەیەك بکەین بۆ ڕۆژهەلاتی کۆیە ماوەیەك دەشتی هەولێر بەجێ بهێڵین بۆئەوەی خۆمان لەهێزی بەعس وجاشەکانی بپارێزین .چونکە چەند شەڕو پێکدادانێکمان لەگەڵ کردبوون ئەوانیش بەهەموو توانایانەوە لەدوای زانیاری کۆکردنەوەو گەڕانی ئێمەبوون بۆئەوەی گورزێکی باش لە هێزی پێشمەرگەی کوردستان بدەن لەتۆڵەی ئەو زەرەروخەسارەتانەی لەشەڕەکان لەگەڵ ئێمەدەیان دەدا بەلاّم خۆش بەختانە هەرگیز ئەو خەونەیان نەهاتەدی.

## *دوو هەوڵی خۆفرۆشان بۆلەناو بردنی هەڤاڵ مەلا بەختیار ۱۹۷۷*

کاك مەلابەختیار بۆجەولە کردن لەدەشتی هەولێر بوو پێشمەرگەیەکی لەگەڵ دابوو بەناوی (شاهۆ)، محمدجەلیل و سەلاّح وحەوێز تازە ببوون بە پێشمەرگە لای کاك مەلابەختیار وە چەند پێشمەرگەیەکی چالاك و قارەمانی ئێمەیان لەگەڵ درابوو بۆ چاوساغی وشارەزایی بەوناوانە( نامیقی تاڵەبانی گەورە کادیری کۆمەڵە، ئەحمەد سماقە ، ئەحمەد قەمبەری ،کاوە مخموری ).هەر ئەو مەفرەزەیە لەگەڵ چەند کەسێکی تر گەڕابوونەوە بۆدەشتی کۆیە تا بگەڕێنەوە بۆ قەرەداغ ، لەگوندی کانی سوور توشی مەفرەزەیەکی قیادە مۆقەتە دەبن ودەبێت بەشەڕیان لە برادەرانی خۆمان بەداخەوە نامیق تاڵەبانی شەهید دەبێ ، ئەحمەدسماقەش بەسەختی بریندارببوو ،لەقیادە مۆقەتەش مجید هەییە و محمد وسێ چەکداری تر دەکوژرێن، برادەرانی خۆمان

دەگەڕێنەوە بەرەو رۆژئاوای کۆیە،من لە گەروی فاقێ توشیان بووم کەدەکاتە نزیك گوندی سماقە ،ئەحمەدسماقەیان پێ بوو بەبریندارى دەیان هێنایەوە بۆسماقە

پاش چوار پێنج رۆژ دەگەڕێنەوە بۆدەشتی کۆیە، لە شەوی ١٩/٢٠-١٢-١٩٧٧ بۆ جەولەکردن لەگوندی کونەگورگ کەسەر بەناحیەی تەق تەقە ،لە مالی حاجی سلێمان دەخەون بەلاَم دیارە محمد جەلیل بەدەستی حوکمەت بووە بە پێشمەرگە، یان دواتر پەیوەندی کردبوو بەرژێم بۆیە لەکاتی حەرەسیاتی خۆی لەگەلْ ئامۆزاکانی یەکێکیان لەلولەی سۆپای دار لەسەربانەوە نارنجۆکێك شۆڕ دەکاتەوە بۆناوپێشمەرگەکان یەکێکی تر لەکونی دەرگاوە دەست رێژ دەکات بەناو پێشمەرگە خەو تووەکاندا ،دواتر ڕادەکەن ولەئەنجامدا دەبێتە هۆی شەهیدبوونی (شاهۆ) ومبریندار بوونی (هاورێ کاوە) مانگێك پاش ئەم رووداوە محمدجەلیل خۆی دەگەیەنێتە ئیستخباراتی کەرکوك وهەر لەوێوە سوارى کۆپتەر دەبێ بەرەو گوندی داربەسەری بچوك لەوێ بە کۆپتەر دەنیشێتەوە لەدێ و چوار دەوری دێ یەکە دەگرن،وە دەچێتە مالی (فاروقی عەلی مەولود) کە بنەمالەیەکی ناوداری شوعی بوون ،عەلی مەولود لەشۆڕشی ئەیلول شەهید کرابوو ، فاروقی کوڕی هەرلەمالەوە دەگرن و محمد جەلیل شارەزابوو چەند جارێك لەگەلْ کاك مەلا بەختیار جەولەی کردبوو، هەستی پێ کردبوو کاك فاروق کادیرێکی مەحەلی کۆمەلەیە ،برنەوێکی پەرەشوت لەئەنجامی تەفتیشی مالەکەیان لەناکاو دەدۆزنەوە بەلاَم فاروق نکۆلی لێ دەکات ودەلێ محمدجەلیل هی خۆیەتی وهی ئێمە نیەو ئێمە ئاگامان لێ نیە ،فاروق دەبەن ماوەی چەند سالێك حوکم دەبێ ودواتر بەرلێبوردنی گشتی کەوت وبەربوو،هەر لەدوای بەربوونی یەکسەر بوو بە پێشمەرگەو کادیری کۆمەلە.

## کۆتان ولالە حەکیم

محمدجەلیل هەرلەوسەردەمە کەسواری کۆپتەردەبوو دەچێتە کۆتانەکانی نۆمەرگومبەت ،کەماڵی لالەحەکیم ودوو ماڵی تری لێ بوو ئەوانیش هەرخزمی خۆی بوون، بەکۆپتەر لەکۆتان دەنیشنەوە وبەحسابی ئەو دەبوایە مەلابەختیارو هاوڕێ کاوەی بریندار لە وێ بن بۆچوونەکەشی ڕاست دەبێت ،هاوڕێ بەختیاروجەماعەت یاتاخ لەماڵی لالەحەکیم دەبەن دەچنە ئەشکەوتێك کە محمدجەلیل پێ ی نازانێت بەلام ئەوان کۆپتەرەکانیان لێ دیار دەبێت کەدەنیشنەوە مەلابەختیار بەیەکێك لە پێشمەرگەکان دەڵێت ئەگەرجەیشەکە بەرەوە لای ئێمە هاتن تۆ هاوڕێ کاوە بکوژە،هاوڕێ کاوەش نامیلکەکانی شەڕی پارتی زانی زۆرخوێندبۆوە بۆیەداوای چەکی کردبوو گووتبووی کاك بەختیارمنیش شەڕ دەکەم ئاخر فیشەکیش خۆم دەکوژم ،بەلام خۆش بەختانە ئەوان کەشف نابن کۆپتەرەکان زۆرئازاری لالەحەکیم دەدەن وشوێنی پێشمەرگەکانیان پێ ناڵێت سواری کۆپتەری دەکەن وزۆر هەڕەشەی لێ دەکەن پاش ماوەیەك ئازادی دەکەن من لە پێش هەموو پێشمەرگەکانی ناوچەکە لالەحەکیمم دەناسی، کەبەربوو چوومەلای وپێی گێڕامەوە گووتی" لەشوێنی سێبەر(نسێ) خۆتان بشارنەوە چونکە من لەئاسمان زۆرم تەماشاکرد خەڵك نابیندرێ منیش ڕێنمایەکەم وەرگرت و هەمووجارکەکۆپتەردەهات بە پێشمەرگەکانم دەگووت برۆنە شوێنی سێبەر زۆرسوپاس بۆدڵسۆزی لالەحەکیم بۆگەل ونیشتیمان

## لە دەشتی هەولێر بۆ گوندی کونەفلوسە

کاتێک ئێمە گەڕاینەوە بۆ دەشتی هەولێر لە گوندی ئێرەگێن کاك قادرمستەفا بانگی کردم گووتی" سەفەرێك هەیە ئەبێ بەتەنهابیکەی( ٣٥٠٠ ) سێ هەزارو پێنج سەد دیناری پێدام لەگەڵ هەندێك نامەی پێچراووگووتی" تۆ پێشمەرگەیەکی خاوەن ئەزموونی بۆیە من تۆم هەڵبژارد چونکە سیقەم پێتە ،لەبەر ئەوەی سەیدکاکە وسەعدی گچکە لەوهەفتەی دادێ شەودێنەگوندی کونەفلوسە تۆش لەم چەند رۆژە دەبێ بگەیتە کونەفلوسەوئەو پارەونامانە بگەینی بەدەستی ئەوان ،منیش خۆم ئامادەکردویەڕێ کەوتم بەرەودۆڵی سماقوڵی لەگوندی سماقوڵی گەلی توشی پێشمەرگەوفەرماندەی قارەمان کاك سەیدکەریم بووم کۆمەڵێك پێشمەرگەی لەگەڵ بوو لەوانە ( مامۆستا کاوە، ئازاد خۆشناو، شێرزاد خۆشناو ) بەداخەوە ناوی هەموانم لەیاد نەماوە چونکە هەموویانم نەدەناسی منیش بەتەنها بووم زۆر خۆشحاڵ بووم کەتوشی ئەوان بووم سەیدکەریمیش گووتی کوردەگیان لەگەڵ ئێمە بە تادەگەینە ئازەنین،شەو چووینە گوندی جەلی ،بۆیەیانی لەخەو هەڵساین ودوبارە دابەش بووینە سەرماڵەکان بۆنان خواردنی بەیانی من لەگەڵ کاك سەیدکەریم ومامۆستا کاوەو شێرزاد خۆشناو چووینە ماڵی مام فەتاح،( مام فەتاح پیاوێکی ڕووخۆش ومەجلیس خۆش بوو .بەلام بەفەتاحە شێت ناسرابوو ) بەتەواوی لەنان خواردن نەبووینەوە گوێمان لەگرەی کۆپتەر بوو .کاك سەید کەریم لە پێش ئێمە دەرپەڕی بۆ دەرەوە لەبەرئەوەی کاك سەید کەریم هەرگیز خۆی نەدەکردەوەو بەردەوام لەئامادە باشی دابوو پێشتریش ئەفسەری جەیش بوو .بەرزایی یەك لە پشت ماڵی مام فتاح بوو هەر چوارمان بەراکردن ڕامان کردە سەر بەرزایی

یەکە ،کۆپتەرەکان جەولەیان لەسەر دێ یەکە دەکرد، یەك لەکۆپتەرەکان ویستی نزم بێتەوەو جوندی فڕێ بدات بۆ سەر بەرزاییی یەك لەنزیك ئێمە بەلأم ملازم سەید کەریم زۆرشێرانە لەکۆپتەرەکە هاتە دەست و دەست ڕێژی لێ کردو کۆپتەرەکەی پێکا، ئێمەش تەقەمان لێ کرد.بەلأم بەڕاستی ئەگەر ملازم سەیدکەریمان لەگەڵ نەبا لەوباوەڕەدابووم جەیش دابەزێ وزۆربەی پێشمەرگەکانیش لەناو دەچوون ئێمە خەبەرمان نەبوو کەلەهێزۆپەوە حوکمەت بەرەوسکتان پێش ڕەوی کردووە بۆیە کۆپتەرەکان گەڕانەوە سکتان ولەوێ نیشتنەوە، ئینجا ئێمەوپێشمەرگەکانی ناودێ کۆبووینەوە بەرەو شاخی پشتی دێ کەوتینە رێ بۆ خۆ حەشاردان، بۆجاری دووەم کۆپتەرەکان گەڕانەوە بۆسەرشاخی ئاوەگرد لەوێ جوندی یان دانا کەدەکاتە پشت ئێمە بەزیرەکی وچالاکی ولێ هاتویی و تەجروبەی ئەفسەریەتی ئەو لە جەیش ( سەید کەریم دەرچووی کۆلیژی سەربازی بوو ) ئەو ڕۆژە ئێمە لەقەدی شاخ خۆمان حەشارداو جەیشیش هەر لەسەر شاخ بوون تائێوارە کۆپتەرەکان هاتنەوە جەیشەکەیان هەڵ گرتەوە ،ئێمەش گەڕاینەوە بۆناو گوندی نازەنین .ئەو ڕۆژە توشی شەڕ نەبووین .شەوی دووەم لەگوندی نازەنین بووین بۆبەیانی یەکەی من بۆکارەکەی خۆم بەڕێ کەوتم بۆ گوندی کونەفلوسە لە ملازم سەید کەریم و برادەران دابڕام نزیکەی سعاتێك بە پیادە ڕۆیشتم تا گەیشتمە گوندی کونە فلوسە .لەوێ چوومە ماڵی مام ئەحمەد کەکاك قادر مستەفا ئەوناوەی پێ گووتبووم کەبچم بۆ ماڵیان لەوێ چاوەڕێ ی کاك سعدی گچکە بکەم .بۆئێوارە کاك سعدی وبرادەران هاتنە گوندی کونەفلوسە کاك سعدی هاتە ماڵی مام ئەحمەد چونکە ماڵی مام ئەحمەد خانەخوێی ئەوبوون هەرلەسەر قادرمەکانەوەبانگی کرد"مام ئەحمەد هیچ میوانم هەیە؟"مام ئەحمەدیش پێکەنی وگووتی" بەڵێ منیش لەژوورەوە دانیشتبووم کاك سعدی

هاتە ژوورەکەو چاوی بەمن کەوت زۆر خۆشحاڵ بوو دەستی لـەملم کـردو ماچـی کردم منیش نامەکەو پارەکەم دایێ وگووتی" کوردەگیان زۆر بەخێربێی بەڕاستی پارەی پاکەتێ جگەرەمان پێ نەماوە هەرلەوپارەیەی کەبۆم بردبوو دەدینـاری وەك دیاری پێ بەخشیم .بۆبەیانی سعات ٥ ئێمە لەگەڵ کاك سعدی وبـرادەران بەسەرکەوتین بۆسەرشاخی هـەورێ کەدەکاتـە پشتی چـیوەی خـواروو بـەلام هەندێك پێشمەرگە بەناوەکانی ( عیسامەدین کورەچی و شێخەوسلێمان بـۆڵی ) بەجێ مابوون سعات ٩ی بەیانی حوکمەت بەکۆپتەر جوندی دابەزاند لەگونـدی کونەفلوسە ، خەڵکی دێ بە پێشمەرگەکان دەڵێن بڕۆنە دەرێ ئەوانیش بەناچاری لەبەرچاوی سەربازەکانی رژێم دێنە ناورەزێك لـەدەرەوەی گونـد لـەبن چـەند دارمێوێك خۆیان حەشاردەدەن بەلام سەربازەکان دەچن بۆسەریان وچواردەوریان دەگرن وبەدیلی دەیانبەن دواتر لەقەسابخانەکانی رژێم لـە موسڵ لەسێدارە دران هەزاران سلاو بۆگیانی پاکی ئەوسێ شەهیدمو سەرجەم شـەهیدانی رێگـای رزگاری کوردوکوردستان

## دۆڵی گوستێ ( دۆلە فشە ) ساڵی ( ١٩٧٧ )

دوای گەڕانەوەی بەڕێز مام جەلال زۆربەی ئەندامانی سـەرکردایەتی کۆمەڵـەو بزوتنەوەی سوسیالست چوونە لای بەڕێز مام جەلال لە دۆڵی گوستێ ( کەبەڕێز مام جەلال بارەگایەکی کاتی لێ دانا بوو ) دۆڵی گوستێ دەکەوێتە سەر سـنوری ( عێراق _ ئێران _تورکیا ) زیاتر بەلای تورکیا دایە کاك سەعدی گـچکەش ئەندامی سەرکردایەتی بزوتنەوە بوو سەرپەرشتی هێزەکانی دەشتی هـەولێری دەکرد چوو بۆلای بەڕێز مام جەلال ( مامۆستا فارۆق ) کاك فارۆق صدیقیشی لە گەڵ خۆی بردبوو کە کادیری کۆمەڵـە بـوو لـەوێ ، بـەڕێز مـام جـەلال پێـی گووتبوون لەو ماوەیە چەکمان بۆ دێت ، کاك سەعدیش کاك فـارۆقی ڕەوانـەی

خواری کردبــۆوە بــۆ لای ئێمــە لــە دەشــتی هەولێـــــــر چــونکە ئێمــە پێشمەرگەی بێ چەکمان زۆر بوو بۆ ئەوەی بچین بۆ دۆڵی گوستێ کــە چــەکەکان گەیشتن پرچەك بکرێن ،لە هاوینی ساڵی (١٩٧٧) لــە دەشــتی هــەولێر ئێمــە کۆبوونەوەیەکمان کرد بۆ رێکخستنی ئەو کەسانەی کــە دەیــان بــەین، لەگــەڵ مامۆستا فاروق بەرێ کــەوتین بــۆ دۆڵــی خۆشــناوەتی و گونــدی مەلەکان،ئــەو پێشمەرگانەی چووین (مامۆستا فاروق ، جەوهــەری بــرام ، رەنجــاوی بــرام ، ئەحمەد کوردە ، زرار مەندێری ، جەوهەر گردەسـۆری ، مـشیر هیرانــی ، مـیرزا حەمەدەمین ، علی ئاوماڵی ، مستەفا گۆران ) هتد...............

رێگایەکی دوورو درێــژو ناخۆشمــان بــڕی تــا گەیــشتینە گونــدی مەلــەکان لەوێشەوە بەرەو چیای ئاراسن (ئاراسن بەرانبەرە بە چــیای هندرێن،ناوچــەی رەواندزیشی لێ دیارە) چەند پێـشمەرگەیەك لــە چــیای ئاراســن بارەگایــەکی بچکۆلەیان لە قەدی شاخ دانا بوو بەرپرســەکەیان نــاوی عزیــزی رابــی بــوو خەڵکی گەرەوان بوو چووینە لای ئەوان کاك فاروق شارەزا بوو یــەك دوو جــاری تر چووبوە لایان دەمەو عەسری ئەو رۆژە مام عزیز دەستی کــردە چــەکەکەیی وگووتی" کورینە هیچمان نیە بخۆین وا دەچم حەیوانە کێویەکتان بــۆ دەکــوژم ئێوەش کەمێك بحەسێنەوە "مام عزیز رۆیشت ،ماوەیەکی کەمی پێ چوو دەنگــی تەقەیەك هات پاشی تەقەکە مام عزیز بانگی کرد گــووتی"کورینــە دوانتــان وەرن " کەچووین مامزێکی کێوی کوشــتبوو ، هێنامانــە خــوارەوە بــۆ نــاو ئــەو ئەشکەوتەی بارەگاکەی تێدابوو بەلام ئەشکەوتەکە دوو کێشەی هەبوو:-

- ئاوی کەم بوو.دەبوایە بە حساب ئاو بخۆینەوە ،ئاوەکەی بەدڵۆپە بوو.
- ئەدە بوو بەشەو ئاگر بکەینەوە،چونکە لە حوکمەتەوە دیار دەبوو

هەرچۆنێك بێت کەمێك گۆشتەکەمان خوارد. ئاونەشکەوتەکە زۆر سارد بوو مام عزیز حەیوانی زۆر کوشتبوو کەوڵەکانی خۆش کردبوو بۆڕاخستن دایناببوون لەناو ئەشکەوتەکە ، دیاربوو مام عزیزیش لەلایەن ملازم سەید کەریمەوە ئاگادار کرابۆوە کە بچێت بۆسەرکردایەتی بۆ هەمان مەبەست، بۆ بەیانیەکەی شەش حەوت پێشمەرگەی بێ چەکی هێناو لەگەڵ ئێمە بەڕێ کەوتین بەرەو گوندی سەران کەدەکەوێتە بناری چیای هندرێن لەوێوە بەسەر کەوتین بۆ سەر چیای هندرێن من زۆر حەزم دەکرد ئەم چیایە ببینم چونکە لە شۆڕشی ئەیلول برادەران زۆر باسی ئەو چیایەیان دەکرد .چیای هندرێن چیایەکی زۆر بەرزە سەری تەختە لەلای باکوری چیایەکە زیاتر لە دە کانی وکونە ئەشکەوتی بچوکی لێ یە ، گوندێك دەکەوێتە نزیك شاخی هندرێن لەلای باکوور . ئێوارە شۆڕ بووینەوە بۆ ئەم گوندە لەوێوە پردێك هەبوو بۆ سەر جادەی سەرەکی (قەسرێ - ڕەواندز ) بەلام دەبوایە مەسافەیەکی باش ئێمە لە سەر جادەکە بەڕا کردن بڕۆین چونکە لێوارێکی جادەکە شاخ بوو لێوارەکەی تری ڕوبارێکی گەورەو ئاوێکی سارد بوو ، ئاو ئاوە سەیارەو دەوریە هاتووچۆیان دەکرد ئێمەش نەدەبوو کەس بمان بینێت بەهەرحاڵ ڕۆیشتین و بەسەر کەوتین بۆ سەر شاخی حسن بەگ و لەوێشەوە شۆڕ بووینەوە بۆ ناوچەی سیدەکان گوندێك لەو دیو لە بناری شاخ هەبوولەنزیکی بەردەبووك.ئەو هێزەی ئێمەکە ٢٠ پێشمەرگە دەبووین تەنها من و کاك فاروق ومام عزیز چەکمان پێ بوو گەیشتینە ناو گوندەکە دابەش بووین بۆ ماڵەکان بۆ نان خواردن کات گەیشت بوو بە دەوری بەیانیان ،چونکە ئێمە شەو و ڕۆژێك بوو بەڕێوە بووین لە بارەگاکەی مام عزیزەوە تا کو ئێرە من لەگەڵ زرارو مشیر چووینە ماڵێك ژنێك و کچێك لە بەر نان بوون نانیان دەکرد سەلاممان کرد و کچەکە زۆر بە توڕەیی وەلامی داینەوەو گووتی "وە عەلەیکومە سەلام بەخێر نێن " ئێمەش

لەبەر ماندویەتی و برسیەتی گوێمان بەتورەی یەکەی نەدا من پێشتریش ئەم جۆرە سوتفانەم بینی بوو بۆیە لام ئاسایی بوو لە ساجەکە نزیک بوومەوە زرار جگەرە کێش بوو بەچاو پێم گووت جگەرەیان بدێ زراریش یەکو جگەرەی پێ دان ئێمەش وردە وردە خۆمان زیاتر لەساجەکە نزیک دەکردەوە چونکە بەرە بەیان بوو ئەو ناوچەیەش هەر خۆی ساردە وردە وردە داك و کچەکەم دوانە ئەوانیش سارد بوونەوە تورەیی یان نەما ، کچەکە بەدایکی گووت " هەستە برۆ چایان بۆ لێنێ و ماست و پەنیریان بۆ بهێنە " دیار بوو پیاویان لە مالْ نەبوو کچەکە گووتی" بۆیە چاوم بەئێوە کەوت تورە بووم چونکە دوێنێ شەو جەماعەتێکی وەکو ئێوە شەو داوایان کرد باوکم وەك چاو ساغ لەگەلْیان بچێت تا ئەو گوندەی تر باوکیشم بەتەمەنەو چاوی باش نابینێ رێگاکەی لێ تێك چووبوو ئەوانیش زۆریان لێ دابوو بۆیە منیش هەر کەئێوەم بینی ئاوا تورەبووم وامزانی هەر ئەوانن" منیش گووتم" ئەوانەی ئەو کارەیان کردووە پێشمەرگە نەبوونە بەلْکو جاش بوونە چونکە خاسیەتی پێشمەرگە نیە لەخەلْك بدات چ جا پیاوی بەتەمەنیش " دایکەکە نان وچاکەی بۆهێنان ئێمەش بێ ئێوە ناخۆش خواردمان ، ئینجا مالْ ئاوا یمان لە دایك و کچەکە کردو چووینەوە لای برادەران .هەمووومان کۆبووینەوەو رۆیشتین، پەرینەوە بەناوچەیەك پێ یان دەگووت دەشتی بەرازگر (کە دەشتێکی پان و بەرینەچەند گوندێك وناحیەی سیدەکان لەخۆ دەگرێت، بەلـۆلانیشەوە ) لە دەشتی بەراز گر دەبووایە تەنها بە شەو رێ بکەی چونکە هێزی رژێمی بەبەر بلأوی لێ بوو ئێمەش خۆمان حەشاردا تا تاریك داهات.ئینجا بەرێ کەوتین، دوای چەند سعاتێك رۆیشتن گەیشتینە شاخێکی بەرز کە پێ یان دەگووت چیای حەیات،دەمەوێ لێرە شتێك باس بکەم لەسەر ئەو ناوچەیە :-

ـ ئەو ناوچەیە عیبارەتە لەماڵی کەریم خانی برادۆست و ماڵی شێخ ڕەشیدی لۆلان کەهەردوو لایان برادۆستن .ئەوەی گرنگ بوو لەو ناوچەیە بینیم (دەچووینە هەر دێ یەك موختاری دێ یەکە پیاوێکی لە گەڵ دەداین بۆ چاو ساغی تاکو تەسلیمی موختاری گوندێکی تری دەکردین بەڕاستی ئەمەش ببووە کارئاسانی بۆ هێزی پێشمەرگە و توشنەبوونمان بەکارەسات، بەڕاستی دەمەوێ لێرەوە سوپاسی خەڵکی ئەو ناوچەیە بکەم ).دواتر هێواش هێواش نزیك بووینەوە لەسەرکردایەتی و بارەگاکان بەلاّم بارەگا چ بارەگایەك هەمووی لەبن دارو کۆلکەبی و کونە شاخ ودارچناری گەورە،کەگەیشتینە ناوبارەگاکان لە سەرکردایەتی ماوەیەك ماینەوە زۆربەی سەرکردایەتیەکانم ناسی بەلاّم تەماشام دەکرد بچوکترین پێشمەرگە لەتەمەن بۆخۆم بووم ماوەیەك ماینەوە چاوەڕێی چەکمان دەکرد بەلاّم ژیان لەوێ زۆر زەحمەت بوو، شوێنەکە زۆر سارد بوو بێ خواردنیش بووین ڕۆژێ سێ کولێرەیان دەداینێ بۆ هەر ژەمەو یەك کولێرە فڕنیەکی لێ داندرابوو کە مام وونس شەقلاّوەیی کاری پێ دەکرد، من هەرسێ کولێرەکەم بە یەك ژەم دەخوارد ئاوەکەش زۆرساردبوو کە پەرداخێك ئاوت دەخوارد وات دەزانی نانت نەخواردوە، بەڕێزمام جەلالیش مەمنوعی کردبوو کەس بچێتە دەوروبەری فڕنیەکە لەبەر مەسەلەی ئەمنی بەلاّم من چەند جارێك دەچوومە دەورەی فڕنیەکەونانە سوتاوەکانم هەڵ دەگرتەوە ودەم خوارد مام ونسیش بەمقاشەکە لەدەستی دەدام ودەیگووت ئەمگووت جارێکی تر نێیتەوە ،ئەوانەی من چاوم پێ کەوتن لەوێ (بەڕێز مام جەلال،کاك ئەوشیوان،کاك د. خالید،کاك عەلی عەسکەری،شێخ حسێن بابەشێخ یەزیدی ،ملازم حسن خۆشناو ،ملازم عومەر،د. خدرمعسوم ) .بەهەموو ئەم سەرکردایەتی یە بێجگە لە پێشمەرگە بێ چەکەکان (١٠٠) پێشمەرگە دەبووین مەفرەزەکەی کاك د. خالیدم دەناسی زۆربەی ژەمەکان خۆم

دەگەیاندە لای ئەوان ئەگەرنا تێرم نەدەخوارد ئەم پێشمەرگانە دەستەکەی کاک د. خالید بوون( مشیر خدر، تالیبی خالـــــــــــــەئەسومد ، جەعفەری خالـــە ئەســـومد ، جەوهـــــەر ســـعید ، سەربازئەحمــــــــەد ، ئــەمیر عبدالباقی )، ئەوانە خەڵکی کۆیە بوون ، بەهەموو سەرکردایەتی یەك شوێنی چێشت لێنان هەبوو هەموو ژەمێك ئەنـدامێکی سـەرکردایەتی دەبووایـە وەکـو ئەفسەری ئێشکگر خواردنەکە فەحس بکات ئینجا دابەش بکرێـت وەك قـسعەی عەسکەری لەبەرئەوەی بەڕێز ( مام جەلال ) و هەموو سەرکردایەتی لەم چێشتەی دەخوارد، من پێشتر باسم کـرد کەزۆربرسیم دەبـوو ئێوارەیـەك چـوومە نزیـك تەباخەکە مەنجەڵە نیسکێك لەسەرئاگربوو کەوچکێکی گەورەی تێدابوو، کاك نەوشیروان تێکی دەداو تـامی دەکـرد لـێ ی نزیـك بوومـەوە و گـووتم" کـاك نەوشیروان ئەوئاگرانە چین لەسەر ئەم شـاخانە کراونەتـەوە مـن بینـی بـووم لەبەرزایی شاخەکان بەلای تورکیا دا ئاگرکرابۆوە کاك نەوشیروان سەری بـەرز کردەوە گووتی" قیادە مۆقەتە لە شێخ جەواد بێدەری و لەجەماعەتی ئێمـەیان داوە لەمـەو پێش پـێ دەچـێ واز لەئێمـەش نـەهێنن ئەوەنـدە قـسەی کـردو مەنجەڵەکەی بەجێ هێشت و ڕۆیشت منیش قاپێ نیسکم تێ کردو تۆزێك ساردم کردەوەو خواردم بەدوای کاك نەوشیرواندا چووم .بوو بەغەڵبەغەڵب لە ژێرئـەو بـەردەی ( مـام جـەلال ) لـێ ی دادەنیـشت کۆبوونەوەیـەکی سـەرپێیان کـرد مەفرەزەیەکیان بەسەر خست بۆسەر شاخ بۆزانیاری هێنان لە نزیك ئاگرەکـان. چوون وهاتنەوە گووتیـان"بەڵێ مەفرەزەی قیادە مۆقەتەنە ئینجا بـەڕێز مـام جەلال زۆرنیگەران بوو فرمێـسك بەچـاوەکانی بـەدی دەکـران کـاك د. خالیـد گووتی" *__مامە گیان خۆت نیگەران مەکە ئێرەنا شوێنێکی تر__*" مام جەلال وەڵامی دایەوەو گووتی "*__کاکە خالید من بۆ ئێرە نیگەران نیم بۆئەوە نیگەرانم خۆیان شۆڕش ناکەن وناش هێڵن خەڵکی کوردستان بیکات من ئەمدەویست شەڕی کورد__*

***بەکورد دروست بێتەوە"*** من لەو رۆژەوە مام جەلال دەناسم کەئەفرەتی لەشەڕی براکوژی کردوەوهەردەم رقی لێ ی بووە، دواتربڕیاردرا کەئەم شوێنە بەجێ بهێڵین وچی هەمان بوو لەبارەگاکانمان تێکمان ناو پێچامانەوە، چەند وولاغێکمان پێ بوو بارمان کردن .لەچیای حەیات بەرەودیوی عێراق بەڕێ کەوتین وهاتینە سەر چیا، دوای چەند سەعاتێك تۆزێك حەساینەوە ، لەسەرچیا بەڕێزمام جەلال بەم شەوە زۆری قسە بۆ کردین دڵی داینەوە و باسی کوردستانی تورکیای بۆ کردین ودەستی بۆ دێ یەکان درێژ دەکرد دەیگووت ( ئەمە کانی رەشەو، ئەمە خەلانە، ئەمە..... ) ناوی دێ یەکانم لەیاد نەماوە دیاربوو شارەزایی یەکی زۆری هەبوو لەم ناوچەیە، بەم شەوە ئێمەی جۆش دایەوە لەسەر شاخ گووتی ""***کاك عەلی کاك ئەوشیروان کاك شێخ حوسێن کاك خالید کاك عومەر برادەران هیمەت بکەن شەڕی کوردبە کورد لەشەنە نەکات چوونکە ئێمە بەتەمانین"*** . ئینجا شۆڕ بووینەومو هاتینە گوندی جورجان کەگوندێکی بچوکەو دەکەوێتە سێ گوشەی هەرسێ سنوری ( تورکیا-عێراق-ئێران ) جورجان تابعی ماڵی شێخ رەشیدی لۆلانە. گوندی جورجان دانیشتوانەکەی سۆفینە، جورجان دوو سێ ماڵ بوون. بەڕێز مام جەلال نامەیەکی بۆ حاجی محەمەدی شێخ رەشیدی لۆلان نوسی وەزعی خۆمانی بۆ رون کردبۆوە بۆ ئەوەی یارمەتیمان بدەن ماوەیەك لە سنوری گوندەکانی ئەوان بژین چونکە بێ بارەگاو خواردن بووین ، حاجی محمد وەلامی نامەکەی مام جەلالی دایەوە بەهاوکاری کردنمان، ئینجا ئێمە دابەش کراین بە سەر گوندەکان هەر گوندەو چەند پێشمەرگەیەکیان بەبەرکەوت من وجەوهەری برام و چەند پێشمەرگەیەك بەر گوندی سپیارە کەوتین بە ماڵەکاندا دابەش بووین من بەتەنها بەر ماڵێك کەوتم ناوی ( حاجی سمایل سپیارە ) بوو برازایەکی گەنجی هەبوو لەبەدبەختی من تازە کچێکی هەڵ گرتبوو و کێشەیان هەبوو، من بۆماوەی یەك مانگ لەماڵی

حاجی سمایل مامەوە بووم بەکوڕی ئەوان دەیان ناردم بۆ لای حەیوان،گەلاَدێم لە پشت ماڵەکان بەشان دەکێشا بۆ هۆری حەیوانـــــەکان شـەوانیش دەبووایـە حەرەسیات بکرم چونکە لەخۆیان دەترسان و دوژمنداربوون،ماوەی مانگێك ئاوام بە سەربرد لەدوایی دا زۆر بێزاربووین چەك هەرنەهات جەوهەری برام بـانگی منی دەکـرد ( کاکە سور )،(کاکم زۆر ڕێزی لەمن دەنا چونکە لـە پـێش ئـەویش ببووم بە پێشمەرگە پرس و ڕای پێ دەکردم ) و گووتی" "کاکە سور باسەردانێکی کاك دکتۆرخالید بکەین پرسی پێ دەکەم ئەگەر ئیزنمان بدات دەگەڕێینەوە بۆ خوارەوە" سەردانی دکتۆرخالیدمان کرد لەگوندی جورجان چونکە ئەوکاتە ئێمە زۆر بەمان بزوتنەوە بووین زیاتر پرس وڕامان بە کاك د.خالید و کـاك عـەلی عەسکەری بوو،کاك د.خالید ئیزنی دایـن کەبگەڕێینـەوە ، هاتینـەوە گونـدی سپیارە دوعابوونمان لەخەڵکەکەخواست بەلاَم ماڵی حاجی سمایل زۆریـان پـێ ناخۆش بوو بۆمن،هەوڵیاندا کە بمێنمـەوە بـەلاَم نەمامـەوە گـووتم" ئەگـەر نەمرین دەتـان بینمەوە،بەقۆناغ گەڕاینەوە بەهەمان شوێنی پێدا چوو بووین تـا گەشتینەوە بارەگاکەی کـاك عزیـزی ڕابی،لـە سـەرەتای مـانگی ( ١١ی ) ١٩٧٧ گەیشتینە پشت گوندی زێوەو هەرتەل شـەوێ لەقـەدی شـاخ ماینـەوە بـەیانی دەوری سعات ٧ جەوهەری کاکم بانگی کردم گووتی""کاکەسوور هەسـتە پـێم وابێ بەعس هێرشی هێناوە " ئێمەش هەستاین و سەیرمان کـرد زیـاتر لـە ٢٠ کۆپتەر پەیدا بوو لەسەر هەموو شاخەکانی ناوچـەکە جونـدیان دادەبەزانـد و چادریان هەڵدەدا زیاتر لە ٥٠٠٠ سەربازیان لە کوردستان بلاَو کـردەوە هەرلـە ناوچەی مەلەکانەوە تـا دەگاتە چیای بەنەباوی ودۆڵی سماقوڵی.ئێمە دوو شەو و ڕۆژ لەم شاخە ماینەوەو خۆمان حەشاردا بەبێ نان.بەڕۆژ بەدووربین سـەیری جموجۆڵی دوژمنمان دەکرد بە شەویش تەماشای ئاگرەکانمان دەکـرد تـابزانین لەکوێ جەیش هەیە بۆشەوی سێ یەم زۆرمان برسی بـوو نـاچـار شـۆڕ بووینـەوە

گوندی شێرێ. کوڕێکم دەناسی لەوێ ناوی مغدید بوو تەنزیمی بزووتنەوە بوو زۆر هاوکاری پێشمەرگەی دەکرد .گوندی شێرێ هەموو دارو درەختە ماڵەکان بەزەحمەت دە دۆزرانەوە، هەرچۆنێك بوو ماڵی مغدیدم دۆزیەوە پێشمەرگەکانم لەدەوری ماڵەکەداناو لەگەڵ کاکم سابیر ( جەوهەر ) چووین بۆ ماڵی مغدید چونکە ( من شارەزابووم ومغدیدم دەناسی کاکیشم فەرماندەی مەفرەزەبوو ) لەدەرگامان داو زۆر بەزوویی دەرگا کرایەوە بینیمان مغدیدە وگووتی" "کوردە گیان خێرا وەرنە ژوورەوە ئێوە لەکوێ هاتن ئێستا قوات خاصەکانم بەرێ کرد توشیان نەبوون؟لەڕاهی ئەو خودایە خۆتان و ئێمە بپارێزن چونکە بستێك خاك نەماوە لەم وولاتە خێمەو قوات خاصەی لەسەر نەبێت " منیش بەهێواشی گووتم"" دەزانین ئێمە سێ رۆژە لەم شاخە سەیر دەکەین بەلاّم زۆرمان برسیە "مغدید پیرە دایکێکی هەبوو بەداخەوە ناوەکەم لە بیر نەماوە دایکی گووتی "کاکە مغدید ئەوانە کێن ؟ مەغدید نەیوێرا ناومان بهێنێ گووتی"دایە هی خۆمانن"هەندێك نان و خورماو کارکە تەماتەمان لێ وەرگرت و بەزوویی گەڕاینەوە بۆلای پێشمەرگەکان،دواتر هەمووما‌ن بەرێ کەوتین بەرەوگوندی دەراش، پیاوێکم دەناسی بەناوی برایم دەراشی کە لەشۆڕشی ئەیلول لەهێزەکەی ئێمە بوو گووتم"واباشە خۆمان بگەیەنینە ماڵی ئەوان کە گەیشتینە گوندی دەراش دوو خێمەی سەربازی لە پشتی ماڵەکەیان سپی دەچۆوە بۆیە گەڕاینەوە بۆ چیای هەورێ وپشتی چیوەی خواروو، شەو بوو بەسەرکەوتین بۆ نێو قەدی شاخ شوێنکی خۆحەشاردا نمان دۆزیەوە تا بەیانی ماینەوە .بەیانی من وزرار مەندێری بەرێ کەوتین بچین بۆ سەر چیا دووربینەکەمان برد گەیشتینە ناو ڕەزێکی ترێ ( عادەتی ئەو شاخە وایە فێنکە وەك کوێستان ترێ تا درەنگانێك دەمێنێتەوە ) کەچاومان بەو ووشیە ترێ یانە کەوت یەکسەر گەڕاینەوە بۆ لای کاکم وبرادەران لە قەدی شاخ ئەوانیشمان ئاگادار کردەوە

لەو ڕمزو تریێ یە ئەوانیش هەموولەگەڵمان هاتن بۆ ناو ڕمزوترێکە .ئەوا ئمان لەوێ بەجێ هێشت من وزرار بەڕێ کەوتینەوە بۆ سەر چیا بینیمان چادرێکی سەربازی هەڵدراوە زیاتر لە حەوت جوندی لەنزیك چادرەکە لەبەر ڕۆژ خەوتبوون .زرار گووتی" باچەکەکانیان ببەین من گووتم"هێشتا زووە ئەگەر شتێکی وابکەین لەوانەیە هەموومان لەناوبچین بۆیە نەمهێشت دەستکاری چەکەکان بکات بەلاّم هەرچۆنێك بوو خۆی گەیاندە پشت سەری جوندی یەکان دوو عەلاگە بەدارەوە کرابوون عەلاگەکانی پچڕاندو هێنای ،گەڕاینەوە لای کاکم وبرادەران لەناو ڕمزەکە لەوێ بۆ کاکم گێڕایەوە کەشتێکی وامان کردووە کاکم گووتی"کوڕینە هەستن بابڕۆین تاکەشف نەبووینە چونکە ئەوکارە لەیاسای پارتی زانی هەڵەیە" هەر ئەوکاتە بە پەنا داروبار ڕۆیشتین وناوابووین بۆلای گوندی ئەسپینداره لە شوینێك دانیشتین عەلاگەکانی زرار هێنای کردمانەوە (وەك بڵێی خوا بۆی ناردین هەمووی گۆشتی قوتو و کێك و سەموون بوو ) بۆ ئێمە جەمێکی باش بوو وردە وردە لە عەسر نزیك دەبووینەوە ڕوومان دەکردە هەر گوندێك خێمەو قوات خاسەی لێ بوو بۆیە ڕوومان کردە شاخی سەرسۆرك کەدەکاتە بەرامبەری شارۆچکەی هیران چووینە سەر شاخ لە وێوە مشیر هیرانی بوو بەچاو ساغمان چونکە خۆی خەڵکی ئەو ناوچەیە بوو ماڵە پورێکی مشیر لە دۆڕێ بوو کەدەکەوێتە تەنیشت هیران هەرچۆنێك بێت بەناو ڕوبارو شیوو وناوبەردەلاّندا ئێمەی گەیاندە ماڵی پوری کەچووینە ژوورێ ئەوانیش زۆر ترسان و سەریان سوڕما گووتیان"ئێوە لەکوێوە هاتوون چەند خولەکێك لە پێش ئێوە قوات خاسەکان لێرە ڕۆیشتن" تۆزێك هەنارو نان و شتی تریان بۆ هێنااین بە پێچراوی بەلاّم نەیان وێرا فەرمووی دانیشتن و مانەوەمان بکەن ناهەقیشیان نەبوو ، مشیر پێشمان کەوت بەڕێ کەوتین بۆ سەر شاخ گووتی"کانیەك هەیە بەناوی کانی فەقێ برایم بابچین بۆ ئەوێ

کەچووین بۆسەر کانیەکە بۆنی دوکەڵی جگەرە دەهات نزیک بووینەوە لەکانیەکە تەماشامان کرد جەماعەتێکی لێ بوو دیار بوو عەسکەری بوون سەد مەترێك لاماندا لە کانیەکە وبەسەر کەوتین وئاوا بووین بۆ دۆڵی سماقوڵی ( سماقوڵی سەروچاوە )،نزیکی مەغریب ببوو هێشتا رۆژ ئاوا نەببوو لەوێوە چاو ساغی کرایەوە ئەرکی من چونکە لەگەڵ کاك سەعدی گچکە پێشتر زۆر چووبوومە ئەو ناوچەیە وبەتایبەتی ماڵی حاجی عزیز ( بەحاکم عزیزیش ناو دەبرا چونکەلە شۆرشی ئەیلول لەگەڵ چەند کەسێکی تر حاکمی شۆرش بوو ) رووومان کردە ماڵی مام حاجی عزیز،زرارم لەگەڵ خۆم بردو لە کادێن و شوێنی ولاغەکانیان کە لە دیوی خانووی نیشتەجێ ی خۆیان بوو چووینە ژورەوە لەناو حەسارەکە دەرگایەکی گچکەی تەنەکە هەبوو دەچۆوە بەردەمی ژوری دانیشتنی خۆیان لە پشت دەرگاکەوە تەماشام کرد ئەفسەرێك و چەند سەربازێك لە سەر رۆیشتن بوون دووعابوونیان لە مام عزیز دەخواست من و زراریش خۆمان ئاشکرا نەکرد تا چەند سەد مەترێك ئەفسەرو سەربازەکان دوورکەوتنەوە لەماڵی مام عزیز ئینجا هاتینە دەرەوە و چوومە ژورەوە سەلامم کرد مام عزیز کەچاوی پێم کەوت گووتی" عەلەیکومە سەلام بەخێر نێ ی قەحپە بابی سەگباب تۆ دەتەوێ لەناومان بەری بەدەم ئەو قسانەوە هەستا پێومو لێم نزیك بۆوە گووتی"دونیا هەمووی قوات خاصەو جەیشە تۆ لەکوێ هاتوی کوا کێت لەگەڵە( مام حاجی عزیز منی دەناسی وەك باسم کرد لەگەڵ کاك سەعدی زۆر چووبووینە ماڵیان، هەموو جنێوەکانی زۆر بە تێرادیتی بوو ) من وەڵامم دایەوەو ووتم "مام حاجی گیان خۆت مەشێوێنە پێم بڵێ ئەو عەسکەرانە چیان دەگووت زەردە خەنەیەکی هاتێ و گووتی" هەتیو بەختتان هەیە چەند رۆژێکە ئەوانە لەم ئاوچەیەن بەڵام ئێستا ئەمریان بۆ هات کوردستان چۆڵ دەکەن وجەیشەکە دەگەرێننەوە شوێنەکانی خۆیان "منیش گووتم"ئەتزانی ئەم زابتە ناوی چی

بوو؟ دووبارە پێکەنی و گووتی"بۆ خۆ نفوسی بۆ دەر ناهێنیت گووتم" ناوەلا بەس دەمەوێت لە دەفتەری یادەوەری خۆم ناوی بنوسم " دووبارە حاجی گووتی"بەخوا ناویم لێ نە پرسیوە چەند رۆژێکیشە لێرەیە بەلام بە( ابو هودە ) ناوی دەبەن" منیش لەیادەوەری خۆم ابو هودەم تۆمار کرد.ئەو چەند رۆژە لەژیانم رۆژی زۆر ناخۆش بوون چونکە کەس لەخۆی نەدەگرتین و دەبوایە هەر بگەرێین ، ناوەدانی نەبوو بچینێ زۆر کوێرە وەری و برسیەتی و شەو نخونی ونەهامەتیمان بینی،بەلام بوو بەتاقی کردنەوەیەکی باش بۆ سەرکەوتن لەژیانی پێشمەرگایەتی، منوزرار بە پەلە گەراینەوە بۆ لای کاکم و برادەران بۆ گەیاندنی ئەم هەواڵە خۆشە دواتر جەیشەکە پێچایانەوەو گەرانەوە شوێنەکانی خۆیان وناوچەکەیان چۆڵ کرد، ئێمەش گەراینەوە بۆدەشتی هەولێرو لای کاک قادر مستەفاو چووینەوە بۆ شوێنەکانی خۆمان،دەتوانم بلێم ئەو تەمشیتەی ئەو جارەی کە جەیشی عێراق کردی بۆناوچەکانی خۆشناوەتی مەگەر لە ئەنفالە بەدناوەکە کرابێت ئەگەر نا شتی وانەبووە.... .(دۆڵە فشەش ئەو دۆڵەی کە پێشتر باسمان کرد دۆڵی گوستێ یە بەلام برادەرانی سەرکردایەتی زۆر تەگبیریان لێ کردبوو بەلام سەری نەدەگرت بۆیە ناویان لێ نابوو دۆڵە فشە )

## لەگوندی ئۆمەرگومبەت ١٩٧٨

لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٨ مەفرەزیەکی شەهید دکتۆر خالید هاتنە دەشتی هەولێر بۆلای ئێمە بۆ جەولەکردن کاك مشیرخدر فەرماندەی مەفرەزەکەبوو پێشمەرگەکانیش( جەعفەر ئەسوەد، جەوهەر سەعید ،سەرباز ئەحمەد، زرار وەرتی، دلشاد عزیز جانەوەر،ڕۆستەم ،تاڵیب ئەسوەد ،ئەمیر باقی ، نوری حەمەکەریم ) چەند ڕۆژێك جەولەمان پێکەوە کرد،شەوێك چووینە گوندی ئۆمەرگومبەت بۆنان خواردن دابەش بووین بەسەر ماڵەکان ،دوای نان خواردن هەمووومان گەڕاینەوە مزگەوت هەرکەسەو یاتاغ و نانی خۆی هێنا بوو بۆ بەیانی ونیوەڕۆکەی بەڵام کەهەمووومان کۆبووینەوە ،لەمەفرەزەکەی کاك مشیر دووکەس بەناوەکانی( دلشادونوری )نەگەڕابوونەوە هەردووکیان ئاربیجیان لابوو ئەوکاتە بەهەموو هێزەکەمان وەکوچەکی قورس تەنیا ئەودوو ئاربیجیەمان هەبوو ،تەواوێك چاوەڕێمان کردن گووتمان" ئەبادە ئەوماڵەی ئەوانی چوینێ درەنگ نانیان ئامادە بووبێ بەڵام دوای چاوەڕوانی یەکەش هەردیار نەبوون ناچار بەبڵند گۆی مزگەوت بانگەوازمان کرد بەڵام هەردیارنەبوون بۆمان دەرکەوت ڕایان کردووە ،من و کاك مشیرو مەفرەزەکەی بەدوایان داچووین بۆرووباری کۆیەو ئیلنجاغ بەڵام نەمان دۆزینەوە وگەڕاینەوە بۆلای مەفرەزەکەی خۆمان لەئۆمەرگومبەت تا ئەوانیش دڵنیا بکەینەوە لەڕۆیشتنی ئەو دوو کەسە،بۆیە هەربەوشەوەچوار سەعاتەڕێ ڕۆیشتین لەسنوری ناوچەکە دوور کەوتینەوە ئەوشەوە کەسمان نەخەوتین

## خەبەرێکی دڵ تەزێن

هەرچەندە ماوەیەکی کەم بوو محمد عەجەم، کە پێشتر باسم لێوەکردبوو کەلەگەڵ چەند کەسێك تەنزیمی رێکخراوی کۆمەڵەبوون هاتبوونە دەرەوە، لای ئێمە بوون بە پێشمەرگە سەرەتای مانگی ٤-١٩٧٨ لەگوندی بانی ماران بووین، محمد عەجەم داوای کرد لەکاك رێباز کەبچێت بۆ ناو هەولێر چالاکیەك بکات لەگەڵ ئەو پێشمەرگانە خالید سابیر ،سمکۆ،عبدالله سابیر پێشتر باسی حوسێن زیلم کردبوو کە لەگەڵ ئەوان هاتبووە دەرەوە جەیش گرتبووی بەلآم کانۆچاوشین بەری دابوو لەهەولێر بەگەڵ کانۆ کەوتبوو، کەدەچن بۆ هەولێر لەرێگا سمکۆ وعبدالله جیا دەبنەوە دەچنە لای گوندی میرزا ئەحمەد پاشان تەسلیم دەبنەوە محەمەد عەجەم لەگەڵ خالید سابیر چەکێکی ویزە لەگەڵ دەمانچەکەی خۆی دەبەن و دەچنە ماڵی حوسێن زیل پاش یەك دوو رۆژ لەماڵی ناوبراو دەردەچن وبەهیوای ئەوەی کەئەوکارەی دەست نیشانیان کردبوو ئەنجامی بدەن ئەوجا بگەرێنەوە بەلآم دەگەنە پشتی باداوان لای قەبرستانی سەید مەعروف دەکەونە ناوکەمین ودەست رێژیان لێ دەکەن خالید زوو شەهید دەبێت محەمەد عەجەم شەرێکی باش دەکات و دواتر ئەویش شەهید دەبێت بەبیستنی ئەم هەواڵە هەموومان زۆر نیگەران بووین ئێمە وامان زانی رەفیقەکانی خۆیان خیانەتیان لێ کردوون بەلآم دوایی دەرکەوت کەئەو ماڵەی لێی بوونە دەستیان لەوکارەداهەبوو ،من لە هەمووان زیاتر بۆ محەمەد نیگەران بووم چونکە کەلە رویارو ئاو دەپەرینەوە زۆربەمان پوزەوانەمان لە پێ بوو زۆربەی جارەکان منی لەباوەش دەکردو دەیپەراندمەوە لە ئاوەکە ،هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی کاکە محەمەدو کاکە خالید،

***داستانی قوپاد بەگیان سالی (١٩٧٨)***

ئێمە وەك هێزی پێشمەرگە دابەش ببووین بۆسەر دووبەش بەشێکیان بۆدێ ی کانی کوردە بەشەکەی ترلەگوندی شیوەشان هەندێ پێشمەرگەش چووبوونە گوندی قازبەگیان لە بەرواری (٢/ ١٩٧٨/٢) لەتۆڵەی شەڕی (حەسەن مترب) دوژمن زۆر قینی لەهێزی پێشمەرگە هەڵسابوو. قواتێکی یەدەگیان لەدۆڵی خەلەکان ئامادە کردبوو هێزێکیش لەگەڵ چەند کۆپتەرێك کەلەیادم نەماوە بەژمارە چەند کۆپتەر بوون بەلام لە پانزە کۆپتەر زیاتر بوون، ئێمە لەگوندی قازبەگیان کەدەکاتە ناوەڕاستی ناوچەکە، کاتژمێر نۆی سەرلەبەیانی هێزەکان کۆبووینەوە بەم شێوەیە بڕیاری دابەش بوونمان درا:-

- کاك سعدی گچکەو محمد عەجەم و سەید کاکە لەگەڵ ٥٠ پێشمەرگە بۆ سەر بەرزایی چیا کە دەیڕوانی یە دۆڵی خەلەکان.

- مەفرەزەکەی کاك قادر مستەفا و مەفرەزەکەی جەوهەری برام بۆسەر خودی لوتکەی قوپاد بەگیان کەکۆپتەرەکان تەرکیزیان زۆر دەکردە سەر ئەو لوتکەیە (بۆئێوارە بۆمان دەرکەوت کە کاك قادر مستەفاو جەوهەری برام هەردوك برینداربوون).

- من و کاك مەلا بەختیارو کاك شاخەوان عەباس و شەهید هاوڕێ کاوە مخموری و شەهید ئەحمەد قەمبەری و چەند پێشمەرگەیەکی قارەمان کەبەداخەوە ناویانم لەیاد نەماوە، ئێمە لەڕاست گوندی قازبە گیان لەناوەڕاستی شاخ.

هێزی پیادەی دوژمن تەنیا لەلای ئێمەوە هێرشیان هێنا، ئێمەش وەکو پیشەی پێشمەرگایەتی خۆمان ڕووبەڕوویان بووینەومو چەند سەربازێك

کوژران،زۆرم هەوڵدا لەگەڵ هاورێ کاوە کەبچین بۆسەر لاشەکان بۆنەوەی چەکەکان بهێنین بەلآم کاك مەلابەختیار نەیهێشت گووتی" شەهید دەبن بۆچەك

ـ چەتۆی کەریمە سورو شێخ جەواد بێ دەری کە لەدەشتی کۆیە یەکمان گرتبۆوە چونکە ئەوان شوێنی جەولەی خۆیان بوو .ئەوانیش کەوتبوونە پشتی گوندی کانی کوردە دەکاتە نێوان ئێمەو کاك سەعدی گچکە .لەدۆڵی خەلەکان دوژمن هێرشی هێنا بۆ سەر کاك سەعدی وبرادەران بەلآم نەیان توانی بوو تەنیا دەهەنگاویش بەسەر شاخ بکەون چونکە پێشمەرگە ئەرکی سەرشانی خۆیان بەجێ گەیاند شەڕی باشیان کرد تائێوارە ، ئەو رۆژە تاکو تاریکان کۆپتەر وەك ریشۆڵە ئاسمانی ئێمەیان چۆڵ نەکرد بەبەردەوامیش بۆمب بارانیان دەکردین ،ئەوەی جێگای خۆشحاڵیمان بوو لەم شەڕە خۆڕاگری هێزی پێشمەرگە بوو بەرامبەر هێزێکی سەد ئەوەندەی خۆی لەهەموو روویەکەوە ،نەبوونی هیچ زیانێکی گیانی جگە لە بریندارbوونی کاك قادر مستە فاوجەوهەری برام ،گوندەکانیش خۆش بەختانە هیچ زیانێکیان بەرنەکەوت.

دوای تاریکان لەشاخ هاتینە خوارەوە بۆدەشتی کۆیە ،هەمووmان لەگوندی بانەگولآن یەکترمان گرتەوەو هێزەکانمان دووبارە دابەش کرایەوە.

ـ کاك سە عدی گچکەو سەید کاکە گەڕانەوە بۆخۆشناوەتی

ـ ئێمەش هاتین بۆ دۆڵی سماقوڵی وگوندەکانی بناری چیای باواجی دواتر بۆ دەشتی هەولێر.

### شەڕی دەشتێو

لە ( ١٩٧٨/٣/١١ ) کاك سعدی بەنامە ئاگادار کرابۆوە کەوا سەرکردەکان بچن بۆلای بەڕێز مام جەلال لە دۆڵی قاسمەڕەش لەنێو زەنگ ئێمە لەدەشتی

هەولێرەوە چووینە بناری چیای کۆسرەت لەگەنی مێوژە کاك سعدی جیای کردمەوەو گووتی"کوردەگیان هێندێك شتم لە بیرچووە، نامەیەکت پێ ئەدەم تۆ دەبێت بگەڕێیتەوە دەشتی هەولێر لای کاك قادر مستەفا،من وکاك سعدی وەك و مام وبرازامان لێ هاتبوو لەدڵم ناخۆش بوو بەلام نەدەکرا قسەکەی ڕەت بکەمەوە دیسان وەك هەموو جاران گووتم" بەڵێ بەسەر چاو نامەکەم لێ وەرگرت و پێنج دیناریشی پێ دام گووتی" ئەوە بۆ خۆت بە پێڵاو بدە ( پێنج دینار ئەو کاتە گەلێك زۆر بوو ) کلاشنکۆف و تاقمەکەم دایەوە خۆی چونکە پێشتریش هی خۆی بوو زۆری هەوڵ دا کەدەمانچەکەی لێ وەربگرم بەلام من قبوڵم نەکرد من بێ چەك گەڕامەوە دەشتی هەولێر ئەوانیش پەڕیبوونەوە بەری مەرگەو لەچیای ئاسۆس ئاوا ببوون بۆگوندەکانی( نورەدین- دەشتێو ) شەو لەگوندی نورەدین دەبن دەمەو بەیان بەڕێ دەکەون بەرەو دەشتێو، کاتێك نزیك دەبنەوە و دەبینن دەشتێو گەمارۆ دراوە بەهێزی سەربازی ، پێشمەرگەکان ڕووبەڕوویان دەبنەوە و شەڕ دەست پێ دەکات ، هێزەکەی دوژمن زۆر زیاتر دەبن لەهێزی پێشمەرگە کە بریتی بوون لە( دەستەکەی کاك سعدی گچکە ، دەستەکەی سەید کاکە،مەفرەزەیەکی دکتۆر خالید ) بەگشتی (٤٢ ) پێشمەرگە بوون .لەبەیانی زووەوە شەڕیان کردبوو تا ئێوارە ، هێزەکەی ئێمە کاك سعدی خۆی سەر پەرشتی شەڕەکەی کردبوو دوژمن لەهەموو لایەك بە پیادەو بەکۆپتەر هێزی هێنابوو بۆشەڕگە، لەلایەکی تریشەوە کۆپتەری شەڕکەربەشداریان کردبوو ( دەتوانم بڵێم نیوەی هێزی سەربازی ئەوکاتی ڕژێم لەو شەڕە بەژدار ببوون ) بەلام پێشمەرگە چاونەترسەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان گورزی باشیان لەدوژمن دابوو ،ئەو شەڕە دەنگی دایەوە کە پێشمەرگە بەو هێزو چەکە سوك و لەژمارە کەمە توانی بەرەنگاری نیوەی هێزی سەربازی عێراق ببێتەوە ،شەڕی ڕووبەڕووی کۆپتەر لەو کاتە شتێکی نوێ بوو بۆ هێزی پێشمەرگە چونکە

لەشۆڕشی ئەیلول بەکار نەهاتبوو بێجگە لە کۆپتەرو لێشاوی هێزی پیادە، کۆپتەرەکان نارنجۆکیشیان فڕێ دابووە خوارەوە تۆپ وهاوەنی دوور هاوێژیش بەکار هاتبوو بەلام هێزی بیرو باوەڕی پێشمەرگەوبەتاییەتی فەرماندەی قارەمان کاک سعدی گچکە زۆر زیاتر بوو لەو هێزو کۆپتەرو تۆپ و هاوەنی دوژمنە. هێزی پێشمەرگە چەند کۆپتەریان پێکابوو سەرلەنێوارە سەید کاکە ئەو بەرزایی یەی بۆی داندرا بوو بەجێ ی هێشتبوو، کاتێك کاك سعدی چاوی بەسەید کاکە دەکەوێت دەڵێت بۆ بەجێت هێشت ئەویش گووتبووی شەڕی لێ ناکرێت بۆیە بەجێمان هێشت.کاك سعدی خۆی ئەیزانی ئەو بەرزایی یە کلیلی شەڕەکەیە چونکە بۆشەویش دەبوایە هەر لەو بەرزایی یەوە پاشەکشە بکەن بۆیە خۆی وچەند پێشمەرگەیەك هێرش دەبەن بۆ بەرزایی یەکە بەلام دوای بەجێ هێشتنی بەرزایەکە لەلایەن سەید کاکەوە چەند سەربازێکی دوژمن دەچنە شوێنەکەیان ،کاك سعدی و سەربازەکان تووشی لێکدان دەبن بەلام زۆر زۆر بەداخەوە بەفیشەکی کوێری دوژمن کاك سعدی جارێکی تریش دەڵێم بەداخەوە شەهید دەبێت بەلام پێشمەرگە قارەمانەکانی کاك سعدی شوێنەکە دەگرنەوە.کە ئەم هەواڵەم بیست بۆمن زۆر ناخۆش بوو دەڵێم خۆزیا منیش لەگەڵیان چووبام چونکە هەموو ئەو پێشمەرگانەی لەو شەڕە گیانی پیرۆزیان سپارد ( شەهید بوون ) هاورێ وهاو خەبات و هاوسەنگەرم بوون.(٤) پێشمەرگە بەدیل گیرابوون دواتر لە( ١٦-٦-١٩٧٨ ) هەرچواریان لەقەسابخانەی موسڵ بەداخەوە لەسێدارەدران کە سێ یانیان خەڵکی گۆمەشین بوون دیسان گۆمەشین ماتەمینیەکی تری بەسەر داهات بەو پۆلە شەهیدە ، هەندێك پێشمەرگەش بەبرینداری رزگار ببوون بەم ناوانە ( عبداللە سوور (فیشەکێکی بەسینگی کەوتبوو ) جەمال کوردە چاوێکی لەدەستدا ، ئەمیر عبدالباقی بریندار ببوو ) ئەو پێشمەرگانەش بەساغی رزگاریان ببوو ( جەوهەر سعید ،سەرباز ئەحمەد

،زرار وەرتی ،سەید کاکە ، بەکر حەمە ، مشیر خدر ، سەید حوسێن گۆمەتاڵی ، قادر عزیز ، رۆستەم ، سلیم ،کەریم ) ئەو پێشمەرگەو سەرکردە قارەمان و جوامێرانەش شەهید بوون :

- سعدی گچکە - ئەندامی سەرکردایەتی بزووتنەوەو لێپرسراوی هەرێمی (٨).
- فارۆق سدیق ( مامۆستا فارۆق ) – رێبەری سیاسی هەرێم .
- فەرخ قادر قەراجی .
- ئەحمەد محەمەد (ئەحمۆ چەمرگەیی ).
- فەریق هەمزە ساڵەیی.
- شاهین پردێ ی.
- تاهیر محەمەد کەنداری.
- جەبار ئیسماعیل گۆمەشینی.
- عوسمان باوە.
- عەزیز باپیر.
- سامی سەید عوبێدی.
- صباح جەمیل چەمرگەیی.

هەزاران سڵاو لە رۆحی پاکیان ،هەرگەشاوە بێت ناویان.

ئەو پێشمەرگانەی بە دیل گیران لە شەڕی دەشتێو

- جەعفەر ئەسومد.

- سەید حوسێن گۆمەشینی ( حسین عبدالرحمان سەید عەولا لەساڵی ١٩٤٠ لەگوندی گۆمەشینی شێخان چاوی بە دونیا هەڵێناوە ،تاقانەی باوکی و برای

سێ خوشکان بووە،لەساڵی ١٩٥٨ چووەتە ریزی کوردایەتی تائەو رۆژەی شەهید بوو ).

ـ جەواد کەریم گۆمە شینی

ـ کەمال واحید گۆمەشینی

## کارە ساتی هەکاری ساڵی ١٩٧٨

وەك چۆن لەشۆڕشی ١٩٧٥مونتەمەری جەزائیر مۆرکرا کەبووە هۆی نەهامەتی بۆ خەڵکی کوردستان وتێکدانی شۆڕش ،ئەم جارەش کۆبونەوەی چوارقۆڵی( عیراق-ئیران-تورکیا-قیادە مۆقەتە ) لە گەڵ هەندێك خێڵی دواکەوتووی ناوتورکیا بۆپیلان دانان بۆلێدانی گورزی گورچك بڕ لە هێزەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان کەبەراستی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەماوەی ئەو ساڵ وچەند مانگەی دامەزرانیەوە گەشە کردنێکی بەرچاوی لەسەرکردایەتی و رێکخستنەکانی و هێزی پێشمەرگەوە پێوە دیار بوو ،بۆیە دوژمنا نمان هەموو هەوڵێکیان دەدا بۆ تێکدانی ،کورد دوژمنی زۆرە، لەلایەك فەرموویان لێ دەکردین و لە لایەکیش بۆسەیان بۆ دادەنایەنەوە،ناردنی هێزێك بەرەو سنوری ( تورکیا ـ سوریا ) بۆ هێنانی چەك و تەقەمەنی وچەکدارکردنی پێشمەرگەکان هاوکاری وچەسپاندنی هەرێمی بادینان بەسەر پەرشتی شێخ حوسێنی بابە شێخی یەزیدی، پەیتا پەیتا هێزەکان گەیشتنە سەرکردایەتی ورێکخستنیان بە مەبەستی چوونە بادینان بەرێی قەندیل ئەو هێزە ( ٨٠٠ ) کەسیە کەئامادە کرابوو بۆ بادینان زۆربەی هەرە زۆریان بێ چەك بوون،وە ئەو پێشمەرگانەش زیاتر پێك هاتبوون لەرێکخستنەکانی بزوتنەوە ئەوانەی تریش کۆمەڵە بوون، چوون و نەچوون بۆ بادینان فکرەی جیاوازو رای زۆری لە سەر باس

کرابوو، بەڕێز مام جەلال و مەکتەب سیاسیەکان پێشتر خۆیان لەو سنورە بوون کەئێمەش لەگەڵ بووین ،ئەو سێ سنورە شوێنەکی لە بار بوو بۆ ئـەوەی زیـاتر دەستیان بە سوریاو دەنگی دەرموە بگات ،چونکە بەڕێز مام جەلال شتی زۆری لە سوریا ئامادە کردبوو وەك چەك و پارەو دژە فرۆکەو کەرستەی چاپ و ڕاگەیاندن و ڕادیۆ ،هەر لە سەرەتاوە مل بەملانێی نێوان کۆمەڵەو بزووتنەوە هەبوو بۆیـە بەڕێز مام جەلال بڕیاری دابوو خۆشی لەگەڵ هێزمکە بڕوات بۆ بادینـان ،هێـز بەڕێ کەوتبوو بەناو خاکی ئێران بسوڕێنەوە سنوری تورکیا و لەوێشەوە بۆ نـاو خاکی سوریا،کۆمەڵێك پێشمەرگە گەڕانەوە بۆ دەشتی هەولێر بۆلای ئێمە،(کاك شاخەوان،کاك علی صالح،لەگەڵ چـەند پێـشمەرگەیەکی تـر)، چـۆنیەتی کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی و شەڕەکەی دەشتێو و شەهید بوونی کاك سعدی و هەڤاڵەکانی و چۆنیەتی هێز بۆ بادینان کـاك علـی صـالح و کـاك شـاخەوان لەکۆبوونەوەیەك بە تێروتەسەلی بۆیان بـاس کـردین بـەلام مـن ئـەو کاتـە گووتم" خۆزیا نەچووبوونایە چونکە شوێنەکەی زۆر سەختەو دوژمنـی زۆر لـێ یە،کاك شاخەوان گووتی" بەڕاست کوردە خۆ تۆ زۆر شـارەزابووی لـەوێ بۆچـی نەچووی،منیش گووتم" کاك شاخەوان من لەڕێگا کاك سعدی گێڕامیەوە ئەگـەر نا لە گەڵ بووم.

مانگی (١٩٧٨/٤)هێزێك لە قەندیلەوە بەرەو سێ سنوری (عێراق – ئێـران – تورکیا) بەڕێ دەکەون ، کە پێشو تریش سەرکردایەتی یەکێتی لەو شـوێنە بـوو هێزە کە زۆربەیان بێ چەك بوون،ئەو کاتە ڕژێمی عێراق سەر قاڵی ڕاگواستنی گوندەکانی سەر سنور بـوو بـۆ ئۆردوگـا زۆرە ملێکـان کـە خۆیـان دیـاری یـان کردبوو،لەچاو قەندیل ئەو ناوچەیەی ئەوان بـۆی دەچـوون گـەرم تربـوو بـۆ گەشەکردنی( یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) ناوچەیەکی شاخاوی بـەهێز بـوو پێگەیەکی باشتر بەرجەستە دەبوو،یـەکێتی نیـشتیمانی کوردسـتان سـاڵێك و

چەند مانگێك بوو شۆڕشی نوێی هەڵگیرساندبۆوە ،لەلایەك بەهۆی جیهان بینی و ڕێبــازە سیاســیەکەی‌ودژایەتی کــردن و هــەوڵی بــە بــابردنی هــەموو بزووتنەوەیەکی ڕزگاری خوازی کورد، لەلایەکی ترەوە دەوڵــەتانی دەورو بــەری کوردستان، کە کوردستانیان بەسەر دابەش کــراوە کەوتنــە سیم بەنــدکردن و دارشتنی پیلان بۆ لێدان و کوژاندنەوەی سەر هەڵدانەکە بــۆ ئــەم مەبەســتەش بەکرێ گیراوانی میللەتەکەمان وەك دەسکەلای هێزێکی چەواشە خرانە مەیدانی جێ بەجێ کردنی پیلانەکەو گورز وەشاندن لــەهێزەکانی ( یــەکێتی )،یــەکێتی لەسەر پرنسیپی باوەڕ بوون بەکۆمەلانی خەڵکی کوردستان سەرەتایەکی تازەی بــۆ شۆڕشــی نــوێ داهێنــابوو نــەك هــەر بــووە نیگــەرانی دەوڵــەتان بــەس، بەڵکوتاڕادەیەکیش زارە تەرەکەی کردبوون ،سەرباری بــوونی دەیــان نــاکۆکی سنوری،مێژویی، ئابوری،سیاسی،دینی نێوانیان بۆ خەفەکردنی گڕی تێکۆشانی کورد چەندین پرۆتۆکۆل ژێر بەژێرو چەند قۆڵی قــەولیان لــەنێوان خۆیــان دا مۆر کردبوو جگە لەبە هێز کردنەوەی نا حەزان و کردنەوەی بنکەو بارەگا بۆیان لەناو خاکی ( تورکیــا و ئێــران ) چــەکدار کردنیــان ورێ پێــدانیان لەجەولــەو هەڵسوکەوتیان یارمەتی دانیان لەبارەی زانیاری و شتی تــر کــە پێویــستە بــۆ کوشتن‌و داوخستنی پێشمەرگە،هەموودەزگاکانی ســاواك ومیــت یارمــەتی دەری دەزگای ( C.I.A ) وموخابەراتی کەهەموویان پێیان خۆش نەبوو هێزێکــی وەك یەکێتی سەربەخۆ گەشەبکات ومەترسی بخاتــە ســەر بەرژەوەندیــەکانیان ولــە ئایندەکی نزیــك دا کەدەســتی شۆڕشــەکە نەســتور بــوو ناوچــەی ئــازاد کــراو لەوناوەندە دادەبڕێ.

بەلام لەبەر نەبوونی شارەزایی لەوناوچەیە لەلایــەن هێزەکــانی خۆمانــەوە هەر لەسەرەتاوە کەوتنە بــەر ڕەحمــەتی هێرشــی فرۆکــەکانی ڕژێمــی عێــراق وپەلاماری هێزەکانی پارزداران وبرسیەتی و کە سیرەبوون لەسەرمان ونــەبوونی

هیچ دەزگایەکی پەیوەندی کردن بەیەکەوە ،باوەڕکردنی سەد لەسەد بەبەڵێن وقسەکانی حیزبی( دە دەکا ) وچوونە قوڵایی ناوئارازی تورکیاوە کەبووە مایەی شکست خواردنی هێزەکانمان، قیادەی مۆقەتە توانیبوویان لەگەڵ خێڵە عەشایرەکانی کوردستانی تورکیا بەتایبەتی( گەردی ) جێ بۆ خۆیان زامن بکەن ودروشمی ئەنفالیان فێربکەن ( سەر بۆ ئێمەو ماڵ بۆئێوە ) وایان فێرکردبوون کەهێزەکانی ( یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ) بۆ لەناو بردنی کورد هاتوون، خێڵە دواکەوتوەکان زۆردڕندانە دەکەونە شەڕ دژی هێزەکانی ( یەکێتی نیشتیمانی کوردستان )،نالەباری جوگرافیاش لەناوچەکانیان خاڵێکی تری یارمەتی دەربوو بۆ زەبر وەشاندن لە هێزەکانمان.

کاتێك هێزەکان بەڕێ کەوتن٤/٢٩ هێزەکانی ئێران بەتۆپی دوور هاوێژ تۆپبارانی هێزەکەی ئێمەیان کرد بوو،فڕۆکەکانی عێراقیش جەولەیان دەکرد، ٥/٥ لە چیای کێلە شین شەڕەکی سەخت لەگەڵ هێزی عێراقی کە فڕۆکەکان و هەلی کۆپتەرجەیشیان لەسەر ڕێگای هێزەکەی ئێمە دانابوو هەر لەوێ چەندین شەهیدو بریندارلە هێزەکە کەوتەوە هەرلە( ٥/١١ ) یش بۆجاری دووەم لەناوچەی برادۆست هێرشەکی تر چووبوونە سەر کاروانی پێشمەرگەکان ڕۆژی دواترهێزیکی بەر بلاو لەسنوری عێراق تورکیا لەلایەن ڕژێمەوە کرابووە سەرهێزەکەی ئێمە نزیکەی( ٢٣ ) ڕۆژ هێزەکانی یەکێتی بەشەڕکردن وبێ نان خواردن پێیان نەکرابوو هیچ پشوویدەن، سەرەڕای سەرماو برسیەتی و نەبوونی چەك زیاتربوونە هۆ کەبچنە ناوەوەی سنوری تورکیا بەهیوای ئەوەی کەزووتر بگەن بەچەك وتەقەمەنی وخواردن ،لەهێرشە بەردەوامەکانی ڕژێمی عێراق کەلە پێشەوە باسم کرد دوور بکەونەوە، میت وقیادە مۆقەتەو خێڵە دوا کەوتووەکانی تورکیاش کەبۆیان لەکەمیندابوون، لە( ٦/١٩ )زنجیرەیەك شەڕو کوشتار لەناو کوردستانی تورکیا لەلایەن ئەوان و هێزەکانی یەکێتی

نیشتیمانی کوردستان ڕوویدا ئەگەر چی هێندێك لە هێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بە فەرماندەیی فەرماندەی قارەمان دکتۆر خالید و شێخ حوسێن بابە شێخ گەیشتبوونە شوێنی مەبەست، چەك و تەقەمەنی و بڕێك پارەیان لەگەڵ خۆیان هێنا بۆوە، بەلام لەگەڕانەوەدا کەوتنە بەر پیلانی ئەم خۆفرۆشانە ،لەشەڕێکی بێ وێنەدا ژمارەیەك لە پێشمەرگەکان شەهید بوون و بەشێکیشیان بەدیلی کەوتنە بەر دەستی قیادە مۆقەتە کە دوا تر بەدیلی ئەمانیشیان ڕەمی کرد بوو ،ئەو پێشمەرگانەی توانیبوویان لەم شەڕە دەربازیان بێت و بگەڕێنەوە ناو ڕیزەکانی خۆمان ،بەم شێوەیەلە کاك دکتۆر خالید دەگێڕنەوە ( کەهەواڵی شەهید بوونی جەوهەر سعید بە دکتۆر خالید ڕادەگەێنن کە برایەتی ،دکتۆر خالیدیش ناگەڕێتەوە سەری و دەڵێت هیچ جیاوازی نیە لەگەڵ شەهیدەکانی تر ). هێزەکەی لەگەڵ کاك علی عەسکەریش دابوون چەند شەوورۆژێك پێش دکتۆر خالید بەهەمان شێوە لەقولایی ( تورکیا ) دالەگەڵ هێزەکانی قیادە مۆقەتەو چەکدارە خێڵەکیە دوا کەوتووەکانی کوردستانی تورکیا و قەرە قۆڵی تورك توشی شەڕێکی بێ وێنە ببوون.ژمارەیەکی زۆریان لێ شەهید ببوو هەندێکیشیان دوای تەواو بوونی فیشەك و تەقەمەنی بەدیل گیرابوون.هەکاری کارەساتێك بوو ویژدانی مێژوی هەژاند، چەند پێشمەرگەیەکیش بەنەشارەزاییوبرسیەتی ڕزگار بوونیان بۆ ڕەخساو گەڕانەوە ( جەمالی علی باپیر،ئەحمەد سۆر، محەمەدی حاجی محمود،تۆفیقی قەیسەری )، دیلەکانیش دوای سوکایەتی پێ کردن و تالان کردنیان بەزۆر تەسلیمی ڕژێمیان کردنەوە ، داوایان لەدکتۆر خالیدو علی عسکەری کردبوو کە داوایی لێ بوردن وپاڕانەوە بکەن بەلام ئەوان گووتبویان ئێمە هیچ زیاتر نینە لەو پێشمەرگانەی کە شەهیدتان کردوون ئەوانیش لەجیاتی ئەوەی ئازادیان بکەن بەداخەوە دەیانکەن بەنیشانی ئاربیجیوبیکەیسی و شەهیدیان

دەکەن( بەداخەوە بکوژانی ئەم کەڵە پیاوانە ئێستا دەسەڵاتدارن لە کوردستان ) ئەمەش وای کرد مێژووی کوردستان تا ماوە زوخاوی ڕەشی لێ بتکێت، لەزینددانی قیادە مۆقەتە کاك شێخ علی و ئازاد هەورامی لە ڕێگەی پەنجەرەیەکی بچوك ڕادەکەن دەچنە کوردستانی ئێران ماڵە شێخێکی شەمزینی ئەویش هاوکاری کردبوون تا گەیشتبوونەوە نێو زەنگ ، کاك حامیدی حاجی غالی و علی شیعەش گۆڕدرانەوە لەگەڵ ( ٢١ ) کەس کە لەبەری ڕوستێ لەلایەن کەرتەکەی کاك حاجیەوە بە دیل گیرابوون . ئەگەر چی هەکاری زیانێکی گەورەی لە یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دا بەلام لەمێژوش دا نوسرا کە سێ دەوڵەتی هەرێمی بە چاو ساغی قیادە مۆقەتە ئەو کارەیان کرد بەرامبەر ( ٨٠٠ ) پێشمەرگەی ڕوحی کوردان کەنیوەیان بێ چەك بوون بۆهێنانی چەك و تەقەمەنی ئەم ڕێگایەیان گرتبووە بەر....هەزاران سڵاو بۆ خوێنی ئەو هەڵۆ بەرزە فڕانە.

## *سادەیی وسیاسەت کوجا مەرحەبا*

لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٦ کەسەرەتای شۆڕشی نوێ یە ئێمە مقەڕی سەرکردایەتیمان لەدۆڵی گوستێ بوو لەسنوری تورکیا لە پایزی ١٩٧٧ چەندین پێشمەرگەیان لێ شەهید کردین وچەند کاروانی چەك و پارە کەچەندین دۆشکەو ئاربیجی لەگەڵ بوو لێ یان گرتین ونەیان هێشت بەدەستمان بگات بەلام نازانم بۆچی بچینەوە بەعەجەلە هێزەکان کۆ بکرێنەوەو بە بەفروباران بۆهەمان شوێن بەرێ بخرێنەوە کەبشزانین قواتی سێ دەوڵەتی زل هێز( ئێران-تورکیا-عێراق )وقیادەی مۆقەتەو هۆزەبەکرێ گیراوەکانی تورکیا قبوڵیان نیە تۆبچیتە سەرسنوروخاکی ئەوان ،بەلام ئێمە لەخوارەوە بووین بەژداری چوونی ناوچەی هەکاریمان نەکرد بەلام وەك باسم کردمن پێشتر لەولازۆر شارەزابووم

لەدەشتی هەولێربە برادەرانم دەگووت زۆرم خەمی ئەوهێزەیە کەچوونە بۆناوچەی هەکاری لەبەر ئەوەی دیسان دەڵیم من بۆخۆم بەسەرم هاتبوولەساڵی١٩٧٧ئێمە بەقیادەی بەڕێز ملازم عومەر ٣٠ پێشمەرگە چووین بۆناو خاکی تورکیا هێندێك لەگوندەکان دۆستی یەکێتی بوون قەرار بوو کاك خالید بگەڕێتەوە لەسوریا کۆمەڵەك چەك بهێنێت ئێمەش بۆ ئەوە دەچووین جگەلە چەکەکانی خۆمان قەراربوو هەر یەکەی دووتاسێ چەك هەڵ بگرین و بیهێنینەوە، بێ گومان ئەو کارە کاری وولاغی بەرزەیە بەلام ئێمەهێندە تینووی کوردایەتی بووین بۆیە بڕیارمان دابوو لە هەر وولاتێك بێت بەشانی خۆمان بیهێنینەوە، بەلام دوای ئەوەی لەچەندجێگا کەمینمان بۆدادەندراو ڕێگەیان پێ دەگرتین بەزۆری قەرەقۆڵ( پۆلیس ) ی تورك بوون ناچارئێمە گەڕاینەوە کاك خالیدیش بەخەتێکی دی گەڕابۆوە، کاك عەلی عەسکەری شێخ جەواد بێدەری ڕەوان کردبوو بۆ وەرگرتنی چەکەکان لەکاك خالید بەلام لەگەڕانەوەیان کەمینی قیادەمۆقەتە وچەکداری خێڵەکیەکانی تورکیاوقەرەقۆڵ لێیان دەدەن ،زۆربەی پێشمەرگەکان شەهید دەکەن وهەندێك بریندار‌یان بە جەواد بێدەری ڕەوان کردبۆوە بەلام کاك جەوادیان نەناسی بوو کەوا خزمی کاك عەلی عەسکەریە، کەل و پەلەکانی پێیان بوون بریتی بوون لەمانە :

١- هەشت دۆشکەی دوازدەو نیو- ملیم.

٢- پە نجا کلاشنکۆفی لیبی تاك لینگ.

٣-سەد هەزار دیناری عێراقی.

لەڕاستیدا ئەو بۆسەیە بۆگرتنی کاك خالید بوو بەلام کاك خالید پیاوێکی ئازابوو خۆی دەرباز کردبوو گەڕابۆوە سەرکردایەتی،مەکتەبی سیاسی ( یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ) زۆر زۆر مرۆڤی دڵ ساف وخاوێنی تێدابوو بەڕاستی هەرکەسێك وەك من ئاگای لەوهەموو کارەساتە هەبوایە هەر ئەوە ڕەئی دەبوو،

کەنەدەبوو ( ٨٠٠ ) کورە هەژار کە( ٤٠٠ ) بێ چەك بوون بنێرن بەرەو ئەو دۆزەخە کەهەموویان شارەزابوون لەو سنورە چ هەیە ،قیادەو قەواعیدی یەکێتیان بەم شەڕە لەناو بردجا منی دڵسوتاو کەزۆربەیان خۆشەویست وبرادەرم بوون ، بۆیە دەڵێم دڵسافی وسیاسەت کوجا مەرحەبا.

## لەسەرەتای ساڵەکانی سەرەەڵدانەوەی جوڵانەوەی رزگاری خوازی گەلەکەمان

رژێم هەموو جۆرە پیلانێکی بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی کادیرێك یان چەند پێشمەرگەیەك شەهید بکات یان دەستگیر بکات ، ماوەیەك بوو ئەوکەسانەی لەسەردزی و ڕاوڕووت یان کێشەی کۆمەلأیەتی لەزیندانەکانی رژێم بوون ، رژێم ئازادی دەکردن بۆ ئەوەی رەوانەی ناو ریزەکانی هێزی پێشمەرگەیان بکات بەبیانوی ئەوەی کەگوایە سجن بووینەو بەربووینە ، بەلأم لەڕاستیدا زۆر بەیان خۆیان دەفرۆشت ، ئنجا بەریان دەدان هەشبوو رژێم دەیخزاندە ناو ریزەکانی رێکخستن، پاش ماوەیەك کۆمەڵە خەڵکیکی بەگرت دەدا، بۆیەدەبێت ئەڵقە رۆشنبیریەکان لەتەنزیمدا کەمتر یەکتر بناسن،لەساڵی( ٧٨ ) کابرایەك بەناو لەسجن بەربببوو، بەلأم بەدەستی رژێم هاتبوو بۆدەشتی هەولێر ،نامەی پیاوێکی دیاری هێنابوو بۆ سەید کاکە، کەبیکات بە پێشمەرگە ئەو پیاوخراپە ناوی ( عیسا دەم خوار بوو ) ،شەهید رێباز کابرای دەناسی بەسەید کاکەی گووت"ئەو پیاوە وەرمەگرە پیاوێکی خراپە ،کابرا خەڵکی گوندی دووسەرەی ناحیەی قوشتەپەبوو قادر عەولأ لەگەڵ کاك عەلی ساڵح خەڵکی یەك ناوچەبوون تۆزیك بەینیان خۆش نەبوو ،لەهێزەکەی قادر مستەفا ئامر مەفرەزە بوو،قادر عەولأ حەزی دەکرد مەفرەزەکەی گەشەبکات سیراعی نێوان کۆمەڵەو بزووتنەوە زۆرتوند بوو لەدەشتی هەولێر،بۆیە لەدژی یەکتری خەڵکیان وەردەگرت ،دائیرەی ئەمنیش لەڕێگای موختارەکان ئەو هەلەی

قۆستبۆوە بۆیەعیسا دەم خوار بە پێشمەرگە وەرگیرا لەلای قادرعەولا، بەلام سەیدکاکە بەقسەی شەهید رێبازو کاك شاخەوان وچەتۆی کەریمە سوور نامەیەکی بۆنوسی بەوەبەستی عیسا دەم خوارنامەکە بەرێت بۆناو شاربۆعەشیرەتی هەرکی، دەمانچەکی پێدابوو بەلکو لێ ی بگیرێت وئیعدام بکرێ، هەر لەومانگەدا عیسا گەڕاوەوچوار چەکداری تریشی لەگەڵ خۆی هێنابوو، وەستا یونس کادیر وپیاوێکی زۆرباش بوو لەگەڵ بەکر حەمە و کاك رێباز لەگوندی ئاوماڵ چاویان بەعیسا دەکەوێت، بەلام خۆی لێ لادەدەن لێ ی ترسابوون ،چونکە ئەو بە تەنها رۆیشتبوو کە گەڕابۆوە چوار چەکداری تری لەگەڵ خۆی هێنابوو زۆربەیان برای خۆی بوون (عیسا، موسا، یاسین، سەیدیاسین، سەیدحوسێن)، بەدوای قادر عەولادەگەڕێن ودەیدۆزنەوە ،لەگەڵ ئەو دەبن بە پێشمەرگە، قادرعەولای دڵ ساف بۆنانی ئێوارەی ئەوڕۆژە لەئاوماڵ حەیوانێکیان بۆ دەکڕێ ودەعوەتیان دەکات ،گوایە مەفرەزەکەی گەشەی کردووە، مەفرەزەکەی قادر عەولا ئەوانە بوون (فارس ئەحمەد.کادیر، رەحمان رەشید، چەتۆ خورخوری، حەسەن کانی سلێمانەیی) بۆیەیانی لەگوند دەردەچن بۆشیوی (لولە) لە پشت گوندی بەردەسپی عادەت وابوو کەدەگەیشتینە ئەوشوێنەی کەبەرۆژ لێ ی دەماینەوە، هەموو دەخەوتین، تەنیا یەك حەرەس دەما، عیسا دەم خوار خۆی دادەنێ بەحەرەس وئەوانەی تریش گوایە نوستوون بەلام بەبێ دەنگی رەفیقەکانی خۆی حازردەکا ئەوبەرنامەی کە پیشتر بۆی داڕێژرابوو هەر لەوکاتە جێ بەجێیان کرد، هەریەکێکیان تەقەلە پێشمەرگەیەك دەکەن و شەهیدیان دەکەن (قادر عەولا، فارس ئەحمەد، حەسەن کانی سلێمانەیی، رەحمان رەشید) بەلام ئەوان دەترسێن وبە پەلە دەڕۆن، رەحمان رەشید چەند گوللەیەکی بەردەکەوێ بەرێکەوت نامرێت، تاکوئیستاش لەژیان ماوە و کەم ئەندامە، چەتۆش بەقۆڵ

بەستراوی تەسلیم بەدائیرەی ئەمن دەکەنەوە ، پاش ماوەیەك چەتۆش لەسێدارەدرا ،من لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك لەکۆتانەکانی سیگرتکان لەماڵی حاجی شوکر بووم،شەو گوێمان لەدەنگی تەقەکان بوو، بەرۆژەوە خۆمان حەشاردا ،ئێمە تێگەیشتین کە شتێك رویداوە ،بۆیەیانی بەهەمان شێوەی جاران گەلە کۆپتەرەك هاتن، پاش گەڕان وسوڕانێکی زۆریان گەڕانەوە ،هیچ زیانێکیان نەبوو، پرسە بۆقادر عەولاو هەڤاڵەکانی داندرا ،(قادرعەولا پیاوێکی بەتەمەن بوو خۆشەویستی جوتیارانی ناوچەکە بوو)،ئینجا پاش ئەنجامدانی ئەو تاوانە عیسا دەم خوار کرا بە ئامر مەفرەزە خاصە، دواتر دەرکەوت کە لە زیندانی ئەبوو غرێب بەو مەبەستە ئازاد کرابوو .هەزار سڵاو لەگیانی پاکی ( قادر عەولا ، حەسەن ، چەتۆ، فارس وگشت شەهیدانی رێگای رزگاری کورد وکوردستان ).

## ساڵی( ١٩٧٨ ) کارەسات زۆر بوو

هێزەکانمان هەر لە ناوچەی خۆشناوەتی بوون لەگەڵ سەید کاکە، حەوێزی مام برایم کەخەڵکی هێران بوو لێپرسراوی ناوچەی خۆشناوەتی بوو،لە صحەتدا تۆزێك نەخۆش بوو بۆ جەولە درێژەکان بەسواری وولاغ دەگەڕا،لە دێ ی کاموسەك دلشادی مام رەزا ناسراو بەکوێخا کوردۆ کەچەڵ کەخەڵکی گەرۆتە بوو لەگەڵ حەوێزی مام برایم دەکەونە کەمینی کانۆچاوشین ، هەردوو پێشمەرگەکەی لەگەڵی دا بوون بێ چەك بوون ورایان کردبووگەڕابوونەوە لای سەید کاکەو برادەران، حەوێزی کادیریش هەرلەوێ شەهید دەبێت ،حەوێز کادیرێکی باش بوو دەستی شیعر نوسینیشی هەبوو،دەنگی زۆر خۆش بوو جاروبار

گۆرانیەکانی خاڵە سێوەی بۆ دەگووتین ، هۆی شەهید بوونەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوو هۆ:-

یەکەم / ئەو نەیدەتوانی بچێتە هەموو شاخ و شوێنێك .

دووەم / سێ پێشمەرگەی لەگەڵ بوو بەناوەکانی(صباح نادر گەرۆتەیی ، عومەر تەها خەڵکی دۆڕێ- هیران، صباح زاهیر هیرانی ) ماوەیەك پێشتر بۆ چالاکی کردن چووبوونە لای بێتواتە لەگەڕانەوەیان لە پشتی گوندی چیوە لەخەودا لە ناو ئەشکەوتێك جاشەکانی بێتواتە هەرسێ کیان شەهید دەکەن، ئەو سێ پێشمەرگەیە پشتیوانێکی چاکی حەوێز هیرانی بوون کە لەدەستی دان ، لەدوایی دا کەس وکاری حەوێزهیرانی هاوولاتیەکیان کوشت خەڵکی مەندێر بوو،گوایە ئەو خەبەری داوە، بەلام دەنگوباسەکان لەرێگای تەنزیمەوە نەبوو لێ یان بوو بە کێشەی عەشایەری .

## شەهید کردنی سێ گەنج سالی ١٩٧٩

سێ گەنج بەچەکی خۆیان دێن بۆئەوەی ببن بە پێشمەرگە لەناوچەی هەولێر بۆگوندی شاخە پێسکە ، لەگوندی شاخە پێسکە تووشی برادەرانی حسك دەبن لابەلاش ڕاپۆرت بەدەستی برادەرانی حسك دەگات گوایە ئەوسێ کەسە بەدەستی رژێم هاتوون بۆناو ریزەکانی هێزی پێشمەرگە بەلام لەڕاستیدا وانەبوو (لەسەرئەوجۆرە ڕاپۆرتە ناڕاستانە بەدەیان کەس بگرە زیاتریش دە بوونە قوربانی ) ،ئەوسێ کەسە بەناوەکانی ( خالیدخولە فەتاح،کەریمان خولە فەتاح،ستار حەمە ) هاتبوون ببن بە پێشمەرگە نەك بەجاسوس ،برادەرانی حسك لەسەر ناوەرۆکی ڕاپۆرتەکان داوای چەکەکان لەوسێ کەسە دەکەن ،مەبەستی برادەرانی حسك ئەوەبوو چەکەکانیان لێ وەر بگرن تالەڕاستی

وناڕاستی ڕا پۆرتەکە دەکۆڵنەوە،ئەوسیٚ گە نجەش خـوێن گـەرم دەبـن ولـەدڵی خۆیان خۆیان بەکوردایەتی جۆش داوە خۆیان بەحەق دەزانـن بۆیـە چـەکەکان دانانێن ،مرکێش مرکێش دروست دەبـیٚ ودەبـیٚ بەتەقـە لەئە نجامـدا ئەوسـیٚ گە نجە خۆین گەرمە جوامێرە دەبنە قوربانی و شەهید دەبن ،بەلاّم پێم خۆشـە هەموو لایەك لەوڕاستیە بگەن کەبرادەرانی حسك مەبەستیان کوشـتنی ئەوسـیٚ کەسەنەبووە بەلاّم ئاوا ڕێکەوتبوو،لەمێژووی پێشمەرگایەتیش ئەمەش بەغەدر لەقەلّەم دەدریٚ .هەزاران سلاّولەگیانی پاکی ئەو سیٚ گە نجە خوێن گەرمە.

## ***ئەو کەسانەی دەنگی پێشمەرگەیان بەگوێچکەی خـەلّك ڕاگەیانـد لەسـنوری پارێزگای هەولێر***

( عەلی عەسکەری ،دکتۆر خالید ،بایز ئاغای هەباس ئاغای سەرکە پکان ، سەعدی گچکە ،سەید کاکە ،ملازم سەید کەریم ،عەلی صالّح ،قـادر مـستەفا ،حوسێن دۆشکە ،مەلای حاجی ڕەسولّ ،عەزیز کەلەکی ،عبدالرحمان سۆنەگۆلی ، مەلا بەختیـار ، جەوهەر عەزیزکوردە ، فاڕوق سدیق ، سلێمان بیرێژی ، یوسف بیرێژی ،عەزیزی ڕابییٚ ، وەسمان بەگ ،عەلی نەبی ،حەوێز هیرانی ، ئەحمەد خانی بۆلّی ، ئەحمەد کوردە ،ئەحمەد قەمبەری ،ئەحمۆ چەمرگەیی ،جـەمال کوردە ،جەلالی کوێخا ڕەفیق ،ئەحمەد سماقە ، محمد عەجەم ،کانبی چاوشێن ،خولەی برای کانبی چاوشێن ،ڕەفعەت ئاسراوبە ڕێـباز ،شـاخەوان عـەباس ،سەید حوسێن گۆمەشینی ،چەتۆی کەریمە سوور ، مشیر خـدر ،ئـەمیر ئاغـا ،قادر عەزیز ،سەرباز ئەحمەد ،قادر عەولاّی لەك ،ڕەحمان ڕەشـید ، عـەلی گاور ،حوسێن زیل ،سەید حوسێن گۆمەتالّی ،صالّح قۆڕیتانی ،حەمـە غـەفور ئاغجەلەری ،کاوە مەخموری ،سەید سـەلیم ،سـەلیم کێـشکە ، محمـد جلیـل

قۆریتانی ،صلاح قۆریتانی ،ئەحمەد کۆخا سمایل ، محمد عزیز کوردە ،ئاشتی سابیر ،جەعفەر ئەسومد ، تالیب ئەسومد ،جەوهەر گردەسۆری ،مەلا محمد (فیزواللە ) ، دلێر کانی لەلەیی ،ئەسعەد ئاومالی ،تۆفیق قەیسەری ، محێدین تیمارۆکی ، محمد زێندین ،سوورەی مارف قۆریتانی، ئەعمانە گۆج ، عەلی شەماڵ ،بەکر عەزیز سینەم ، قاسم بەردەسپی ،میرزا حمدامین (فەریق ) ، محمد عزیز قولقولەیی ، ئیسماعیل عوزیر ئاغا ،حەمیدە کوێر ،فەریق هەمزە ، فەرخ قەراجی ، شاهین عزالدین پردێی ،تاهیر کەنداری ،مستەفا گۆران ،عەلی قەڵغانی ،دلشادی مام رەزا ، محمد سێ گرتکانی ، کەماڵ هەرقل ، زیاد کچکە ،سمکۆ ، خالید ،عەلی ئاومالی ،تاهیر حەمە بۆر ، عوسمان لاوە کۆمەگرویی ، شێخە بۆلی ، ئەحمەد کورزەیی ، شێروان چەمەدەمین (ئامانج ) ، فەرەج شەوگێری ، مارف حاجی عارف ،شێخ جەواد بێدەری ، رێبواری کەریمە جاف ،سدیقی کوێخا تەها (حەمەسور) ، شفیق زاهیر ، رەفیق زاهیر ، شێروانی فتاحی سمەزریان ، ملازم حسن خۆشناو ،جمال خۆشناو ،وەستا یونس ،ئازاد خۆشناو وشێرزادی برای ،سەعدی شوشە ،کوێخا رەسولی بێتواتە ، عەزیز بەگ و دلشاد و فەرهادی کوری ،عەولا سوور ،قادر خەبات ،بەکر حەمە ،فارس خورخوری ،نصرالدین مستەفا ،جعفر حوسین ،عباس کانی سلێمانەیی ،مامەند مەنتك ، خدر سوارە ،شازاد خدر چەمرگە ،بەهرۆز کەلالی ، ئەحمەد جەمیل ) .

## *لە دوای گەرانەوەم لەئێرانەوە بۆ عێراق لەسالی ۱۹۷۹*

هەرلەگەڵ گەیشتنەوەم بۆکۆیە پاشماوەیەك چاوم بەدۆست وبرادەرانم کەوت کە ماوەیەك بوو ئەم بینی بوون رۆژێك لەمالی ئامۆزایەکم بووم بەناوی مەلا عومەرچاوم بەکاك رێبوار کەوت، رێبواری وەستا سەلام زۆر خۆش حاڵ بوو

ئەوکاتە نادی باواجی هەبوو لەکۆیە، بۆنێوارە دەعوەتی کردم چووینە نادی تا درەنگی شەو پێکەوە بووین ،جارێکی تریش لەچایخانە یەکترمان بینیەوە باسمان لەوەزعی شۆرش و پێشمەرگە کردو گووتی" بەداخەوە بۆنەوماوەیەی کەتۆلەبرادەران دابرای ئەو زۆر لەمن دڵنیابوویۆیە یەکسەر داوای لێ کردم کەلەگەڵ ئەوان کاربکەم من هەروامزانی لەتەنزیمی کۆمەڵەئیش دەکات چونکە پێشتر ئەوان بنەماڵەیەکی شوعی بوون، لەدوای چوونم بۆکۆبونەوەکە بۆماڵی ئەوان تێگەیشتم کەلەگەڵ شۆڕشگێران کاردەکەن،زۆربەی کۆبوونەوەکانمان لەماڵی کاك ڕێبوار بوو بەلام ڕێبوارو پێشرەو باوکیان نەمابوو دایکێکی زۆرئازاو شۆڕش گێڕیان هەبوو بەناوی باجی سەنیە، ماڵەکەیان لەخانوە کۆنەکانی کۆیە بوو لەناو خانوەکەیان پاشکۆیەکی تاریك وبچووك هەبوو ئەوەی شارەزایی بەماڵەکەیان نەبووایە ئەم شوێنەی نەدەدۆزیەوە سایەرێکی کارەبامان بۆراکێشابوو زۆربەی کۆبوونەوەکانمان تێدا ئەنجام دەدا وەلەزۆربەی کۆبوونەوەکان شۆڕش کاکەش بەشداری دەکرد بەلام ئەو زۆربەحەزەربوو چونکە جارێکی تر لەئیستخبارات گیرابوو لەسەرگومانی تەنزیم بەلام خۆی هیچی نەدرکاندبوو بەلگەشیان لەسەری نەببوو بۆیە بەریان دابوو ،برادەرانی کۆمەڵە کەزانیبوویان من گەڕاومەتەوە کۆیە زۆرخۆیان لێ نزیك دەکردمەوە بەتایبەتی کاك دەشتی حەمەدەمین کەئەو کاتە چاودێربوو لەشارەوانی کۆیە ئەو لەمن دڵنیابوو چونکە لەبابمانەوە خزمایەتیمان هەیە،ڕۆژێك نامەیەکی کاك فارۆقی عەلی مولودم بەدەست گەیشت کەوا لەدەشتی کۆیە ڕێبەری سیاسی بوو بەلام ئەوکاتە بەهۆی تەسلیم بوونەوەی بەشێك لەهێزەکەیان ئەوان گەڕابوونەوە سەرکردایەتی منیش لەڕێگای سعدی برای ئەحمەد برنەو دوونامەم ڕەوان کرد یەکێکیان بۆکاك ئەحمەدو ئەوەی تریان بۆکاك فاروق سلاوو ڕێزم بۆهەموو برادەران نوسی بوو بەتایبەتی کاك

ئەوشیروان کە پێش تر زۆرمنی خۆش دەویست ومزۆریش هـاوڕێ بـووین مـن لـەو رۆژەوە لەسەر هەردوو رێکخراوەکان حیساب دەکرام چونکە باسم کرد لەگەڵ کاك رێبواروبرادەرانی کارم دەکرد کەچوومە دەرەوەش برادەرانی کۆمەڵە منیان بەهی خۆیان دەزانی بەئاخیری ئەندامی هەردوولایان بووم چونکە هێزەکـان بـەزۆری کۆمەڵەبوون کادیرەکانی شـۆڕش گێـرانیش لەکەرتەکـەی مـن بەباشـی ئـیش وکارەکانی خۆیان جـێ بـەجێ دەکرد،لـەرێگای کـاك فـارووق تـوانیم لـەکاك ئەوشیروان نزیك ببمەوە تاکو ناوەندی ساڵی ١٩٨١ مـن زۆر بەچـالاکی لەگـەڵ چەند کەسێکی تر کاری رێکخراوەیمان ئەنجام دەدا ڕاسـتەوخۆ سـەر بـە کـاك ئەوشیروان بووم، هاوینی ١٩٨١ بەبڕیاری ناوەندی کۆمەڵە بەنامەی بەڕێز کاك ئەوشیروان کەنامەکان بۆ من ( ئەحمەد کـوردە ) بـەناوی دڵـسۆز، عبدالقادرامام بەناوی( هەژار )،ئازاد ڕەحمـان بـەناوی( بـێ بـەش ) هـاتبوو مـۆری ناوەنـدی کۆمەڵەی پێوەبـوو داوامـان لـێ کـرا کـەوا مهمەیـەك بکـەین وبـچینە دەرەوە ،هەرلەرێگای رێکخستنی کۆمەڵەوە برێك پارە بۆمن دابین کرا ، منیش بەو بـڕە پارەیە سێ کلاشینکۆفم کـڕی لـە مجمعـی کەسـنەزان لەعبداللـە بـۆڵی بـرای شەهیـــــــــد ئەحمەدخان،ئەوانـــە هـــەر بەبنەماڵـــە پیـــاوی شۆڕشگێڕن، چەکەکانم کڕی ،بەڵام هێنانەوەیان بۆمن زۆر زەحمەت بوو، چونکە سەیتەرەکانی ڕژێم زۆر توندبوو، بیرم لەوە کردەوە یەکێك بدۆزمەوە چەکەکانم بۆبهێنێتەوە، چوومەلای مام واحێد ووسو کەخەڵکی گوندی( مـام قلیـنج ) بـوو ، لەشۆڕشی ئەیلولیش پێشمەرگە بوو ،سەیارەیەکی خەتی کۆیە- هـەولێری پـێ بوو، هاوکـارێکی باشـی رێکخـستنەکان بـوو بۆگواسـتنەوەی بڵاوکـراوەو شـتی تر، قسەم لەگەڵ کردو ئەویش ڕازی بوو لەگەڵ خـۆم بـردم چـووینە لای کـاك عبداللە، تەکبیرمان کرد کەچۆن مـام واحێـد بەسـەلامەتی چـەکەکانمان بـۆ بهێنێتەوە بۆ کۆیە ،لەکۆیەش لەگەڵ کوێخا مەمەند قسەم کـرد کەبراگـەورەی

عەشیرەتی حەمە بایزان بوو لەکۆیە، خزمایەتی یەکی عەشیرەتیمان هەیە، پێم گووت من بەنیازی چوونە دەرەوەم با چەکەکانت لابێت تا ئەو ڕۆژەی پێویستم دەبێ، ئەویش ڕەزامەندی نیشانداو چەکەکانی لای چەتۆی کەریمە سوور دانا کەئەوکات مەفرەزەی هەبوو لەکۆیە چونکە خزمی بوو لەقسەی دەرنەدەچوو ،وەکو باسم کرد لەلایەن کاک ئەوشیروانەوە داوام لێکرا لەگەڵ هاوڕێکانم مەمەیەك ئەنجام بدەین ،لەسەرەتای ساڵی ١٩٨١ چەکەکانم وەرگرتەوەو مەمەکەمان ئەنجامدا ،(من وشەهید ئازاد(بێ بەش) ومامە قالە(هەژار)). چووینە دەشتی کۆیەو،ماوەیەك لە دەشتی کۆیەو ڕۆژهەلات ورۆژئاوای کۆیەو دۆڵی سماقوڵی دەگەڕاین بەناوی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان قسەمان دەکرد بەلام هیچ پێشمەرگەیەکی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لەناوچەکە نەمابوو هەمووی گەڕابۆوە سەرکردایەتی ،یەك دووجار تووشی تەقە هاتین لەگەڵ پێشمەرگەکانی بەکرحەمە ودلزارحسین کۆیی کە پێشمەرگەی حزبی سوسیالیست بوون،من لەڕێگای تەنزیمەوە خەبەرم وەرگرت کەوا هێزێك دێنەخوارەوە بۆدەشتی کۆیە بەناوی قوەی دەشتی کۆیە کە پێك هاتبوو لەم پێشمەرگانە(مامۆستا عەزیز ئامر قوە،فاروقی علی مەولود ڕابەری سیاسی،ئەحمەد بڕنەو بەشی عەسکەری،شۆڕش حاجی بەرپرسی تەنزیمی کۆمەڵە،ڕابەر سەید برایم بەرپرسی ناوچە،عبدالله سعید بەرپرسی تەنزیمی شۆڕش گێڕان،تۆفیق قەیسەری فەرماندەی مەفرەزە،یەکێتی مجید وسوو فەرماندەی مەفرەزە،سەلام قادر کادیر،کوێخا دلشاد فەرماندەی مەفرەزە، شەهید شەهریار فەرماندەی مەفرەزە) لەگەڵ ئەو پێشمەرگانە:-

پێشڕەو عریف برایم ـ مولود مام قلینجی، پێشڕەو عومەر ،فارس بکر، محمد عارف، جعفر حمە دەروێش،سفین عومەر،شفیق تیماروکی ،ئەمیر تیماروکی،مام

قادر تیمارۆکی ،شمس الدین ،جعفەری برای عبداللەسعید، محمد عبدالله( حمەنەفتە )،مەلاجمال مەلازیادی،مەلاعوسمانی کانی بی، غەفور حمە غریب، حمید قالەدزەیی،سعید فتح الله،ئاودێر حاجی قەلآیی،سوارە سابیرئەحۆل،ڕێبوار کەریمە جاف گۆپتە پەیی ،ڕزگارکوردە،سەلاحی مام ئەجیمی عەودارانی ،جبارعبدالله( ڕابەر)،ڕەسوڵ(کاروان ) داوای لێ بوردن لەو پێشمەرگانە دەکەم کەناویانم لەیادنەماوە.

من لەگوندی مام قلینج بووم کۆمەڵێك گەنجم بەگەڵ کەوت کەبیان کەم بە پێشمەرگە، بەوناوانە ( جەبارکریم، بەهرام ڕەشید، محمدکریم، شەفیق ابراهیم ) لەنزیك گوندی مام قلینج حەیوانیکمان بۆ سەربڕابوو بۆنانی ئێوارە، خاڵم ڕەشید کەباوکی بەهرام بوو پێی زانی بوو کەوا من لەو ناوەم لەگەڵ ئەو گەنجانە، ئێمە بووین بە( ٧ ) پێشمەرگە، من پێشتر دوو چەکم بە پشتی گوێ درێژ بەبەهرام ڕەوانەی گوندی کردبوۆوە، چەکەکانم دا بەبەهرام وجەبار، بووین بە پێنج چەکدارو دوو بێ چەك، خاڵم ڕەشید هاتە لامان، منی جیاکردەوە بەتەنها قسەی لەگەڵ کردم ،گووتی"کوڕم ئەحمەد بۆئەوە هاتم کەوا بەهرامی کوڕم ببەمەوە، بەلآم تەمەشادەکەم کەوا هەموتان بۆمن بەهرامن، بۆیە داوات لێدەکەم کەوابڕۆی بەرەو سەرکردایەتی، بەتەنها چیتر لەوناوچەیە مەمێنەوە، منیش بۆدڵنیایی خاڵم گووتم""خاڵە گیان هەرئەم شەو دەپەڕینەوە بۆ ڕۆژهەلاتی کۆیە، نامەم بۆهاتووە کەوا هێزێکی ( پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ) دەگەنە دەشتی کۆیە منیش دەڕۆم بۆلای ئەوان ،نانمان خواردو دەستی خاڵمان ماچ کردو بەڕێ کەوتین بەرەو ڕۆژهەلاتی کۆیە، لەجادەی کۆیە تەق تەق پەڕینەوە، شەو چووینە گوندی شیلە، هەموومان لەحەوشەی ماڵی مام عەلی خەوتین ( عەلی سۆفی سمایل کۆمەڵێك کوڕی هەبوو لەقەدیمەوە خەڵکی مام قلینجن لەعەشیرەتی مامە

سینین،منیش دایکم مامەسینیە مام عەلی منی زۆرخۆش دەویست دەیگووت تۆ خوارزامانی ) لەنیوەی شەو هەلیساندین وگووتی" هەستن بەرێ کەون بەتەنیشت گوندی عەودالان داڕۆیشتین لەتەنیشت گوندەکە گردێکی بەرزی لێ یە لەسەرگردەکە دانیشتین ئاوشاری کۆیەمان لێوە دیاربوو،لەوێ حیکایەتێکم بۆبرادەران گێڕایەوە گووتم" لەشۆڕشی ئەیلول دوو پێشمەرگەمان هاتبوونە ئەوگوندە بۆئەوەی کەس وکاریان ببینن ئەوکاتەی حیزبی شوعی لەگەلْ ڕژێم بوون چواردەوری ئەو گوندە دەگرن وئەو دوو پێشمەرگەی ئێمە دەست گیردەکەن وتەسلیم بەڕژێمیان دەکەن ، پاش ماوەیەك لەموصل ئیعدام كران، بەوناوانە( عەلی مەلا سالح،نیهادسدیق )هەردووکیان خەلکی کۆیەبوون .

پیاوێکم دەناسی لەگوندی ئەسکی کۆیە بەناوی ( حەمیدئاغا ) پیاوێکی زۆرچاك بوو ئەویش لەقەومی کوێخامەمەند بوو، بەرەبەیان بوو گەیشتینە نزیك مالی حەمیدئاغا، ئەومالانەی ئەوان پێ ی دەلێن قەیسەری، وادیارە لەزەمانی قەیسەریەکانیش ئاوەدان بووە ،لەنزیك مالی حەمیدئاغا قەرەبالغیەك هەبوو دونیا ڕوناك دەبوو، من ومامە قالە لەمالەکە نزیك بووینەوە، حەمیدئاغا مەسینەیەکی دەست دابوێ بۆئەوشوێنە هات کەئێمە خۆمان لێ مات کردبوو بۆئەوەی دەست نوێژ هەلْ بگرێت ،من بەردوکەیەکم تێگرد، جاری یەکەم دەنگی نەکرد بەلام من دوبارە تێم گرتەوە،ئینجا ئێمەی بینی، چووم بۆلای ،بەلام ئەو زۆرترسا ،منیش خۆم پێ ناساند جنێوی پێدام گووتی"ڕوحی منت برد،گووتی" هەرئێستا مامۆستاعزیزو جەماعەتم بردە شیوەشان وامزانی ئێوە پیاوی حوکمەتن، لای ئەو ئانێکمان خواردوتۆزێك شەڕە جنێوی لەگەلْ من کرد، نامەیەکم بۆکاك فارۆق نوسی ویۆم نارد، ئەوانیش زیاتر لەبەرمن بە پەلە هاتبوون بۆدەشتی کۆیە ،ئاغا وەلامی نامەکەی هێنایەوە، سواری سەیارەکەی کردین وچووینە لای جەماعەت لەگوندی شیوەشان

. پاش چاك وچۆنی ویەکتر ماچ کردن من زۆربـەی فەرمانـدەو پێـشمەرگەکانم دەناسی بۆهەمووومان بووە رۆژێکی خۆش کەئەوەبوو یەکترمان گرتەوە لەدەشـتی کۆیە، چەند رۆژێك لەگەڵ برادەران جەولەمان کرد مـن بـەزۆری لەگـەڵ کـاك فارۆق وشۆرش حاجی دابەش دەبووم ،ئەو هێزە دووجیهازی بـچوکیان پـێ بـوو هەر لەگەڵ هاتنە خوارەوەی ئەو هێزە بۆدەشتی کۆیـە، هێـزێکیش چـوویوونە دەشتی هەولێر بەسەرپەرشتی کاك ( شاخەوان عبـاس ) ئێمـە بـۆ رۆژی دواتـر لە پشت گوندی حاجی قەلاّبووین ، شاخەوان عباس بەجیهاز قسەی کرد لەگەڵ هێزەکەی لای ئێمە، کاك شـاخەوان ئاگـای لەوەنـەبوو کـەمن لـەرێگای کـاك ئەوشـێروان هاتوومەتـە دەرەوە گـوێم لـێ بـوو بـەکاك فـارۆقی دەگــووت ( ئەحمەدکوردە ) ( ٢٠ )چەکداری لەگەڵە ،هـاتووە بۆنـاو حیزبـی سوسیالیـست ئاگاتـان لەخۆبێ زەبرتـان لێ نەدات، دیاربوو لەکۆیەوە را پۆرتێکی بەهەڵەیان دابوو بەکاك شاخەوان ،هەر لەو شاخەبووین بـەرێزمام جـەلال بروسـکەی بـۆ مامۆستا عزیز کردبوو داوای منی کردبوو،دیاربوو هەمان را پۆرتی بەهەڵەشیان گەیاندبوو بە دەستی مام جەلال، من بۆخۆم هەستم بەشتێك کرد چووینە گوندی بۆگد لەوێ گووتم" "کاك فارۆق من پێم خۆشە برۆم بۆسەرکردایەتی، ئـەویش گووتی" زۆرباشە نامە دەنوسین وشارەزایەکت لەگەڵ دەنێرین، بۆیـەیانی کـاك فارۆق بانگی کردم وزۆر ئامۆژگاری کردم گووتی" بەرێز مام جەلالیش داوای تۆی کردوە، کورێکیان لەگەڵ ناردم بەناوی ئازاد،( ئازادی ئالەعەجـەم ) بەراسـتی شارەزابوو،ئەورۆژە کورێك هاتبوو لەکەرکوکەوە تەنزیمی کۆمەڵـە بـوو نـاوی سەربەست بوو دوایی ناوەکەی بوو بەسەربەستە درێژ هەتاکو شەهید بـوو هـەر برادەربووین، لەگوندی کلێسە پەرینەوە ئازاد وولاّغێکی پێ بووجارویارمنیـشی لەرێگادا سواردەکرد چووینەوە سورقاوشان بـەبرادەرانم گـووت ئـەوەش چـەم رێزانە کەکاتی خۆی بارەگای بەرێز مام جەلالی لێ بـووە لەگونـدی تەلانـەوە

پەڕینەوە بۆقەمچوغە، بۆشەو چووینە گوندی سەرمۆرد، ئەوەی پێشمەرگایەتی کردبێ دەزانی سەرمۆرد چۆنە شوێنی خانووەکان زۆرتەلانە لەبەینی دوولوتکە شاخی بەرزە ئێواران زوو رۆژئاوا دەبێت شوێنەکەیان زۆرسەختە لەوناوچەیە گەرشتێکی بەهێزەبێت دەڵێن تەمەشای کەدەڵی ئێرەکەری سەرمۆردیانەچونکە ئێرەکەری بەهێز نەبێ لەشاخی سەرمۆرد سەرناکەوێ ،بەسەر گەڵو تێ پەڕبووین تاگەیشتینە گوندی هەڵەدن لەوێ دابەش بووین بەماڵەکان وشەومابنەوە،من لەگەڵ جەبار ( جێماو )،بەرماڵێك کەوتین خاوەن ماڵەکە ناوی فاتیح بوو زۆر خزمەتی ئێمەیان کرد، دیاربوو پیاوەکی ووریابوو لێ ی پرسیم گووتی" پلەت چیە؟ گووتم ئامرمەفرەزم ناوم ئەحمەد کوردەیە گووتی" وادیارە شۆڕشی یەکێتی لەخزمەکانی ئێمە پێك هاتووە ئەوژماردی گووتی"کاك شەوکەت،مەحمود سەنگاوی،کاك غەریب وهتد...ئەوەتۆش وەچەندکەسێکی تریش ببینم کەواهەمووتان جاڤن،جاڤەکان ئەوجارە خەمی کوردیان لەکۆڵ گرتووە، ئەوناوچەیە ناوچەیەکی ئەمین بوو، ئێمە بەرۆژ بەرێ کەوتین چووینە گوندی مالومە لەوێشەوە بۆ گوندیوولاخ لو،لەوولاخ لوو ماینەوە بەیانی بەرێ کەوتین بەرەو گوندەکانی سەفرەو زەروون، بەلاّم ئەوگوندانە لەبەر شەڕی ئێران- عێراق چۆڵ کرابوون، لەسەفرەو زەروون، ڕوبارێکی لێ یە دەبووایە بەدوبە بپەڕیتەوە،ئێمەزۆر بەزەحمەت بەو ئامێرە پەڕینەوە ئەویش ئازایەتی ئازاد بوو گەیشتینە گوندی هەرزنە لەوێش بۆگوندی بێتوش ئێمە شەو بوو گەیشتینە گوندی بێتوش ، پیاوە دینیەکان لەمزگەوت دادەنیشن کەباسی بەهەشت دەکەن بەلاّم بەڕاستی بەیانی کەهەڵساین لەخەو بەڕاستی ئەوشوێنە وەکونەو بەهەشتە خۆش بوو کەمەلاکان باسی لێوە دەکەن، ئێمە یەکەم جارمان بووکەوا دێ ی ئاوا خۆش ببینین، بۆدوای نیوەڕۆ بەرەو گوندی دەرماناو بەرێ کەوتین ئەوکاتەدەوڵەتی ئێران لەگەڵ سەرکردایەتی(ی.ن.ك)باش بوون

وسەرحدودەکان بەتاڵ بوون لەجەیش ،کەم کەم پێشمەرگەی حزبی دیموکراتمان دەبینی ،دەگەیشتینە هەر دێ یەك شورایان دانابوو لەجیاتی ئەنجومەن، ئەوان ئێمەیان دابەش دەکرد بۆنان خواردن،هەموودێ یەکان زۆرپێیان خۆش نەبوو کەوا چەکدار لەناویان بمێنتەوە،ئێمە بەوگوندانە تێپەربووین (بێوران،بێوران،کونەمشکێ ،کانی زەردوینەوخەلەفوقاسمەرەش وەناوی گوندەکانم هەندێك لەیادنەماوە).تا گەیشتینە نێوزەنگ بەڕاستی ئێمە زۆربەمان پێمان وابوو نێوزەنگ وتوژەڵە شارە کەچی بینیمان بارەگای مام جەلال لەبن دارگوێزێك بوو،وەهەندێك خانووی خراپی لێ بوو، لەقولە هەرمێ بنکەیەکی نەخۆش خانەی لێ بوو بەهەموو سەرکردایەتی سەد پێشمەرگەیەکی لێ بوو ،لەدەستەکەی بەرێز مام جەلال دوو سێ کەسم لێ دەناسین کەخەڵکی کۆیە بوون (قادر دۆشکە،ئەهرۆ عبدالباقی ،فەخرەدین ناسراویە بەرخە،ئەردەلان مەنگوری) ئەوانەلەناو ماڵەکەی بەرێز مام جەلال بوون ئەوکاتە کەمن چووم هێرۆخانیش لەوێ بوو،ناوەندی کۆمەڵە ئەوانیش تۆزێك لە پشتی نێوزەنگ خانوویکی بەقوڕیان دروست کردبوو،بارەگای ناوەندی شۆڕش گێرانیش (بەرێز کاك د.فوئاد) هەر لەوێ بوو ،کە پریکیشیان کردبوو بۆ خاڵەسەید مەجید پێیان دەگووت مقەڕی دارایی، خێمەیەکیشیان بۆکاك سەید کەریم هەڵدابوو ناویان لێ نابوو مەکتەبی عەسکەری ،هەندێك چەکداری تریشی لێ بووپێیان دەگووتن جەماعەتی هەڤاڵ خەجۆ ،ئینجا ئێمە پێشمەرگە زیادەکانمان لەمیوانخانەکە دانا من و هەژار و مام بێ بەش بەسەرکەوتین بۆناوەندی کۆمەڵە گەیشتینە بارەگای کۆمەڵە، تەماشام کرد کاك نەوشیروان لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك خەریکی دروستکردنی حەوزی ناو بوون بۆ مقەڕەکە پاش چاك وچۆنی، کاك نەوشیروان لەناو حەوزەکەبوو لەبغی دەکرد، چاوی بەئێمە کەوت زۆرخۆشحاڵ بوو، گووتی"کوردەگیان دەستم بگرە

منیش دەستم گرت هەڵم کێشایە سەرەوە ئینجا هەرسێکمانی ماچ کردو فەرمووی لێ کردین بۆ ژوورەوە ،لای من ئەوشتانە غەریب نەبوو بەڵام بۆیێ بەش و هەژار جێگای سەرسوڕمان بوو کەکاک نەوشیروان لەگەڵ پێشمەرگە کاربکات ونان بخوات ئەو کاتە بەرپرسی یەکەمی کۆمەڵە بوو،لەگەڵ من زۆر دواو گووتی" سوپاستان دەکەم نامەکانی منتان ومکوخۆی جێ بەجێ کرد رۆڵەی کۆمەڵە دەبێ وابێت ئنجا من باسی قسەکانی کاک شاخەوانم بۆگێڕایەوە پێکەنی گووتی" من دەزانم شتی خرا پتریشیان لەسەر باسکردوی بۆیە کاک نەوشیروان بەتەلەفۆنە هندرمکەی ،دووجار تەلەفۆنەکەی باداو ماوەیەکی باش قسەی لەگەڵ بەرێز مام جەلال کرد ،لەبارەی ئێمەوە زۆری قسەلەگەڵ کرد مام جەلال کەزانی ئێمە گەیشتینەولە لای کاک نەوشیروانین گووتی" بادووسێ ڕۆژ ئیسراحەت بکەن ودوایی خۆم دەیان بینم ،چەند رۆژێک ئێمە لەناوەندی کۆمەڵە ماینەوەخواردنەکانیان زۆر خراپ بوو بەزۆری نیسک و بر نجە سورە بوو ،رۆژێک تەلەفۆنی کردبوو بۆناوەندی کۆمەڵە ئەهرۆی عبدالباقی کەسکرتێری بەرێز مام جەلال بوو گووتبووی بەیانی سەعات (٩) ئەحمەد کوردە چاوپێکەوتنی هەیە لەگەڵ بەرێز مام جەلال، بەیانیەکەی سەعات ٩ پێشمەرگەیەکی کاک نەوشیروان پێشمان کەوت بۆ سکرتاریەتی بەرێز مام جەلال لەتووژەڵە ، گەیشتینەلای کاک ئەهرۆ پاش چاکوچۆنی ویەکترماچ کردن کاک ئەهرۆ گووتی" مام جەلال تەنها تۆدەبینێ گووتم" باشە، ئەو دیدارەی مام جەلال بۆمن مایەی دڵ خۆشی بوو، چونکە لەساڵی ١٩٧٧ وە کەلەدۆڵە فشە مام جەلالم بینی بوو ئیتر ئەم بینیبۆوە بۆیەئەو ڕۆژە بۆمن ڕۆژێکی خۆش بوو،گەیشتمە لای مام جەلال ،لەبن دارگوێزێک پیاسەی دەکرد پێشوازی لێ کردم، ماچی کردم ،دووقۆلی دانیشتین و پرسیاری کۆیەوخەڵکی کۆیەو ناوچەکەی لێ کردم ومنیش بەووردی جوابم دایەوە مام جەلال گووتی" دەنگ وباسی یەکێتی چۆنە

لەخوارەوە منیش گووتم" مامە گیان ئەوهێزانەی هاتوونە خـوارەوە کـوڕی زۆر ئازان بەڵام پێویستیان بەئەندامێکی سەرکردایەتی هەبوو لەگەڵیان بێـت وەك بەرپرسی یەکەم چونکە پێـشمەرگەی سوسیالیـست وشـوعی وحیزبـەکانی تـر هەموویان بەیەکەوە دەگەڕێن پێم وایە کێشە بۆ پێشمەرگەکانی ئێمـە دروسـت دەکەن ،مام جەلال بەو قسانەی من زۆر خۆشحاڵ بوو گووتی" زۆر باشە وادیارە ووشیاری( بۆچوونەکانی تۆم پێ چاکە پشت بەخوا چارەسـەری ئـەو شـتانەش دەکەین قەڵەمەکەی دەرهێناو نامەیـەکی بـۆ کـاك سـەید کـەریم نوسـی بـەم شێوەیە :

***(بەڕێز سەیدەکەی خۆم کاکە سەید کەریم بڕیارم دا وەك سکرتێری گـشتی یەکێتی ئەحمەد کوردە بکەم بەئامر مەفرەزە ئێوەش لای خۆتـان تۆماری بکەن ومیارمەتـی بۆ خۆی و هەڤاڵەکانی سەرف بکەن بۆسێ مانگ).***

نامەکەم وەرگرت وماڵ ئاوایم لەمام جەلال کردو هاتمەخوارەوە، هـەژارومام بێ بەش لای ئەمرۆ ڕۆیشتبوون خۆیان لە پەنا بەردێك مات کردبوو چونکە مـن زۆرم پێ چوو لای مام جەلال ، وایان زانیبوو مام جەلال منی حجزکردوە، بـەلام مام جەلال گووتـی" پاش ماوەیەکی تر برۆ بـۆ خـوارێ هەنـدێك کـوڕی گـەنج لەگەڵ خۆت بهێنە چەکیان بۆدەکرم و دەتـان نێرمەوە خوارێ،لەگەڵ مامەقالەو بێ بەش هاتینە خوارێ چووینەلای خێمەکەی ملازم سەید کەریم، ئەویش چاوی بەمن کەوت وزۆر خۆشحاڵ بوو گووتی" : نامەی مام جەلال بەسەرچـاو ئـەویش نامەی دامێ بۆ خاڵە سەید مەجید بەرپرسی دارایـی یـەکێتی ، خاڵـە سـەید مەجید زۆر بەخێرهاتنی کردین ومووچەکانی بـۆ سـەرف کـردین و پـارەی دوو چەکیشی بۆ سەرف کردم ،چووم لەقاسمەڕەش کریم( قاسمە ڕەش ،فرۆژگایەکی گەورەی لێ بوو هەموو جۆرە شتێکی لێ بەدەسـت دەکـەوت )، لای خاڵـە سـەید مەجید چاوم بەو پێشمەرگانە کەوت (شۆڕش سەید مەجید ،بارزان مراد ،شۆڕش

مراد، شەعبان کێلە خوارەیی )، بەڵام بەداخەوە هەرلەدوای مـن لەدەشـتی کۆیـە هێزەکەی مامۆستا عزیز دەچـنە ناوشـاری کۆیـە بـۆ تـەمبێ کردنـی بەعسی وخۆفرۆشان پاشی چوار سەعات شەڕکردن ،ئەحمەد بڕنـەوو یـەکێتی مەجیـد لەناوکۆیە شەهید دەبن چەند پێشمەرگەیەك ومامۆستا عزیز برینـدار دەبـن، بارزان مراد پێ ی گووتم" جەوهەری عومەری عەلی یە گۆج لەگەڵ خاڵە سەید مەجید بەدەمەقاڵ هاتووە مام جەلال سجنی کردوە هەر ئەوکاتـە سـەردانێکی کاك جەوهەرم کرد لەسجن لای عەلی شەماڵ، ئەو بەرپرسی سجن بـوو، عـەلی شەماڵ ونەعمانە گۆج ماوەیەك لەناوچەی کۆیە بـوون زۆربـرادەری جەوهـەری برام بوون، کەزانی من برای جەوهەرم زۆرخۆشحاڵ بوو لەگـەڵ کـاك جەوهـەر نامەیەکیان بۆکاك ئەوشـیروان نوسـی وەك پـشتیوانی کـردن لەمن،گەڕامـەوە بۆناوەندی کۆمەڵە بۆلای کاك ئەوشیروان نامەکەم دایەو ئەوشتانەشم هەموو بۆ گێڕایەوە ئەویش ڕەئیەکەی مام جـەلالی پـێ بـاش بـوو گـووتی" ئـەوهێزەی خوارێمان توشی شکست هاتوون بەڵکو تۆ هێزێك دروست بکـەی جێگـای ئـەوان بگریتــەوە لــە ١٩٨١/٨/١٧ مــن جەولەیــەکی ســەریعم کــرد بۆدەشــتی کۆیەوخۆشناوەتی دەوروبەری ١٥ رۆژمان پێ چوو دەوری دە گـە نجم کـۆکردەوە، بە پەلەگەڕامەوە بۆسەرکردایەتی ئەوجارەیان بـەبناری قەنـدیل گەیـشتمەوە سەرکردایەتی ،لە سەرکردایەتی دەورەیەکیان کردبۆوە پێیـان دەگـووت دەورەی مالیمۆس هاوڕێیەکانم ئەوانەی لەگەڵ خـۆم هێنـابوون داخیلـی دەورەکـەیان کردن دەورەکە دەورەیەکی ( سەربازی، فکری ) وشارەزابوون بوو بۆ بـەکارهێنانی چەك، یەکێتی نیشتمانی هەر لەسـەرەتاوە حـەزی بـەهێزی نیزامـی دەکـرد، بەداخەوە لـەوێ هـەواڵی شـەهیدبوونی جـەمالی عـەلی باپیرمـان زانـی کـە چوویبوونە ناوچەی سەرگەڵو بەمەبەسـتی جەولـەکردن، لەگونـدی سـێ کـانی دانیشتنێکی لەگەڵ شێرکۆ شێخ عەلی کەجەماعـەتی حیزبـی سوسالیـست بـوو

کردبوو ،چەند رۆژێك پێشتر لەلای هەڵەدن پێشمەرگەیەکی ئێمەیان شەهید کردبوو، یەك دوو پێشمەرگەشیان چەك کردبوو ،دانیشتنەکە لەگەڵ شێرکۆ بۆئەوەبوو کەئەو کێشەیە حەل بکەن ، شێرکۆی شێخ عەلیش فەرماندەکی ئازابوو کاتی خۆی ئەمنی سلێمانی لەرێگای سیخورێکی خۆیانەوە پیلانێکیان بۆدانابوو دەستێکی قرتابوو، کاك جەمالی عەلی باپیر زۆر لەسەرخۆ گفتوگۆی لەگەڵ شێرکۆ کردبوو، بەلام تۆزەك لەدووری ئەوان برایەکەی شێرکۆ لەگەڵ پێشمەرگەکانی کاك جەمال دەبێت بەشەریان لەو حالەتە تەقەیان بۆ راناوەستێ وشێرکۆو کاك جەمالیش لەیەکتر دەدەن وهەردووکیان شەهید دەبن ،زۆریش برینداردەبن بەهەردوولا دە دوانزەك شەهید بوون بۆیە ئەوکارەساتە بۆخەڵکی ناوچەکەو یەکێتیش زۆرناخۆش بوو، چونکە یەکێتی بەرنامەی شەڕی نەبوو ،بۆیە بڕیاردرا هێزێك لەسەرکردایەتی بێتە خوارەوە بۆدۆڵی جافایەتی وسەرگەڵو وبەرگەڵو ،مەفرەزەیەکی باشیان بۆمن رێکخست لەگەڵ هەڤاڵەکانی خۆم بەسەرپەرشتی کاك مستەفا چاوڕەش ،دەستمان بەجەولە کردن کرد لەناوچەی جافایەتی تاگەیشتینە گوندی شارستێن ،ئەم پێشمەرگە قارەمانانەم لەگەڵ بوو( مام بێ بەش،مامە قالە،جەبارکریم( جێماو ) ،بەهرام رەشید ( ئامانج )،جوهەر عومەرعلی گۆج ،شەهید جەوهەرناسکە،مەمەند ناسکە ) وە دووسێ پێشمەرگەی ترکەخەڵکی ناوچەی سلێمانی بوون بەداخەوە بەس ناوی عەلیم لەبیرماوە،ئێمە هاتبووین بۆخوارەوە کاك مستە فا چاوڕەش لەگەڵ هەڤاڵ دلشاد کە کادیرێکی پێشکەوتوی شۆڕش گێران بوو بۆئەوەی لەگەڵ برادەرانی حسك کێشەکان مەیدانی چارەسەریکەین ،بەلام لەکاتی جەولەکەماندا لەگوندی شارستێن لەگەڵ بەرزایی یەکانی هەوارە بەرزە ئەوان( حسك ) خۆیان مەلاس دابوو،بەسەرپەرشتی سەیدکاکە،ئێمە لە گوندی شارستێن بووین ،سعات ٥ ی بەیانی ئەو شەوە ئەوان مەفرەزەیەك دەنێرن

بۆگوندی شارستێن وەك ئیستتلاع بۆئەوەی بزانن کێ ی لێ یەو کێ ی لـێ نیـە ، لەهەمان کاتدا مەفرەزەیەکی ئێمەش بەسەرپەرشـتی هـەڤاڵ دلـشاد چـوونە دەرموەی شارستێن ،بەسەر ئەو مەفرەزەی حسك داکەوتن،لێکیاندا،لەئە نجامدا هەڤاڵ دلشاد شەهید بوو،دواتر هەردوو مەفرەزەکەی ئێمەو حسك گەڕانەوە بـۆ شوێنەکانی خۆیان ،من لەگەڵ مەفرەزەکەم بەرەو شوێنی تەقەکان بەڕێ کەوتم ،تەرمی شەهید دلشادم هێنایەوەوگەڕامەوە بۆناودێ، لەوکاتەوە شەڕ دامـەزرا تاکو تاریکانی ئێوارە لەنێوانمان ،بۆ شـەو هێزەکـەی سـەیدکاکە لـە بـەحر پەڕینەوە بۆبەری گوندی تۆربە لەبناری چیای کۆسرەت و مەیدانی شـەڕەکەیان بەجێ هێشت، بۆ رۆژی دواتـر ئێمـە بـە شـوێنیاندا پەڕینـەوە بـەلام توشـی یەکترنـەبووین تـا کـو گونـدی چـیوەی سـەروو، ئێمـە لەگونـدی سـەردۆرەوە بەسەرکەوتین بۆبەرزایی شاخەکە کەدەکەوێتە نێوان گونـدی سـەردۆرو چـیوەی سەرو، ئەوان( حسك ) هێزەکەیان لەهەردوو گوندی چیوە دابەش ببوون ئێمـەزۆر بەئاشکرایی بۆیان چووینە خوارەوە بەلام ئەوان پاشەکشەیان کرد بەرەوچـیای هەورێ لەسەر چیای هەورێ لەگەڵ بەشێکی هێزەکـەی ئێمـە کـە قـۆڵی کـاك مـستەفا چـاوڕەش بـوو، بـوو بەشـەڕیان برادەرانـی حـسك ڕایـانکرد بـەلام دووتەرمیان لە مەیدانی شەڕەکە بەجێ هێشتبوو، یەکیان بە ناوی حسن وەرتی کە پلەی مەسئولیەتی هەبوو ئەوی تریش ناوم لەیاد نەماوە، بەداخـەوە ئێمـە چاومان بەتەرمی حسن وەرتـی کـەوت زۆربـەمان نیگـەران بـووین بـەم شـەڕە ناوخۆیی یە( براکوژی ) چونکە حسن وەرتی پیاوێکی تێکۆشەر بوو زۆر ڕقـی لـە براکـوژی بـوو بۆیـەش بـووە سـوتەمەنی شـەڕەکە، ئێمـە هێزێکـی ترمـان بەسەرپەرشتی هەڤاڵی تێکۆشەر شەهیدی فەرماندە کاك مـلازم سـەید کـەریم لەڕێی بناری قەندیلەوە بۆمەلەکان هاتبووە خوارەوە .هـەمووومان لەبالیـسان یەکترمان گرتەوە.من لەسـاڵەکانی ١٩٧٦/١٩٧٧ لەگـەڵ مـلازم سـەید کـەریم

برادەرایەتیمان خۆش بوو ئەویش کۆمەڵێك پێشمەرگەی لەگەڵ بوو کەدەمناسین (ملازم خولە ،مامۆستا بەکر،شەهید تحسین کاوانی،شەهید ڕێباز) .ئەوان بەگشتی بەلاّم زیاتر شەهید ڕێباز تەکلیفی لیّ کردم گووتی" حەز ئەکەین خۆت ومەفرزەکەت نەقلی لای ئێمە ببی ،منیش بەڵێنم پێدا،چوومە لای کاك سەید کەریم وگووتم" حەز دەکەم خۆم و مەفرەزەکەم نەقل بم بۆلای کاك ڕێبازو برادەران چونکە تەکلیفیان لیّ کردووم،کاك سەید کەریم ئەندامی سەرکردایەتی و بەرپرسی مەکتەبی عەسکەری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بوو ،یەکسەر بڕیاری نەقلەکەی خۆم ومەفرەزەکەمی دا،کاك جەوهەر عومەرو کاك جوهرناسکەو مەمەندی برای ئەوانیش داوای تیپی ۹۳ی کۆیەیان کرد وەرەقەی نەقلم بۆئەوانیش وەرگرت.

## *دیدارلەگەڵ ماڵەوەمان ساڵی ۱۹۸۱*

لەدوای دابڕانێکی دوورو درێژ لەگەڵ ماڵەوەمان ،ئەوکاتە ئێمەلەنێوزەنگ ( سەرکردایەتی ) بووین ئێمە مقەرمان لەسەربەرزایی یەك دانابوو مقەرەکەی بەرێزمام جەلالمان لێوە دیار بوو، ڕۆژێك تەماشام کرد یەکێك بۆلای ئێمە بەسەر دەکەوت کەنزیك بۆوە لێمان حاتەمی خوشکەزام بوو ،ئەولەگەڵ چەند قاچاخ چیەك لەبەستەستێنەوە هاتبوو،ماوەیەکی باش بوو ئێمە لەسەر کردایەتی بووین بۆیە خزمەکانمان تەنگاو دەبن حاتەمیش هەر لەبەر ئەوە ئەو ڕێگایەسەختەی گرتبووە بەر، پاش چاك وچۆنی دەنگ وباس پرسین حاتەم گووتی" :هەرلەدوای دەرچوونی ئێوە خێزانی تۆوخێزانی مامەقالە لەگەڵ دایکی تۆودایکی مام بیّ بەش هەموویان ڕایان کردووە لەترسی دائیرەی ئەمن لەگوندی سورمقەلاّ لەدەشتی کۆیە جێگیر بووینە،حوکمەتی بەعس زۆر بیّ

بەزەیی بوون پیرێژن وگەنج ومندالی وەك یەك حساب دەکرد، حاتەم چەند ڕۆژێکمان لەلا مایەوە دواتربەهەمان ڕێگا گەڕایەوە کۆیە پیم گووت: تۆدەبێ ناوەناوە هەوالی ئێمە بزانی کەئێمەلەکوێین ویان چی دەکەین و بۆکوێ دەڕۆین بۆ ئەوەی مالٚ ومندالەکە نمان لەشوێنێك ببینین، پێشتر باسم کرد کەچۆن هاتینە خوارێ، ڕۆژێکیان لەدۆلی بالیسان لەگوندی مێرگەسەر بووین حاتەم هاتەوە بۆلامان لەمانگی ۱۰ی سالی (۸۱) برێك پارەم دا بەحاتەم گووتم" :بچۆ هەرچونێك بێت سەیارەیەك بەکرێ بگرەو ئەوژن ومندالەمان بۆبهێنە گوندی چیوە حاتەم ڕۆیشت ودوای دوو ڕۆژ هاتەوە ئێمەلەگوندی مێرگەسەر بە پێیان بەرەو چیوە دەچووین دایکم ودایکی مام بێ بەش وخێزانی من وخێزانی مامە قالەی هێنابوو، ئەوەی دەمەوێت باسی بکەم بێجگە لەحاتەم کەبۆمن دلسۆزبوو سایەقی سەیارەکە بوو کەحاتەم بەکرێی هێنابوو کە بەڕاستی پیاوەکی زۆر ئازاو بەئەمەك بوو بەرامبەر بەهێزی پێشمەرگە ناوی (تالیب بوو خەلکی کۆیەبوو برای حاجی مەلا) بوو لەگوندی چیوە کەزانی ئەوە مالی ئێمەن زۆر خۆشحالٚ بوو بەدیتنی من گووتی" ئەمزانیبوە مالٚ ومندالی ئێوەن حاتەم باسی نەکردووە نیوەی پارەی کرێ ی سەیارەکەی بۆ ڕەت کردینەوە ئەمەش نیشانەی دلسۆزی تالیب بوو بۆ هێزی پێشمەرگە ،ئینجا ئێمە مالٚ ومندالمان بۆماوەی دوو سالٚ لەگوندی چیوەی حاجی بەدیع مایەوە ، خەلکی چیوە بەڕاستی حەقی ئەوەیان هەیە نەك لەلاپەڕەیەك و دووان بەلکو لەدەیان کتێب و نوسراودا لەسەریان بنوسرێ بەرامبەر بەو هاوکاری ودلسۆزیانەی بۆهێزی پێشمەرگە پێشکەشیان دەکرد بەتایبەتی بۆ خانەوادەکەی ئێمە ،لێرەوە من زۆر سوپاسیان دەکەم چونکە خانوویان داینێ و هەواریان بۆدانان و ئاگاداری خاو خێزانی ئێمەیان دەکرد کاتێك ئێمە لەلایان نەدەبووین ودەچووین بۆ جەولە یان بۆ چالاکی کردن، سوپاس بۆ هەموو

خەڵکی چیوە بەتایبەتی ماڵی مەلا ئەکرەم ومەلا جەمیل وحاجی عزیز حاجی بەدیع ومحمد چیوەیی وکاک عزیزی سایەق و هەموو خەڵکی گوندی چیوە.

## هێنانی داودەرمانی نەخۆشخانەی (مستوصفی)کۆیە

نەخۆشخانەی مستەوصەفی کۆیە دەکەوێتە نزیک خوێندنگای قادریە لەباکووری شار،بەوناوچەیە دەگووترێ دەرگای خۆشناوان ، لەگەڵ مەفرەزەکەی خۆم کە پێک هاتبوون لەم قارەمانانە ( مام بێ بەش،مامە قالە ،جبارکریم ،بەهرام رەشید،سوادی هەولێری، رابەر ( جبار ) ، کاروان ( رەسوڵ ) ،مستەفا مەرزانی،بێ کەس ) ئێمە وەك هێزی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان چەند دکتۆرو یاریدەدەرێکی دکتۆرمان هەبوو لەناوچەی بالیسان، بەلام دەرزی ودەرمان نەبوو بۆیە هێنانی هەر نەخۆشخانەیەکی حکومی بە چالاکی ونەبەردی یەکی زۆر گەورە دادەنرا،ئێمەش زۆربەمان خەڵکی کۆیە بووین وشارەزابووین بۆیە بیرم کردەوە گووتم" بائەو چالاکیە بکەین بەبێ ئاگاداری سەرکردایەتی ،ئەوەبوو بە پێ ی نەخشەیەکی خۆم لەرۆژی ١٩٨١/١٢/١٦ خۆم ومەفرەزەکەم هاتین بۆ بردنی داودەرمانی ئەو نەخۆشخانەیە،هاتینە گوندی کێلە خوارە کە چەند کیلۆمەترێکی کەم لە سەنتەری شاری کۆیە دوور بوو چووینە ماڵی عبداللەی مام باپیر ،دوو گوێ درێژوچەند تەلیسێکمان لێ وەرگرت ،لەگەڵ دوو سێ گوریس،هاتینە خوار ، وورده وورده لەنەخۆشخانەکە نزیك بووینەوە ئێمە وامان زانی رەبایەی بەعسی لەسەرە بەلام کەتەواو نزیك بووینەوە کەشفمان کرد کەکەسی لەسەر نی یە بەلام لەسەر مەکتەبی قادریە جاش هەبوو،لەلای پشتەوەی نەخۆشخانەکە کەدەکاتە رووی چۆلی ، پشتمان داناو یەك یەك بەسەرکەوتین و ئاوابووینە دیوی ناوەوەی نەخۆشخانەکە، ئەو شەوە بارانێکی

زۆر بەگوڕ دەباری، چووینە ژوورەوەو بەگشتی کەلوپەلی ناو نەخۆشخانەکەمان کۆکردەوە ،چەند جیهازێکی فەحس وتابیعەو پێداویستی موختەبەرو داودەرمانێکی زۆر کەزیاتر لەباری گوێ درێژەکان بوو خستمانە ناوتەلیسەکان و بەکۆڵماندادا ،نەخۆشخانەکە لەگەڵ مەکتەبی قادریە تەنها ١٠-١٥مەتری نێوان بوو لەهاتنە دەرەوەمان بەسەر دیوارەکە خۆم دواین کەس بووم لەوکاتە جاشەکانی سەر مەکتەبەکە منیان بینی وتەقەیان لێ کردم بەلام بەگورجی خۆم خستە ئەودیو دیوارەکە ،گوللەم پێ نەکەوت بەلام هەندێ پارچەی دیوارەکەم بەرکەوت، بە پێشمەرگەکانم گووت کەس تەقە نەکات بابرۆین و لێرە دورکەوینەوە بارەکا نمان بە پەلە بارکردو رۆیشتین زۆر بەدڵ خۆشی گەڕاینەوە ماڵی کاك عبداللە لەکێلەخوارە،کاك عبداللە نەخەوتبوو تاکو ئێمە گەڕاینەوە کەبینی ئێمە ئەو بارانەمان بارکردوە تەنانەت بەکۆڵیش هەڵمان گرتووە، حە پەساو گووتی" بەڕاستی ئێوە پێشمەرگەن ،مام بێ بەش هەندێك باسی زەروریەتی ئەو داودەرمانانەی بۆ کرد کەهێزی پێشمەرگە چەند سوودیان لێ وەردەگرێت بۆ بریندارو نەخۆشی گوندەکان ،ئەویش کوڕێکی لەگەڵداین بۆ گوندی فەقێ یان بۆئەوەی گوێ درێژەکان بهێنێتەوە تا بەیانی حکومەت نەزانێ ئەو هاوکاری ئێمەی کردووە، ئەوکاتە گوندی فەقێیان حاجی صالح ولەتیف فەقێیانی لێ بوو،ئەوانیش زۆرپێشوازیەکی گەرمیان لێ کردین ،وولاغەکانیشمان بۆ کاك عبداللە ناردەوە،دوای پشوو دانێك وولاغەکانی مام حاجی صالحمان وەرگرت وبارەکا نمان بارکردەوەو بەرێ کەوتین بۆگوندی جەلی ،لەگوندی جەلی چەند فیرارێکی لێ بوو یەکیان ناوی نادر بوو لاماندا لای ئەوان ،بەرەبەیان بوو کەگەیشتینە لایان ،نادر زۆر نەخۆش بوو ،گورچیلەی بەژان هاتبوو لەجەلی یاریدەدەرێکی دکتۆری لێ بوو بەلام دەرمانی نەبوو، چوون بەدوایداو هێنایان ،لەودەرمانانەی ئێمە دەرمانی کرد ودەرزی

لێدا ، دواتر کەمێك دەرمانی زیادەشمان بۆ بەجێهێشت بۆکاتی پێویست ،وولاخەکانیشمان بۆ حاجی صالح ڕەوان کردەوە ئێمەش چووینەوە چیوەی سەروو بۆبارەگاکەی خۆمان ،لەوێ چالاکیەکەمان کرد بەبروسکەو دامان بە سەرکردایەتی ودواتر لە ڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان خوێندرایەوە، برادەرانی سەرکردایەتیش دەستخۆشیان لێ کردین.

## بەسزا گەیاندنی ئەسیر حزبیەك لەشەقلاوە

ئێمە وەك تیپی ٨٣ی هەورێ دەنگوباسمان هەبوو کەوا کۆبونەوەیەکی گەورە لە هوتێل پالاسی شەقلاوە لەبەرواری ( ١٩٨٢/١/١٧ ) سەعات ( ٩ ) ی شەو بەڕێوە دەچێت لە نێوان دەستەی بەڕێوەبردنی قەزای شەقلاوە ، من و شەهید تەحسین کاوانی لەگەڵ ئەو پێشمەرگە قارەمانانە ئەوەی لەبیرمە شەهید مام بێ بەش ، مامە قالە ، یاسین کاوانی ، شێرزاد کاوانی ، عبدالله چاوشین کاوانی، جەبار کەریم ،بەهرام ڕەشید، بەختیار جەمیل کاوانی ، دکتۆر ئەبەز ،سیروان ، بەگشتی نزیکەی ( ٢٠ ) پێشمەرگە دەبووین ، ئێمە لە سۆرکەکانی بەرامبەر شاری شەقلاوە هاتینە خوار شەوێکی باراناویی و بەفراویی و تاریك و سارد بوو ، شەهید تەحسین و برایەکانی شارەزا بوون بەتایبەتی شێرزادی برای ئەوان لە پێشەوە بوون ، لەبیرمە زۆربەمان پێلاوی ئەدی داسمان لە پێ دابوو بۆیە زۆر بەناو قوڕدا بەردەبووینەوە ،سەختی ڕێگاکەو بەربوونەوەو تاریکی شەوەکە بوونە هۆی بەدواکەوتنمان لە چوونە ناو شار ،هەتا خۆمان گەیاندە نزیك هوتێلەکە پێنج و پەنامان زۆر کرد ( شاری شەقلاوە بەڕۆژ سەری لێ دەرناکەی پێنج و پەنای زۆرە نەبادا بەشەوو بەقاچاغیش ) ، کەنزیکی هوتێلەکە بووینەوە بەعەسی و خۆفرۆشەکان سواری سەیارە دەبوون دیار بوو لە

کۆبوونەوەکە ببوونەوەو دەڕۆیشتن ،قەدەر وابوو ئەجەلی ئەم کۆمەڵە کەسە نەهاتبوو ،ئەدەکرا لەو کاتە تەقە بکەین چونکە تەقەی بێ بەرنامە بەزەرەری خۆمان تەواو دەبوو ، ئەوان ڕۆیشتن و ئێمەش چووینە ناو هوتێلەکە کەدوو سێ کەسی عەرەبی میسری لێ بوو خزمەتیان دەکرد من و کاک تەحسین بەعەرەبی قسەمان لە گەڵ کردن تێمان گەیاندن کە ئێمە پێشمەرگەین بەلاّم ئەوان زۆر سەر سام ببوون چونکە ڕۆیشتنی بەعسیەکان و چوونە ژورەوەی ئێمە تەنها یەك دوو دەقیقەی بەین بوو هەرچۆنێك بێت نانێکی باشمان خوارد دواتر ڕەسمەکانی صداممان شکاند خەتی تەلەفۆنەکەشمان بڕی پێشمان گووتن نێنە دەرەوە لەدوای ئێمە بۆئەوەی ئەزانن ئێمە بۆ کوێ دەچین ،لەو سەرو وەختەدا ئەو دوو پێشمەرگەی حەرەس بوون لە دەرەوە یەکیان ( بەناوی سیروان ) فیشەکێکی لە دەست دەرچوو لە قاچی خۆی دا بەلاّم دکتۆرەکەمان زۆر بە ئازایانە ڕایکێشا بۆ پەنا دارێك ( عیلاجێکی فەوری عەسکەری ) بۆ کردوبرینەکەی پێچایەوەو دەرزی لێدا ، لەوکاتەدا فلیمەکانی جیمس بۆندی ئەکتەری بەناوبانگی ئەمریکیم دەهاتە پێش چاو ، بەیەك دوو پێشمەرگە پێش دەرچوونی خۆمان لە هوتێلەکە برینداەرکەمان ڕەوانەی دەرەوەی شار کرد ، کاك تحسین گووتی" کوردە بابچین بۆ ئەو ماڵە ڕەفیق حیزبیانە هەر هیچ نەبێت دووانیان دەکوژین یان چەکیان دەکەین و تەمبێ یان دەکەین ،منیش گووتم" باشە بابچین، چووینە بەر دەمی ماڵێك کاك تەحسین گووتی" ئەوە ماڵی یەکیانە بەلاّم ئەوە کوردە منیش گووتم" باشتریش مادەم کوردەو بەعسیە تۆ پشتم بۆ دانێ بابچمە ئەو دیو دەرگاکەتان بۆ بکەمەوە ، یەکسەر پشتی داناو منیش ئاوا بوومە دیوی حەوشەکەو دەرگاکە شیش درابوو بە ئەسپایی کردمەوە کاك تحسین و هەندێك پێشمەرگە هاتنە حەوشە چووینە بن دەرگای ژورەوە لەکونی دەرگاکەوە تەماشامان کرد کابرای ڕەفیق حیزبی منداڵێکی

بچووکی لە سەر سنگی دانا بوو یاری پێ دەکرد ، بۆیە ئێمەش لەبەر خاتری ئەو منداڵە تەقەمان لێ نەکرد ،بەڵام نامەیەکمان نوسی لەبن دەرگای ژورەکە بۆمان بەجێ هێشت و هاتینە دەرەوە، دەرگای حەوشەکەشمان بەکراوەیی جێ هێشت ، لەنامەکەدا نوسیبوومان ( ئێمە پێشمەرگەین هاتینە حەوشەو ماڵەکەت کاتژمێر ( ١١ ) ی تەواو شەوی ( ١٨/١٧ ) بۆئەوەی بتکوژین بەلاّم تۆ منداڵێکت لە سەر سنگ بوو ئێمەش لەبەر خاتری ئەو منداڵە ئەمان کوشتی تۆش دەبێت دوو شتمان بۆ بکەی ئەگەر نا لەکاتێکی نا دیار دێینەوە بۆ تەمبێ کردنت :

١- سێ کلاشینکۆف بکڕی بۆ هێزی پێشمەرگە.

٢- ( وەعد بدەی کەوا هەتا لەژیانی خراپە لەگەڵ میللەتی کورد نەکەی و هاوکاری هێزی پێشمەرگەو رێکخستنەکانی بیت ).

کەلەماڵی ئەو رفیق حزبیە رەتبووین ویستمان بگەرێینەوە دەرەوەی شار یەك یەك بەدوای یەکتردا دەرۆیشتین لەسەرشەقامێك لەناکاو سەیارەیەك بەخێرایی هات ویستمان رایگرین بەلاّم زۆر بەخێرایی دەرۆیی بۆی رانەگرتین، ئێمەش تەقەمان لێ کرد سەیارەکە وەستا پێش ئەوەی ئێمەبگەینە سەر سەیارەکە یەکێك لەناوسەیارەکە دابەزی وچەکێکی فرێ داو رایکرد گەیشتینە سەرسەیارەکە مامە قالە چەکەکەی هەڵگرتەوە لەجۆری ئارپیکە بوو لەناو سەیارەکە سایەقەکە کوژرابوو ئافرەتێکیش دەگریا ،مام بێ بەش چەکمەجەی سەیارەکەی کردەوە هەویەوکەلوپەلی کابرای تێدابوو هێنای دایەدەستم تەماشام کرد کابرای کوژراوە ئەسیرحزبیشە بەرپرسی تەنزیماتی بەعسیشە لەشەقلاّوە دواتر رۆیشتین چووینە دەر لەشەقلاّوە و گەراینەوە گوندی بەرەکە ،دوایی خەڵکی شەقلاّوە خەبەریان بۆهێناین دەیان گووت :بەراستی کارێکتان کردوە قیمەتی هەرگیز تەواونابێت چونکە ئەوکەسەی کەکوشتوتانە کەسێکی گلاّو و پیس بووە شەقلاّوەتان رزگارکرد لەدەستی، ئێمەش ئەوچالاکیەماندا

بەسەرکردایەتی لەڕادیۆی دەنگی گەلی کوردستان چالاکیەکەی خوێندەوە.کابرای ڕەفیق حیزبیش کەنامەکەمان بۆیەجێهێشتبوو دوای سێ ڕۆژ چەکەکانی بۆڕەوان کردین و خاڵی دووەمیشی جێ بەجێ کرد تائێستاش لەژیان ماوە.

## گوندی سپی گرەو لێدانی ئیفەیەکی سەربازی

لەبەهاری ساڵی١٩٨٢ لە نێوان شە قەڵاوە هیران هێزێکی سەربازی پێک هاتبوو لە زرێ پۆشێك لەگەڵ ئیفەیەکی پڕجوندی هەموو ڕۆژێک پاسەوانی ئەو جادەیان دەکرد و( ها تووچۆیان دەکرد ) ئێمەلە نزیکی گوندی سپی گرە کەمینێکمان بۆدانان، هێزەکەمان پێک هاتبوو لە تیپی ٨٣ی هەورێ بەم شێوەیە دابەش بووین ،( شەهید تەحسین کاوانی لەگەڵ شەهید ملازم خولە لە گەڵ مامۆستا بەکرو شێرزاد کاوانی و مەهدی کاوانی و شەهید ڕێبازو من ومام بێ بەش ) ئێمە داندراین بەکەمینی یەکەم بۆ لێدانی ئیفە پڕ جوندیەکە شوێنەکەی ئێمە لە بەر گوندی سپی گرە لەژێر جسرەکە بوو، ناوی جسرەکە کە دەهاتە خوار ببوو بەگۆمێکی گەورە و قووڵ ،هەر لەگەڵ ئەو کۆمەڵەی من،ڕابەر( جەبار عبداللە )م ڕەوانەی ئەوبەری جادەکە کرد ،ئەوکاتە لەمەفرەزەکەی من بوو لەمێژ نەبوو لەگەڵ کاروان نەقلی لای من ببوون ،بۆ ئەوەی ئەگەر سەیارەکە هات ئیشارەتمان بۆبکات چونکە شوێنەکەی ئێمە تا نەگەیشتبان دیارنەبوو ،کاروان و مامەقالە و عبداللەچاوشین کاوانی و چەند پێشمەرگەی تر کەمین بوون بەلای شەقڵاوەدا، یاسین کاوانی برای شەهید تەحسین ئەویش مەفرەزەیەکی لەگەڵ بوو .بەلای هیرانەوە بەڵام وابڕیار بوو سەیارەکە بگاتە ڕاستی ئێمە ئینجا لێ ی بدرێ ، یەك ئاربیجی مان هەبوو

ئەویش لای ئێمە بوو سەیارەکە هات ،ڕابەر ئیشارەتی داینێ ملازم خولە ڕایکرد بۆلێواری جادەکە و ئاربیجی یەکی لەسەیارەکەدا ئێمەش دەست ڕێژمان لێ کرد سەیارەکە کەوتە بەرجسرەکە لەناوگۆمە ئاوەکە کەوتە سەرپشت وتایەکانی بەحاڵ دیار بوو لەناو ئاوەکە دەسوڕان ،لەجوندیەکان تەنها سێ جوندی پەڕین نەکەوتنە ناو ئاوەکە باقیەکەی ترهەموویان کەوتنە ژێر سەیارەکە ئێمەش هیچ دەست کەوتێکمان نەبوو،زرێ پۆشەکەش دوورکەوتبۆوە بۆلای ڕەبیەکانی دواوە بەگرینۆفەکەی تەقەی لێ دەکردین صافیرەمان لێداو گەڕاینەوە،بەلام لەومەسافەیە ڕابەر لەو بەری جادە مابۆوە ئەوکاتە لەمەفرەزەکەی من بوو بۆیە گەڕامەوە سەر جادەکە بەجێم نەهێشت تاکو ئەویش هات پەڕیەوە وبەڕێ کەوتین بەرەو گوندی بەرەکە، زۆری پێ نەچوو دووکۆپتەر هاتن تۆپ بارانی ئەوناوچانەی کرد بەلام خۆش بەختانە هیچ زیانی نەبوو.

*ناوی پێشمەرگە قارەمانە کانی ئەم ئەبەردیە :-*

١- ملازم خولە

٢- شەهید تەحسین کاوانی

٣- شەهید ڕێباز

٤- ئەحمەد کوردە

٥- مامۆستا بەکر

٦- شەهید مام بێ بەش

٧- ڕابەر

٨- ئەحمەدە

٩- شێرزاد کاوانی

١٠- یاسین کاوانی

١١- عبدالله کاوانی

١٢- مەهدی کاوانی

١٣- رەسولْ حمدامین (کاروان)

١٤- مامە قالە

١٥- ئەحمەد مەلا

داوای لیّ بوردن دەکەم لەو پیشمەرگە قارەمانانەی ناوم لەیادنەماون.

## لیّدانی جەیشی شەعبی

لەمانگی ١٩٨٢/٣ لەگەلْ کاك ئەحمەد قەمبەری جەولەکی ناوچەی تەق تەق وگوندەکانی دەورو بەریمان کرد بۆ ئەوەی چالاکیەك ئەنجام بدەین ، چووینە نزیك تەق تەق شوێنەکمان دەست نیشان کرد لەنزیك دەواجنەکانی تەق تەق کەهەموو رۆژێك کاروانیکی جەیشی شەعبی هاتوو چۆی تەق تەقیان دەکرد، رۆژێکیان بۆسەیەکمان بۆدانانەوە، من وشەهید ئەحمەد قەمبەری لەگەلْ چەند پێشمەرگەیەك چووینە بن جسرێك کەجادەی کانی لەلەو دەواجنەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە ،سەعات (٥) بەیانی بوو تا سعات دوو ونیوی پاش نیوەرۆ ماینەوە شوێنەکەمان زۆرناخۆش بوو معەسکەرو رەبیەی دوژمنمان لیّ نزیك بوو، سەعات دوو ونیو من هاتمە دەرەوە تەماشایەکی ناودەواجنەکانم کرد بینیم سەیارەکان وابەرێ دەکەون بە پەلە چوومە خوارەوە بەکاك ئەحمەدم گووت سەیارەکان هاتن ئەوانیش بە پەلە هەستان وهاتن بۆرۆخی جادەکە ،لەوکاتەش سەیارەیەکی کانی لەلەیی هات کەلەتەق تەقەوە دەهات دەچۆوە بۆکانی لەلە ئیشارەتی بەئێمەدا وگووتی"چ دەکەن لێرە ؟؟ ئێمەش ئیشارەتمان دا پیّ ی و گووتمان" خێراکە برۆ زۆری پیّ نەچوو سەیارەکانی جەیشی شەعبی گەیشتن تەقەمان لیّ کردن و هەموویان کوژران ، چووین بۆ سەر

سەیارەکان تەنها سێ کلاشینکۆفیان پێ بوو سەیارەکانیش کە دوو سەیارەبوون لەکار کەوتبوون ، سەیارەیەکمان بە پاڵدان هێنا بۆ ڕێگای کانی لەلە بەلام شوێنەکە هەوراز بوو ئێمەش ماندو و بێ تاقەت بووین بەجێمان هێشت ، باقی هێزەکەیی خۆمان لە بەرزایی یەکی دوور لە خۆمان دانابوون چووینەوە لایان و یەکترمان گرتەوە ، دوو کۆپتەر هاتن زۆریان تەقە لە خەڵك کردو تەقەیان لە مێگەلە مەڕێك کردو نزیکەی ( ١٥ ) سەر حەیوانیان کوشت ، ئەنجام دانی ئەم چالاکیە لەو شوێنە مجازەفەیەکی گەورە بوو، دوژمن لەو باوەڕە دا نەبوو کەهێزی پێشمەرگە بگاتە ئەو شوێنە چونکە ئەوان بەداخیلی خۆیانیان دانابوو زۆر بە ئازادی هاتووچۆیان دەکرد ، دوای ئەم چالاکیە دوو ڕەبیەی سەربازیان لەم شوێنە زیاد کرد وەهەمان شوێنیان کرد بە سەیتەرە ، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ ناوچە ئازاد کراوەکان

## *چوونمان بۆ ناو هەولێر لە مانگی ٩ی ساڵی ١٩٨٢*

ئەو هێزە بەسەرپەرشتی کاك مەلابەختیار ئەویش دەستەکەی خۆی لەگەڵ دابوو پێك هاتبوون لەدە پێشمەرگە ،

تیپی ٨٦ دەشتی هەولێر/ شاخەوان عەباس

تیپی ٩٠ ی باوەجی/ ملازم سمکۆ دزەیی

ناوچەی شۆڕش گێران وکەرتی ڕێکخستنی کۆمەڵە

تیپی ٨٣ ی هەورێ /ملازم خولە

ئەو چوونەمان بۆناو هەولێر لەساڵی ١٩٨٢ بۆ دوومەبەست بوو

یەکەم/ بۆ تەمبێ کردنی جاش وخۆفرۆشان ٠

مەبەستی دووەم/ بۆ پشتگیری کردن لەڕا پەڕینی خـەڵکی کوردسـتان چـونکە ئەوکاتـە لەزۆربـەی شاروشارۆچـکەکانی کوردسـتان ڕا پـەڕین ومزاهـەراتی جەماوەری هـەبوو لـەدژی بەعـسیەکان بۆیـە لـەمانگی ٩ی سـاڵی ١٩٨٢ ئـەو هێزەمان ڕوو لە شاری هەولێر کـرد بەمەبەسـتی بەرزکردنـەوەی ورەی خـەڵکی هەولێر وبەتایبەتی زیندانیە سیاسیەکان ،لەگوندەکانی پونگینـەو باغـەمرە نەرمە و باغەمرە ڕەقەو گوندی گـەرە سـۆر ،شـەوی ٢٩ /٩ هێزەکـەمان پێـك هاتبوو لە ٣١٠ پێشمەرگە لەگوندی گەرەسۆر کۆبووینـەوە بەشـی ئـەو هێـزەی سەیارەو تراکتۆرمان لـەهاوڵاتیان وەرگـرت تیپەکـەی ئێمـە دوو تراکتـۆرمـان بەرکەوت ،لەگوندی گەرە سۆر بـەرێ کـەوتین بـەرەو بـاداوانی هـەولێر، ملازم خولەوەمن و شەهید ڕێبازو پێشمەرگەیەکی تر لەتراکتۆر لـەلای سـایەق سـوار بووین لەبەرێ کەوتن دەبووایە لایت هەڵ نەکەن بێ لایت بـڕۆن سـایەقەکەی ئێمە باش چاوی نەیدەبینی لەتاسەیەکی دا شەهیدی فەرمانـدە خۆشەویـستی پێشمەرگە ملازم خولە لەتراکتۆرەکە پەڕی وسایەقەکەش ئاگای لێ نـەبوو تـا ئێمـە هاوارمـان کـرد بەسـەر پـشتی کـەوت بـەرێ کـەوت کەوتـە شـوێنێك نەورایی( نزمایی ) بوو ملازم خولە پەراسووەکانی شکاو هەناسەی خراپ دەهات بـەلاَم ئێمـە وەك نـەریتی هەمیـشەیی پێـشمەرگایەتی خۆمـان چـەند پێـشمەرگەیەکمان لەگـەڵ بـەجێ هێـشت و گووتمـان" بیگەڕێننـەوە گونـدی پونگینە سەفەرەکەی خۆمان تێك نەدا ئێمەش مامۆستا بەکرو شەهید ڕێبازمان لەگەڵ بوو ئەوان سەرپەرشتی تیپەکەیان دەکرد تاکو لەناو هەولێر گەڕاینەوە .هێزەکا نمان دابەش کردو گەڕەکی باداوانی هەولێرمان کۆنترۆڵ کرد ماڵ بەماڵ بە دوای خۆفرۆشان و بەعسیەکان دەگەڕاین و پشکنینێکی باشمان کرد ئێمە لەناو گەڕەکی باداوان بووین لای قەبرستانی سەید مەعروف هێزێکی ڕژێم بـەرەو لای ئێمە هاتن لە سەر جـادەی سـەد مـەتری کەوتنـە نـاو بۆسـەی پێـشمەرگەوە

لەزنجیرەیەك سەیارە درا بـووە هـۆی کـوژرانی کۆمـەڵێکی باشـی خۆفرۆشـان وبەعـسیەکان ئەوشـەوە دەسـتکەوتی هێـزی پێـشمەرگە ١١ کلاشـنکۆ ف و ٢ دەمانچەو سەیارەکی حکومی بوو، لەدوای ئەوچوونەمان بۆناو هـەولێر ئـەوەی جاش خۆفرۆش بوو دوای نانی مـەغریب هـەموویان دەخـزین بۆقـوڵایی شـارو مۆڵگـەکانیان ،مەلابـەختیار چـونکە لە پێـشمەرگایەتیەوە بـوو بەفەرمانـدە لەزۆربەی شوێنەکان لە پێشەوە بوو ئاگای لەڕوداوەکان بوو ئەوەی دەمەوێ باسی بکەم پێش ئەوەی بگەینە ناوهەولێر ئاگاداری هێزی پێشمەرگەی کردەوە کـەوا ئاگاداری سەروماڵی هاوڵاتیان بن ئەو شەوە هێزی پێـشمەرگە بەسـەرکەوتویی وبێ زیان گەڕاینەوە.

## چوونمان بۆناو کۆیە

چەند ڕۆژێك لەدەشتی هەولێرماینەوە ملازم خولەش تەندروستی بـاش بـوو ئێمە هاتینە ڕۆژ هەڵاتی کۆیە لەگەڵ تیپی ٩٣ ی کۆیـە یـەك ترمـان گرتـەوە واڕێك کەوتین پێشمەرگە لەخۆپیشاندانەکانی ناو کۆیە بەژداری بکات ،تیپـی ٨٣ ی هەورێ وتیپی ٩٣ ی کۆیە شەوان نانی ئێوارەمـان لـەناو کۆیـە دەخـوارد کۆبوونەوەشمان لەگەڵ مامۆستایان وخوێندکارانی خوێن گەرم و پیاوە نیشتمان پەروەرەکانی ناوکۆیە دەکرد، لەبیرمە شەوێکیان سەردانی کاك جەوادی شەفیق ئاغا و کاك عیزەت جەمالم کرد کەلەشۆڕشی ئەیلول مەسئولی ناوچەی کۆیە بوو لەگوندی گۆپتە پە دادەنیشت هەمووما‌ن تەسکیەمان لای ئـەو دەبـرد بۆئـەوەی ببین بە پێشمەرگە ، بەبینینی ئێمە زۆر خۆشحاڵ بوو، ئێمە بۆماوەی هەفتەیەك لەدەشتی کۆیە ماینەوە شەوانیش دەهاتینە ناو کۆیە هاتنی پێـشمەرگە بۆنـاو شار ئەگـەر چالاکیـشی نەکردابایـە شـتێکی دڵ خۆشـکەر بـوو بـۆ جـەماوەر،

گەڕاینەوە بۆدۆلی خۆشناوەتی لەچنارۆکی ڕەنگین نانێکی باشمان خوارد بەبناری چنارۆکی بلباسان تاگەیشتینە دیوەخانەکەی خالۆ عەبدە لەگوندی میرسەید، ئەوشەوە لەبەرسۆپا گەرمەکەی خالە عەبدە وقسە خۆشەکانی شەومان بەسەر برد گووتی" ئەحمەد کوردە تۆم زۆر خۆش دەوێ چونکە مەردی شەهید ڕێبازیش گووتی" هیچی نەکردووە بەلام خەلکی کۆیەیەو مەدحی دەکەی ئەویش گووتی" خۆمان تێک دەگەین بەیانی زوو نا نمان نەخواردو بەڕێ کەوتین بۆگوندی جەلی ودواتربەرەو ئازەنین.
مزاهەرەکانی کۆیە بەخوێنی گەشی ئەحمەدی مام عەبال وخوشکە تەواوبوو هەزار سلاو لەگیانی پاکیان.

## هێزی پشتیوان

کەکۆشکی پاشایاتی شا ڕوخا بەهاوکاری هەموو گەلانی ئێران ، جمهوری ئیسلامی کەوتە سەرکار بەلام ئەوانیش پەشیمان بوونەوە لەگەلی کورد وەخود موختاریشیان نەدا بەگەلی کورد لەکوردستانی ئێران ،ئەو سەردەمە حزبی دیموکرات وکۆمەلەی کوردستانی ئێران چەکداریان هەبوو لەسالی ١٩٨١ شەڕەکان لەنێوان حزبی دیموکرات وکۆمەلە لەگەل جمهوری ئیسلامی هێواش هێواش لەسنوری کوردستانی عێراق نزیك دەبوونەوە بۆسالی ئایندە لە پایزی ١٩٨٢شەڕەکان گەیشتنە سەرسنور، سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان وەك هەموو رۆژە ڕەشەکان بڕیاری بەهانا چوونی دابۆحزبی دیموکرات ،ئەوکاتە من لەتیپی ٨٣ی هەورێ بووم لەگەل ئەو بەڕێزانە لەمانگی ٨ی١٩٨٢ بەڕێکەوتین بەرەو سەرکردایەتی چونکە لەلایەن کاك ئەوشیروانەوە ئاگادارکراینەوە ( بەڕێز ملازم خولە فەرماندەی تیپ،مامۆستا بەکر ڕێبەری

سیاسی، تەحسین کاوانی فەرماندەی کەرت، ڕێباز فەرماندەی کەرت، جوامێر فەرماندەی مەفرەزە، مجید میرخان فەرماندەی کەرت، مەهدی کاوانی کادیری کۆمەڵە، خالید ڕۆستەم فەرماندەی کەرت، شێخ سلێمان کادیری کۆمەڵە ) بەلام لەسەرەتادا ئێمە نەمانزانی دەچین بۆ دیوی ئێران، گەیشتینەبناری قەندیل لای ڕەزگەو مارەدوو لەوێ زانیمان کەوا هێزەکانمان بەرەو ئێران ڕەوان دەکرێن ،ئێمە لەبێدەلان ماینەوە، مامۆستا بەکرو ملازم خولە چوون بۆبارەگای سەرکردایەتی دواتر ئێمەیان نارد بۆ گوندی دۆڵەتوو لەکوردستانی ئێران، لەوێ بارەگایەکی کاتیمان دانا، وورده وورده هێزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دەهاتن بۆلای ئێمە لەدۆڵەتوو ،شەهیدی فەرماندە کاک سەید کەریم وملازم عومەر سەرپەرشتی هێزەکانی خۆمانیان دەکرد، کاک مەلا حەسەنیش سەرپەرشتی هێزەکانی حزبی دیموکراتی دەکرد، بەرەکانی شەڕیان دابەش کرد، ئێمە ڕەوان کراین بۆ میراوێ وئاڵوەتان لەگەڵ برادەرانی حزبی دیموکرات لەناو جەنگەڵەکانی میراوێ دەستی باشمان لەدوژمن دەوەشاند، کاک مەجید مەلا فەتاح بەنامەی بەڕێز مام جەلال چەند مانگێك لەوەو پێش خۆی و (٥٠ ) کەسێك لە کۆیەوە هاتبوونە ناو ڕیزەکانی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ئەوانیش شاخی کونە مشکیان پێ سپێردرابوو ، ئێمە بەرەی شەڕمان دامەزراند، برادەرانی قیادەی مۆقەتەش هاوکاری پازداران بوون جاری وا هەبوو زۆر لێکترنزیك دەبووینەوە بانگی یەك ترمان دەکرد، ڕۆژێکیان ئێمە لە خوارەوە بووین بۆ حەسانەوە کاک سەید کەریم بانگی کردم گووتی" ئێوە لەگەڵ ملازم خولەو کاک مەجید میرخان نیوەی هێزەکەتان ببەن بۆ شاخی کونە مشك بۆ بەدل کردنی مەجیدی مەلا فەتاح و برادەرەکانی ،ئێمە بەسەر کەوتین ، شوێنەکانمان لەوان وەرگرت ، هێزەکانمان دابەش کرد من لە ڕۆژهەلاتی شاخەکە قۆپی سەرەتای شاخەکەم بۆ دانرا کەرتەکەی کاک مەجید

میرخان لە تەنیشت ئێمەوە ،کاک ملازم خولە لەگەڵ کاک جوامێر ئەوانیش هەر لەدرێژەی ئەو سیل سیلە شاخە بەلاّم لەولاتر بـوون ، لەبەرەبـەیانی ( ٢١/٢٢-١٠-١٩٨٢ ) سوپای پازداران بەهاوکاری قیادە مۆقەتە هێرشـیان هێنـا ،ئێمـە تاك و نزیکی مەغریب خۆمان ڕاگرت و شەڕمان کرد بەلاّم ئەکەس هات بـەدلمان کات ئەهێزیـشمان بۆنـاردرا مـن ئاگـادار نـەبووم کـەوا بـەڕێز مـلازم خولـە گوللەیەکی قەناسی بەرکەوتوەو بردویانەتـەوە خـوارەوە چـونکە کـەمێك لـە ئێمەوە دووربوون، پاش کۆتایی هاتنی فیشەك و گوللە ئاربیجیمان ئێمە ناچار بووین شوێنی خۆمان چۆڵ بکەین بـەرەو لای کـاك مەجیـد و بـرادەران بـڕۆین ،گەیشتمە لای ئەوان تەماشام کرد کاك مەجید لەوێ نەبوو ئەویش چووبوو بـۆ لای کاك ملازم خولە ، دەهات شەو دابێـت ،بەگـشتی هێزەکـان تەقەمـەنیمان لانەمابوو لە شوێنەکەی کاك مەجید میرخان سێ پێشمەرگە مابوون بەم ناوانـە ( صلاّح حوێز، زێڕۆ ، سەردار حوسێن – ئامۆزای کاك مەجید بوو ) هەرسـێکیان خەڵکی کۆیە بوون ، سەردار بریندار بـوو منـیش چـووم بـۆلای تەماشـام کـرد شوێنەکەی زۆر خراپ بوو پازدارەکان قەناسێکیان بەرامبەر دانا بوو ، هەرچـی بچوویا بۆلای لێ یان دەدا، من گووتم" دەبێ زۆر بـەووریایی یـەوە بیهێنینـەوە بۆدیوی خۆمان ئەگەرنا قەناسەکە ئێمەش دەپێکێ ،بەلاّم وادیاربوو کاك صلاّح زۆری خۆش دەویست بۆیە بە پەلە لەسەر چۆك چوو بۆی ،قەناسێکیان لەدەستی کاك صلاّح داو ئەویشیان بریندارکرد، سەرداریش هەرلەشـوێنی خـۆی مایـەوە بەکاك صلاّحم گووت "هەربەوسیلسیلە شاخەدا بڕۆ کاك مەجیـدم بـۆبنێرە مـن لێرە دەبم سەردار بەجێ ناهێڵم،ڕۆیشت ودوای ٢٠ دەقیقە کاك مەجید گەیـشتە لام، دونیاش وورده وورده تاریك دەبوو کاك مەجید گووتی" کوردەگیان سـەردار ماوە گووتم" بەڵێ بەلاّم قەناسیان دانـاوە پـێم خۆشـە لەشـوێنی خـۆی لێـی گەڕێین تاکو تەواوتاریك دادێ بەلاّم کاك مەجید زۆرمەردانـە چـەك وتـاخمی

خۆی داناو لەسەرچۆك خۆی نزیك کردەوە لەسەردار، هێنایە ئەم دیوەو وەزعی زۆرخراپ بوو لەهەموو گیانی خوێن دەڕۆیشت ٣ گوللەی قەناسی پێکەوتبوو سەردار پیاوێکی زۆرقارەمان بوو گووتی" " تازەمن شەهید دەبم تۆزێك ئاوم دەنێ کاك مەجیدیش گووتی" " چ دەڵی ی ئاوی بدەینێ یان نا کوردەگیان؟؟ منیش گووتم" "کاکە مەجید باتەنیا دەمی تەربکەین بەلك وخوابکا بژیت وردە وردە وەزعی خراپ دەبوو تۆزێکمان ئاو دایێ زۆری پێنەچوو کاکە سەردار ماڵ ئاوایی لێکردین وشەهید بوو ئەوپێشمەرگەی لامان بووناوی زێرۆ بوو تۆزێك رقی لەخوێن بوو لەشەهیدەکان نزیك نەدەبۆوە کاك مەجید بانگی کردو گووتی" کاکە زێرۆ وەرەچەکەکانمان بۆهەلگرە کاك مەجید تۆزێك شڵەژا چونکە زۆری سەردار خۆش دەویست گووتی" کوردە گیان چی بکەین منیش گووتم" کاکەمەجید بەکۆڵی منی دادەو زێرۆ چەکەکانی هەلگرت و من وکاك مەجیدیش شەهید سەردارمان بەنۆبە هەڵدەگرت هێنامان تاکو دەشتی وەزنێ لەوێ جادەی ترەکتۆری لێ بوو ،تۆپبارانی ئێرانیش بەردەوام بوو تراکتۆرێك لەلای دۆڵە توو دەهات بۆلای کونەمشکێ دەچوو کەمقەڕی خەلفیمان لەوێ بوو دەستمان ڕاگرت ڕایان گرت و کەبینیان گیانمان بەخوێنەو شەهیدمان پێیە خەڵکی ناو تراکتۆرەکە دابەزین و شەهیدەکەمان بارکردو گەڕاینەوە بۆگوندی کونەمشکێ بۆبارەگای خۆمان دواتر شەهیدەکەمان بۆسەرکردایەتی خۆمان ڕەوان کردەوە بۆنێوزەنگ، ئێمە لەمانگی ١٠ کۆمەڵێك سەنگەری ترمان لێدابوو لە زنجیرە شاخی دەورەی گوندی دۆڵەتوو لەو سەنگەرانە ماینەوە تاڕۆژێك بەڕێز مام جەلال لەگەڵ خاتوو هێرۆخانی هاوسەری هاتن بۆسەردانمان لەبەرەکانی شەڕ لە پشتی گوندی دۆڵە توو ،هێزەکەی کۆکردینەوەو مام جەلال لەبارەی شەڕەکە وئەرکی کوردانەی پێشمەرگەکانی ( یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ) لەوماوەیەدا قسەی بۆکردین ،من پرسیارم لێکرد کەی ئەم شەڕە تەواو دەبێ

دادە هێرۆش رەسمی دەگرتین بەڤیدیۆ بەرێز مام جەلال جوابی دامەوەو گووتی" جەرمنال بەفر لەگەڵ قواتی ئێران لێکمان دەکاتەوە مەبەستی بارینی بەفرێکی زۆربوو لەراستی دا لەدوای قسەکەی مامە بەفرێکی لەرادەبەدەر باری وخەریك بوو لەسەنگەرەکان هەموومان بەبن چادرەکا نمانەوە ببین ، چەکێکی گرینۆفمان لابوو بەبن بەفرەوە بوو بۆمان دەرنەهات دەرگای چادرەکە گیرابوو هەرئەوەندەمان پێکرا پاکی بکەینەوە بۆئەوەی رێگەی هاتنە دەرمان نەگیرێ وەلەوێ وە گەراینەوە شەریش کۆتایی پێهات ، بەراستی جەرەنال بەفر بوو بەهۆی گەرانەوەی ئارامی بۆناوچەکە ئەوپێشمەرگانەی ناوم لەبیر ماینە ئەوانەن لەتیپەکەی خۆمان ( ملازم خولە ،قادردۆشکە ،ئەحمەد کوردە،شەهید رێباز ،مەجید میرخان،شەهید جوامێر، جەبارکریم ، محمود بایز،شەهید بێکەس ،مولودحەمەشەل،رێبین محمد سۆفی ،شاهۆ ، گیان پۆلا،مستەفا مەرزانی، عەریف سوادی،ئەمیر سەیدەمینی ،کاوەتەها،کاروان ،رابەر،شەهید سەردار ،زێرۆ ) داوای لێبوردن دەکەم کەناوی ئەوانەی ترم لەیادنەماوە ،کەگەراینەوە لەئێران لەجێگای ملازم خولە عبداللەی مام عەلی داندرابوو ،قادردۆشکەبوو بەجێگر منیش بەمەفرەزەکەمەوە نەقلْ بووم بۆتیپی ( ٨٦ ) ی دەشتی هەولێر بەمەبەستی بەهێزکردنی تیپەکە، بریاری کاك ئەوشیروان بوو کەلەوێ بمکەن بەفەرماندەی کەرت بەلام شەری جودی بەسەرداهات پاش ماوەیەك تاشەرەکە تەواو بوو هەر لەساڵی ٨٢ کرام بەفەرماندەی کەرت

## <u>*برالە پشت برا بێ مەگەر قەزا لەلای خودا بێ*</u>

لەهێزی پشتیوان لەکۆتایی ساڵی ١٩٨٢ کەگەراینەوە لەئێران ملازم خولەیادی بەخێر بریندار بوو رەوانەی دەرەوە کرا لەگەڵ ئێمە نەگەرایەوە. لەسەرەتای

سالی ١٩٨٣ پیاویکیان هینا بەناوی عبداللەی مام عەلی لەتەسەڕوف وجولانەوەی لەئاغا دەچوو، من مال و بارەگام لەچیوەی خواروو بوو ،ڕۆژیک لەبارەگا دانیشتبووین کاك عبدالله گووتی" کاك ئەحمەد تۆ بەقەد کەرتیکت پێشمەرگە لەگەلدایە نابیٰ چیتر تۆپێشمەرگە لەگەلّ خۆت ببەیتەوە" منیش گووتم" کاك عبدالله تۆ زرووفی من نازانی پێم خۆشە ڕەئیت وانەبیٰ ".ئەویش گووتی"من چیم گووت هەردەبیٰ وابیٰ". ئەو ڕۆژە من چوومەوە ،بۆ بەیانی هاتینەوە بۆ بارەگای تیپ لەچیوەی سەرو لەناو مەکتەبەکە بووین کاك قادر دۆشکە جیگر تیپ بوو فارۆقی عەلی مەولود ڕابەری سیاسی بوو شەهید ڕێباز فەرماندەی کەرت بوو ، بەمنیان گووت کۆبوونەوەمان هەیە منیش بەشەهید مام بیٰ بەشم گووت من کۆبوونەوەم هەیە لەگەلّ تیپ زۆرم پێناچیٰ بیمەدەرەوە دەڕۆین، کەچوومە ژورەوە ئەوان هەموویان دانیشتبوون تەنها جیگایەك مابوو بۆمن منیش چەکەکەم لەقولینچکی ژوورەکە داناو دانیشتم، کاك فارۆق دەستی بەقسە کردو گووتی" کاکە کوردە تۆ دەبیت مقەڕەکەت بینیتە ئیرە" من بەتەواوی قسەکەم لەدەمی دەرنەچوو کەبلیم باشە یان خراپە کاك عبدالله ڕایکیشا چەکەکەی وفیشەکی لەبەرناو لەسەر سینگی منی دانا بەڕاستی من لام سەیربوو چونکە شتیکی وام نەکردبوو کەوابم کوژن منیش بەدەنگیکی بەرز گووتم" چەکەکەم لە پشت خۆم داناوە بەلام تۆمادام فیشەکت سوارکرد حەقە بیتەقینی ئەگەر نا لەکوردەواری خۆمان بەکەسر بۆت حساب، دەگریٰ کەزانی من تیك نەچووم وزۆریشم حساب بۆنەو مشە وەشیاتەی ئەو نەکرد عبدالله زۆر شلەژا بەلام ئەوەی جیٰ ی سەرسوڕمان بوو هیچ کامیك لەو فەرماندانەی لەویٰ بوون قسەیان نەکرد ،بەلام پێشمەرگەکانی لەگەلّ من بوون لە پە نجەرەوە چەکیان سوارکردو ڕوویان لەژورەکە کرد لەوحالەتەعبدالله بـــــــەناچاری پاش گەز بۆوەو چەکەکەی ئەمانەت کردولەلای خۆی دانا، ئینجا هەموویان

کەوتنە پەلەقاژە ،کاك فاروق قسەی بە عبداللەی مام عەلی گووت بەلام پێشمەرگەکانی من رانەدەوەستان خەریك بوو کێشەکە زۆر گەورە ببێ ئەو کارەی عبدالله لە گەل منی کرد لەیەکێك دەکرێ کەبرای کوشتبێت! چوومە لای کاك سەید کەریم و وەزعەکەم بۆگێرایەوە کاك سەید کەریمیش زۆر بەم مەسەلەیە نیگەران بوو و گووتی" کوردەگیان کاك شاخەوان داوای تۆی کردووە بەمەفرەزەکەتەوە بچیە لای با کێشەکە گەورە نەبێ پاش ماوەیەکی تر نەقلتان دەکەم بۆ دەشتی هەولێرلای کاك شاخەوان بەفەرماندەی کەرت ،کاك سەید کەریم لەدوای عبداللەشی ناردبوو سەرنجی راکێشابوو، ئەوەش ئەنجامی بریاری سەریع ومل بەملانێ لەکاتی کارکردندا من گوێم پێنەداو لەبیر خۆم بردەوە ،لەسەر داواکەی کاك شاخەوان و قسەکەی کاك ملازم سەید کەریم نەقل بووم بۆدەشتی هەولێر با هەموو خەلکیش بزانن کەلەناوشۆرشیش ناهەقی هەبوو

## شەری مال وێرانی

لە مانگی یەکی سالی ١٩٨٣ من لەگەل مەفرەزەکەم کە پێك هاتبووین لە دوازدە پێشمەرگە ( ئەحمەد کوردە ، مام بێ بەش ، مامە قالە ، بێ کەس ، کاروان ، رابەر( جبار عبدالله ) ، جەبارکریم ، بەهرام رەشید، سوادی هەولێری ، مستەفا مەرزانی، هاوارە سوور ، خەبات حمەشەل ) جەولەمان دەکرد لە بەستی شەرغە لە نزیك گوندی نێرەگێن دوو دوو دەرۆیشتین بۆ ناو گوندی نێرەگێن سەیارەیەکی جۆری دەبل کابینە هاتە لامان و رای گرت چاك و چۆنیمان کرد ( شەهید قادر مستەفا ) بوو گووتی" هەی کەر بۆ کوێ دەچی گوندی نێرەگێن زیاتر لە پێنج سەد پێشمەرگەی سوسیالستی لێ یە جەماعەتی ئێوە ئەم شەو

لەلای ئاو ماڵ لە جەماعەتی ئێمەیان داوە ئێوە دەبێ ئیشی قۆڕ هەر بکەن ،( دوایی بۆم دەرکەوت بە پێچەوانەوە بوو )ئەوان کادیرو پێشمەرگەی ئێمەیان شەهید و چەك کردبوو بە هەرحاڵ کاك قادر پیاوەتی خۆی نواند بەرامبەر بەمن ( من و کاك قادر پێشمەرگەی لە مێژینە بووین لەگەڵ یەك زۆریش یەك ترمان خۆش دەویست ) سواری سەیارەکەی کردین و تاك و ڕاستی گوندی بەردە سپی بردین پیادە ڕێ یەك ئاوا دەبوو کاك قادر گووتی" کوردە گیان لێرەوە برۆ بەلام ئاگات لە خۆ بێ تۆ بەقسەی ئەوان مەکە چونکە ئێمە هێزەکەمان یەکجار زۆرە ئێوە دەرەقە تمان نایەن منیش سوپاسم کردو لەگەڵ مەفرەزەکەم بەڕێ کەوتین بەرەو سێ گرتکان لەوێ لەگەڵ هێزەکانی خۆمان یەکترمان گرتەوە ،(کاك قادر ئامر هەرێمی دەشتی هەولێر بوو لە ڕیزەکانی حزبی سوسیالست منیش فەرماندەی مەفرەزەیەك بووم لە ڕیزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ).

دوای چەند ڕۆژێك هەردوو لا ( جودو یەکێتی )لە بیانوو بووین،( شەهید کردنی ئەو کادیرەو چەك کردنی کۆمەڵێك پێشمەرگە بۆ ئێمە بوو بە بیانوو ) بەڕاستیش هێزی سوسیالست ئەو کات لە دەشتی هەولێر لە ئێمە بەهێز تر بوون ( دوو بەران سەری لە مەنجەڵێك جێ ی نابێتەوە ) دەبووایە یەك بۆ یەکی چۆل بکات هەموو حیزبەکانی ئەو سەردەم هەولی دەدا هەر خۆی لە ساحەکەبێ بۆیە شەڕی ماڵ وێرانی زۆر کرا ٠

لە شەوی ٦/٥ ی٢-١٩٨٣ شەڕ لەگوندی ئێرەگێن و دەورو بەری دەستی پێ کرد لە ئەنجامی ئەو شەڕە ماڵ وێرانی یە ٩ پێشمەرگەی سوسیالست و ٣ پێشمەرگەی شوعیو ٧ پێشمەرگەی ( یەکێتی ) شەهید بوو، چەندین پێشمەرگەی قارەمانی تر بریندار بوون لە شەڕەکە هەموو زۆر بەجدی لە یەکمان دەدا پێ دەچوو لەناو فەرماندەکان دەستێکی خراپ هەبوو بێ بۆ خۆش

کردنی ئاگری شەرەکە ،شـەڕی نێـرەگێن کـارە سـاتێکی دڵ تـەزێن بـوو هێـزە سیاسیەکانی ماندوو کرد ، دواتر لیژنەیەك دروست کرا لە هەندێك فەرماندەی بـەرەی جـودو یـەکێتی نیـشتیمانی کوردسـتان بـۆ بنـەبڕ کردنـی کێـشەکان ،جەولەیەکی ناوچەکەیان کرد چەندین کۆڕو کۆبونەوەیان کرد بۆ ڕیـشە کـێش کردنی ئەو دوو بەرەکیە بەلاّم بەتەواوەتیش هەر چارە سـەر نـەبوو ئێمـە وەك یەکێتی بەرەو دۆڵی خۆشناوەتی بەڕێ کەوتین و دەشتی هەولێرمان بەجێ هێشت هێزەکانی مەڵبەندەکانی تریش گەڕانەوە شوێنەکانی خۆیان ٠

## شەڕی بالیسان

وەزعی یەکێتی لەدەشتی هەولێرباش نەبوو،هێزەکانی جـود زۆر زیـاتربوون لەهێزەکانی ئێمە بۆیە کاك شاخەوان داوای منی کردبوو کەوا نەقلی تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێرببم ئەوکاتە هاوڕێ کاوە مەخموری وکاك سابیر ڕەسوڵ و ئەحمەد قەمبەری ئەوسێ کەرتـە لەدەشـتی هـەولێر هـەبوو،کاك مـلازم سـەیدکەریم مەسئولی عەسکەری مەڵبەندبوو بارەگای مەڵبەند لەبالیسان بوو بانگی منیـان کـرد،من لـەتیپی ٨٣ ی هـەورێ بـووم بـەخۆم و مەفرەزەکـەم نـەقلیان کـردم بەفەرماندەی کەرت بۆدەشـتی هـەولێر منـیش ڕازی بـووم ،هێزەکـەی دەشـتی هەولێر کاك شاخەوان و برادەران هەموویان لەمەڵبەند بوون،منیش بەگـەڵیان کەوتم،ئەو چەند پێشمەرگەیان بەگەڵمدا بۆئـەوەی کەرتەکـەی مـن لـەڕووی ژمارەوە زیاد بکـات ( جـەلال ئیلنجاغی،عەیزواللە،سـەنگەر( یـونس ) وچـەند پێشمەرگەیەکی تر )،لەناویاندا کاك جەلال بێ چەك بوو من برنەویکی زیـادم هەبوو دام بەکاك جەلال بەلاّم خەریتەکەی زۆر بۆی گەورە بوو بۆیە ڕاست وچەپ دەییەستا،بەلاّم دیار بوو کوڕێکی ئازا بوو،هەر لەو کاتە جەبهـەی شـرێمکیان

بەمن سپارد،من نزیکەی ١٨ پێشمەرگەم لەگەڵ بوو .لەکۆتایی مانگی چواری ساڵی ١٩٨٣ بەرەی جوود هێرشێکی گەورەیان کردە سەر بالیسان،کەئەوکاتە بارەگای مەڵبەندی ٣ ی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانی لێ بوو،شەڕەکە شەو ورۆژێکی خایاند .مەڵبەندی ٣ پێشمەرگەی زۆر کەم لێ بوو،چونکە یەکێتی نیازی شەڕی نەبوو .بەلاَم بەرەی جود( پارتی + حسك + حشك + پاسۆك ) بوون، هێزێکی زۆریان بۆ ئەم شەڕە هێنابوو،هێزەکەی ئێمە لەژمارە زۆر کەمتر بوو لەوان بەلاَم پێشمەرگە گیان بازەکانی یەکێتی نەیان هیشت تەنیا یەك سەنگەریش بگیرێ .بەرگریان لەسەنگەرەکانی خۆیان کرد،ئەوکاتە من ماڵم لەگوندی چیوە بوو .واجبیشم لەبەرزایی پشتی گوندی شرێمك بوو،شەهید ئەحمەد قەمبەری وکاك شاخەوان لە پشتی بالیسان لەبەرزایی یەکان بوون،مامۆستا بەکرو بەشێکی تیپی ٨٣ ی هەورێ وکەرتێکی دەشتی هەولێر کەوتبوونە پشتی گوندی کانی بەرد، کاك سابیر رەسوڵ وهەندێك پێشمەرگەی مەڵبەند بۆپشتی شێخ وەسانان .دەمەو ئیوارە بوو بینیم پێشمەرگەیەك بەراکردن دەهات بۆلام نامەیەکی ملازم سەید کەریمی پێ بوو کەتێیدا نوسرابوو "کوردە گیان وەرنە ناو دێی بالیسان شوینەکەی خۆتان چۆڵ بکەن "،چونکە ئێمە لەکاك سەید کەریم و برادەران دوور بووین .خۆم وبرادەران چووینە خوارەوە بینیم کاك سەید کەریم لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك لەناو دێ مابوون .کاك سەید کەریم زۆر غەمبار بوو گووتی" .کوردەگیان برادەرە خۆشەویستەکەی هەردوکمان شەهید بوو ( مەبەستی ئەحمەد قەمبەری بوو ) کەبەراستیش زۆر خۆشەویست ونزیکی من وکاك سەید کەریم بوو چونکە ئێمە لەساڵانی ١٩٧٧ ەوە پێکەوە پێشمەرگە بووین لەسەر یەك رێباز کەئەویش رێبازی پیرۆزی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە،من بۆ حەیدەریش نیگەران بووم کەبیستم ئەویش شەهید بووە،کاك شاخەوانیش بریندار ببوو .کەمن چووم کاك

سـەید کـەریم وبرادەرانـی گـەڵی شـەهیدەکانیان بـەخاك سـپاردبوو لـەناو دێ، پێـشتر قـادر دۆشـکە بـە دۆشـکەکەیەوە ڕەوانـی چـیای پـشتی بێـراوە کرابوو،دۆشکەکەی دامەزراندبوو ، دیاربوو تەقەی دەکرد ،بـەڵام مـن ئاگـادار نەبووم کە ئەو لەوێ یە ،لەکاك سەیدم پرسی گووتم" کاك سەید ئـەو دۆشـکە کێ یە واتەقە دەکات ؟.کاك سەید کەریم گووتی" کـێ هەیـە لـەقادر دۆشـکە زیاتر !! بەڕاستی قادردۆشـکە دەوری باشـی هـەبوو،کاك سـەید خێزانەکـەی لەگەڵ دا بوو تازەمارەی کردبوو خوشکی کـاك هـێمن بـوو ئـەویش سـەرتیپی بەرانەتی بوو ژنێکی زۆربـەغیرەت وبـەتوانا بـوو لـەڕوی فکـری وجەسـتیەوە زۆرباش بوو هیچ ترسی نەبوو بـەدەم قـسەکردنەوە پەڕینـەوە بـەرەو گونـدی بێراوە گووتم" :کاك سەید بۆ ئێمە نـاخۆش نـابێ بالیـسان بـەجێ بهـێڵین ؟ گووتی" نەخێر قسەم لەگەڵ سەرکردایەتی کردووە پـاش چـەند ڕۆژێکـی تـر هێـزی حـسك و بـەرەی جـود دەشـکێن ،دیـار بـوو ئـەو شـتیکی لـێ دەزانـی ،لەسـەرکردایەتی یـەکێتی نیـشتیمانی کوردسـتان بەسەرپەرشـتی کـاك نەوشیروان هێزێك هاتبووە خوارێ لـەبناری قەنـدیل ،سـەرکردایەتی حزبـی شوعی وبەرەی جود لەقرناقاو و پشت ئاشان بوون پاشی چوار سعات شـەڕکردن دەستیان بەسەر هەموو بارەگاو بنکەو نەخۆشخانەوسجن ودۆشکەی بەرەی جـوود داگرتبوو ،سەرکردایەتی حزبی شوعیان بەگشتی بەدیلی گرتبوو بەڵام هیچیان نەکوشتبوون ،چونکە کاك نەوشیروان خۆی لەگەڵ دابوو ڕەوانی لای بـەڕێز مـام جەلالیان کردبوون ،کاك نەوشیروان لەگەڵ مامە ڕیشەو چەند فەرماندەیـەکی تر بەڕێ کەوتبوون بەرەو دۆڵی بالیـسان ،کـاك سـەید کـەریم بـانگی کـردم گووتی" کوردە گیان تۆئەبێ ئەمشەو بچیت بۆ شاخی ئاسـنگەران کەدەکەوێتـە بەرامبەر ئاوەکەی ساوسێوکان کەلەلای وەرتێـوە دێ ی ،ئەشـکەوتێکی لـێ یـە ئەمشەو لەوێ بمێننەوە". ئێمە چووین و فەرمانەکەی کاك سەید کەریمان جێ

بەجێ کرد،من هەژدە پێشمەرگەم لەگەڵدابوو،شەو عەیزاللە حەرەس دەبێ پێشمەرگەیەکی تر ئەچێتە خوارێ بۆ سەر ئاو تۆزێك تاخیر دەبێ عەیزوال‌لە لەبیری نامینێ کەئەو چۆتە خوارەوە کاتێك دەستڕێژی لێ دەکاو بەسەختی برینداری دەکا ،لەئێمەش وابی دوژمنە هەموومان دەستمان بەتەقە کرد سەیرم کرد هیچ تەقەیەك بەرامبەرمان نەبوو یەکسەر هاوارم کردتەقە ڕاگرن ،تەقە ڕاوەستاو پێشمەرگەکەی خۆمان کەلەخوارەوە بوو هاواری کرد گووتی" کورە منتان کوشت! چووین هێنامانەوە بۆسەرەوەو دواتر لەبەر برینەکەی ناردمەوە خوارەوە بۆ مەلەکان لەوێ بنکەیەکی تەندروستیمان هەبوو،کاك نەوشیروان بەهێزێکی زۆرەوە دەوری سعات ١١ ی پێش نیوەڕۆ بوو لەلای وەرتێوە پەیدا بوو، کاك سەید کەریم بەجیهاز بەکاك نەوشیروانی گووتبوو کەمن لەسەر ڕێگامە ،کەگەیشتنە ڕاستی ئێمە پێشمەرگەیەکیان ڕەوان کرد بۆلای من بۆئەوەی بچمە خوارەوە بۆلایان ،منیش چوومە خوارەوە بۆ لایان ،بەلام یەکەم جارم بوو هێزی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەم شێوە زۆرە ببینم ،گەیشتمە لایان وکاك نەوشیروان بانگی کردم بانگی مامە ڕیشەشی کرد گووتی"ڕیشەگیان ئەوەش ئەحمەد کوردەیە ڕیشەی دەشتی هەولێرە وخۆشەویستی منە"من ومامە ڕیشە یەکترمان ماچ کردو لەو ڕۆژەوە یەکترمان ناسی،ئینجا بەرەو لای کاك سەید کەریم بەڕێ کەوتین ،بەلام هێزی جود کەزانی بوویان لەسەرکردایەتیان دراوە بالیسانیان چۆڵ کردبوو جەماعەتی مەلا محەمەد لەگەڵ شوعیەکان بەرەو ناوچەی بارزان گەڕابوونەوە ،جەماعەتی حسك بەرەو دەشتی هەولێر ڕایان کردبوو گوێ درێژو ولاغەکانی ئەو گوندانەیان زۆر بردبوو بۆ سوار بوون ،بەتەواوی بلاوەیان لێ کردو تیك شکێندران ، چووبوونە گوندی چیوە تەوزیع ببوون بۆنان خواردن سێ پێشمەرگە چووبوونە مالی ئێمە خێزانەکەم لێی

پرسی بوون بۆوا مشەوەشن گووتبوویان خوشکم دەڵێن نوشیروان مسەتەفا هاتۆتە خوارەوە شەڕمان دەکات بۆیە بالیسانمان چۆڵ کرد.

کاک ئەحمەد قەمبەری شەهید ببوو بەڕێکەوت زۆرمان ناومان ئەحمەدبوو ئەحمەدسماقەش ماڵی لەچیوە بوو منیش ماڵم لەچیوە بوو خەبەریان زانی بوو ناو ئەحمەدەك شەهیدبووە وەهەرژنەی وایزانی بوو مێردی ئەوە خێزانەکەی من لەگەڵ خێزانی ئەحمەدسماقە هاتبوون بۆبالیسان بۆسۆراخ کردنی ئێمە بەلام لەخواروی دێ توشی پیاوێکی باش هاتبوون پرسیاریان لێ کردبو لەهەواڵی ئێمە نەیهێشتبوو بچن بۆناوبالیسان دەستنیشانی گوندی بێراوەی بۆکردبوون ئەوکاتە گەیشتبوونە بێراوە من وئەحمەدسماقە لای قادر دۆشکەبووین لەسەر شاخ، کاک سەیدکەریم بەنامە من و ئەحمد سماقەی ئاگادارکردەوە کەدەڵێ :وەرنە خوارەوە هەردوکتان خێزانتان هاتووە ئەو شەوە خێزانەکانمان لەبێراوە لامان مانەوە بەلام هیچ منداڵیان لەگەڵ نەبوو من وئەحمەد سماقە ماینەوە لەبێراوە ئەوانیش گەڕانەوە بۆناو منداڵەکان لەگوندی چیوە

## پوورە قەدری و مام عوسمان

جەولەی کەرتەکەمان لەدەورو بەری گوندەکانی کونە گورگ وباغەمرە ودارەتوو وئەوناوچانە بوو یەکەم جارم بوو لەگوندی دارەتوو دابەش بووم بۆنان خواردن لەماڵێك پیاویان لەماڵ نەبوو، ئافرەتێکی ڕوو خۆش وقسەخۆش بوو تەمەنی لەدەوری ٤٠-٤٥ ساڵان دەبوو بەناوی پوورە قەدری، پاش چەند جارێك چوونم بۆ ئەوماڵە ماوەی چەند جەولەیەك لەگەڵ پوورە قەدری بووین بەبرادەر وبۆم دەرکەوت کەکەس وکاری پێشمەرگەن و پێشمەرگەشیان خۆش دەویست، ئەوکاتەی ئێمە دەچووینە ماڵەکەی پوورە قەدری خەریکی شت وەمەك و

خواردن کۆکردنەوە بوو بۆمانی حازردەکرد وەکۆمەڵێك شتی بۆئامادە دەکردین تا لەگەڵ خۆمان بیبەین هەرچەندە هەژاریش بوون، رۆژێك ویستی جلمان بۆبشوات جلێکی عەسکەری بۆپێشمەرگەیەك هێنا تا جلەکانی خۆی وشك دەبێتەوە منیش پرسیارم لێ کرد گووتم" مێردەکەت ناوی چی یەوچی دەکات ؟ گووتی" : پیاوەکەم ئەسڵەن خەڵکی کەندێناوەیە ناوی عوسمانە بەعوسمان عارەب ناسراوە ئێستا سەربازی احتیاطة لە ماوەی چەند مانگێك دوو تاسێ جار رێم دەکەوتەوە ئەوماڵە نامەیەکم لای پوورە قەدری بۆمام عوسمان بەجێ هێشت ، پوورە قەدری چوار تا پێنج منداڵی هەبوو هەموویان لە تەمەنی دە ساڵ ویازدەو دوازدە ساڵ بوون ماوەیەکی پێ چوو رێم کەوتەوە دارەتوو چوومەوە ماڵی پوورە قەدری ، پوورە قەدری گووتی" نامەکەم دابەعوسمان وزۆرکەیفی پێ هات گووتی" ئەوە ماوەیەکیشە نەهاتۆتەوە، منیش سەفەری سەرکردایەتیم کرد لەنێوزەنگ بەرێکەوت توشی مام عوسمان بووم یەکترمان نەدیووموو یەکتر ناناسین، من لەنێوزەنگەوە بەرەو قاسمە رەش دەچووم فرۆشگایەکی لێ بوو داخیلی ناو فرۆشگاکە بووم تەماشام کرد دوو پیاوبەرەو لای من دەهاتن منیش دووسێ پێشمەرگەم لەگەڵ بوو بەرێککەوت ئەوشوێنەی کەلێ ی توشی یەکتربووین تۆزێك تەسك بوو دەبوایەیەکمان راوەستین تا ئەوەی ترتێپەڕ دەبێ ماندوو نەبوونم لێ کردن وگووتم" کاکە بۆکوێ دەچن یەکیان جوابی دامەوە گووتی" ئەحمەدکوردە دایکی ئەکام بەلام ئەومنی نەدەناسی منیش پێ کەنیم وگووتم" بۆچی بووە ئەو گووتی" کاکە هەموو رۆژێ ئەحمەد کوردە دەچووە ماڵمان ونامەی بۆبەجێ دەهێشتم لای قەدری دەیگووت با پیاوەکەت ببێ بە پێشمەرگە ئەوەمنیش بەدوای قسەکەی ئەو هاتوومەو سەرم ئاواچووە بەقوڕدا منیش خۆم لێ ئاشکرا کردو گووتم" من ئەحمەد کوردەم تۆ مام عوسمانی ،لەگەڵ مام عوسمان بەیەکتر شاد بووین وماچی کردم وگووتی"

بەهیوا بووم بتبینم قەدری زۆر باسی پیاوەتی تۆی بۆکردوم، ساڵی ٨٣ بوو مام عوسمان بوو بە پێشمەرگە، مام عوسمان لەوساڵانە لە پێشمەرگایەتی کۆچی دوایی کرد هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی خەباتگێر مام عوسمان.

## شەری گردەسۆر

لەوکاتەدا کەبەرەی جود دیعایەو پروپاگەندەیان بۆ یەکێتی دەکرد کەگوایە یەکێتی دەست لەرژێم دەپارێزێت لێ یان نادەن و مفاوەزاتیان هەیە بەلاّم لەڕاستیدا هیچ شتی وا لەگۆڕێ نەبوو ، بەرێز کاک عەلی بچکۆل ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵەبوو بەجەولە هاتبووە خوارێ بۆدەشتی هەولێر ئەو تیپانەی لەگەڵ خۆی هێنابوو تیپی٢١وتیپی ٢٥ ی خاڵخالاّن وتیپی٩٣ی کۆیە وتیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر، کەرتی رێکخستن و ناوچەی شۆرش گێران لەگەڵ بوون بەسەرپەرشتی بەرێز کاک عەلی بچکۆل جەولەمان دەکرد کەرتێکی ٢١ی کەرکوك بەسەرپەرشتی سەید برایم و کەرتەکەی ئێمە ودەستەکەی کاک مەلاناراز و محمد شینە کادیری کۆمەڵە جەولەکەمان گەیشتە گوندی گردەسۆر ،گردەسۆر دووگوندە گردە سۆری سەروو گردەسۆری خواروو، کەرتەکەی ئێمە چووینە گردەسۆری خواروو لەگەڵ کاك مەلا ناراز کەئەوکاتە جێگری شێخ جەعفەر بوو لەتیپەکەی ئێمە لەگەڵ محەمەد شینە، کەرتەکەی سەیدبرایم بۆگردە سۆری سەروو، کورێکمان لەگەڵ بوو ناوی بابە شێخ بوو خەڵکی گوندی ئیلنجاغ بوو لەتەنزیمی شۆرش گێران بوو ، پێش نانی نیوەرۆ من و محەمەد چاوشین وعەلی مەحمود وخاڵە جاسم پیاسەمان دەکرد دەمان ویست بابەشێخ بکەین بەکۆمەڵە زۆر هەوڵمان لەگەڵدا قەناعەتی هاتوو گووتی" باشە دەبم بەکۆمەڵە بەلاّم لەژنی هیچتان ناگەرێمەوە .بوو بە پێکەنین بۆماوەی دوو سێ

دەقە ،منیش گووتم" ئەوەی بۆت ڕاوەستا لێ ی مەگەڕێوە. تومەزا پێشتر وایان حاڵی کردبوو کەکۆمەڵەکان لەیەکتر ناگەڕێنەوە، پێم وایە ئەوقسەیە زۆرسەید کاکە دووبارەی دەکردەوە چونکە زۆر ڕقی لەکۆمەڵە بوو ئێمە بۆمان ڕوون کردەوە کەسیاسەتی کۆمەڵە وانی یە ،ڕاستی ڕێبازی ڕەنجدەرانی کوردستانمان تێ گەیاند دواتر دابەش بووین لەماڵەکان بۆنان خواردنی نیوەڕۆ سەعات بوو بە ١١، لەدوای سەعات ١١ کەخەریکی نان خواردن بووین من لەماڵی مام مەحمود بووم پیاوێك هاتە ژوورەوەو گووتی"ئەوەتۆ چی دەکەی لێرە دەورەتان گیرا وامزانی گاڵتەم لەگەڵ دەکا بەلام سەلیم دووبارەی کردەوە هەرزوو سافیرەیەکم لێدا ئەوسافیرەیە ئیشارەتی خۆمان بوو کاك مەلا ئاراز لەگەڵ محمد شینەو هەموو پێشمەرگەکان گەیشتنەلای مزگەوت دووبیکەیسی و ئاربیجی یەکمان پێ بوو بیکەیسیەکیان بۆ ڕۆژهەلاتی دێ یە کە لای مەلاجەوهەر بوو ،بیکەیسیەکەی تر بۆ ڕۆژئاوای دێ یەکە لای مام بێ بەش بوو، ئاربیجیەکە لەگەڵ دووگوللە لای بێ کەس بوو، کاك محەمەد شینە خەڵکی گردە سۆر بوو پیاوێکی بەتوانا بوو کادیری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەبوو جوابێکم بۆسەید برایم ڕەوان کرد کەدەبێت شەڕ بکەین ئەوانیش لەلای خۆیان بەهەمان شێوە دامەزرابوون بەهەردوولامان٨٣ پێشمەرگەبووین، ئێمە دەستمان بەخانوو کون کردن کرد، گردە سۆر هەموو خانووەکانی قوڕبوو دیوارەکانی زۆر ئەستوور بوو زۆربەی ماڵەکان بەیتونەی بانیان هەبوو چواردەوری دەشت بوو زۆر لەباربوو بۆشەڕکردن سعات ١١،٣٠ دەقیقەی نیوەڕۆ تەقە دەستی پێکرد، هاوین بوو دەغڵ بەزۆری دروابۆوە بەلام تەبارەش مابوو دەڕاسە ئیشی دەکرد پێشمەرگەکانمان لەچواردەوری دێ دابەش کرد، تۆزی قوەتەکە دیاربوو بەرەو گردەسۆر دەهاتن هەردوو گردەسۆر هەزارمەتریکیان نێوانە، ئەو شەڕە دووهەم شەڕبوو لەدەشتی هەولێر لەناو دێ بکرێت هێزی دوژمن ووردە ووردە نزیك بۆوە

لەهەردوولای گردەسۆر شەرەدەستی پێکرد لای خۆمان من وکاك مەلا ئاراز وکاك محەمەد شینە سەرپەرشتی شەرەکەمان دەکرد بەلام زۆر بەداخەوە کاك مەلائاراز لەبەرئەوەی پێشتر بریندار ببوو نەیدەتوانی لەسەر دیوارەکان بازبدات ،وەکومن جەولەی ناو پێشمەرگەکان بکات ،ئێمە تەنها یەك ئاربیجی ودوو بیکەیسیمان پێ بوو لەم شەرە بیکەیسیەکان عەدەدی یەکەم ودووەمیان هەبوو عەدەدی یەکەم مام بێ بەش عەدەی دووەم مامەقالە،کاك عومەرو هەرسێ کیانم لە بەیتوونەیەکی بەرز دانابوون بەلای پردێوە ،ئاربیجیەکەمان لەلای بێ کەس بوو تەنها دوو گوللەمان هەبوو،بابەشێخ وشەهید ئەنوەر و عەلی ئیلنجاغی وهیدایەت حەمەد ئەوانە لەرۆژهەلاتی گوند بوون بەبەری قەشقەوە،دەبابەکان وردە وردە نزیکی ناو دێ دەبوونەوە کات گەیشتبووە دەوری سعات ٤ ی عەسرمن لەجەولە کردنم بەسەر پێشمەرگەکانەوە سەردانی لای ئاربیجیەکەم کرد دەبابەکانیش گەیشتبوونە لای خەرمانەکانی گوند ناو کۆمەڵە گەنمێك (رەوسە) ژمارەیان ٦ دەبابە بوو کاك بێ کەس دەورەی ئاربیجی نەبینیبوو چوومە لای و گووتم" ئەو ئاربیجیەم بدێ دەبابەکان زۆر نزیك بووینەوە زۆردەترسم خۆیان بکەن بەناو دێ دا،بێ کەس تورە بوو گووتی" من چەند مانگە ئاربیجی و گوللە هەلدەگرم ئیستاش خۆم نەیتەقێنم ؟ منیش گووتم" باشە کاکە بۆخۆت بیتەقێنە بەلام هەوڵ بدە دەبابەیەك بپێکی چونکە خۆت دەزانی تەنها دووگوللەمان هەیە ،بێ کەس سێرەی لێ گرتن و ئاربیجیەکی تێ گرتن بەلام زۆر لەدووری دەبابەکان تەقیەوە،ئینجا ئاربیجیەکەی دایە دەستم وگووتی" فەرموو گوللەی دووەم جەنابت بیهاوە،منیش سێرەم لێ گرت و تەقاندم بەلام بەداخەوە منیش لەدەبابەکەم نەدا تۆزێك سەری کرد دەبابەکان ترسیان گەیشتێ،گەرانەوە بۆ دواوە پێشمەرگە هاواریان دەکرد لێتدا لێتدا بەلام خۆم دەمزانی کە لێم نەداوە

،بەکشانەوەی دەبابەکان وورەی پێشمەرگە زیاتر بەرز بۆوە ،لەوێ رۆیشتم چووم سەردانی بیکەیسیەکە بکەم چوومە لایان بۆناو ئەو بەیتونەی کەتێیدا دامەزرابوون دۆشکەی دەبابەکان تەقەی لێ کردبوون زیاتر لە ١٠٠ گوللە دۆشکە ومزەکەی لەوێ لەسەر قادرمەکان کەوتبوو منیش خۆم لە مام بێ بەش ومامە قالە تورمکرد گووتم" بۆ شوێنی خۆتان ناگۆرِن خۆنێوە شێت نین ئەو هەموو گوللەتان لێرە نەدیووە ،من لەوە دەترسام تۆپێکیان لێ بدات ،دواتر لەوێشەوە چوومە لای مەفرەزەکانی تر کە دابەشمان کردبوون بەناو گوند چونکە گوندەکە زۆر پەرش وبلاو بوو شەرِیش هەر بەردەوامە ،بیرم کردەوە کەسێك بنێرم بۆلای سەید برایم هەم بۆ هەوالْ پرسین هەم دوسێ گوللە ئاربیجیشمان بۆ بنێرێ ، پیاوێکم نارد بەماتۆرِ خەلْکی ناو دێ بوو نامەیەکمان بۆ کاك سەید برایم نوسی ،ماتۆرِ سوارەکە ،چوو و هاتەوە،(بەلاّم لەکاتی گەرِانەوەی جاشەکان تەقەیان لێ کرد زۆری نەمابوو شەهیدی بکەن ) دووگوللە ئاربیجی ونامەیەکی بۆ هێنابووین ،کاك برایم لەنامەکە نوسی بووی کە ومزعیان باشەو سەلامەتن ،رۆژ بەرەو ئاوا بوون دەچوو ،بەردەوام بووم لە جەولە کردنم بەسەر پێشمەرگەکان ، پێم دەگووتن" کەوا هیممەت بکەن و رۆژ زۆری نەماوە ،گەیشتمە لای بابە شێخ برادەران بانگیان کردم وگووتیان" کاك ئەحمەد پێشمەرگەیەکمان شەهید بووە ،بەناوی (ئەنومر مستەفا خەلْکی ئیلنجاغ بوو ) منیش گووتم" لە پەنایەك داپیۆشن مەهێلْن پێشمەرگەکانی تر بزانن ،هەرچەندە دکتۆر مەزنیش لەوێ بوو بەلاّم پێ ی رِانەگەیشتبوو تەداوی بکات لەبەر سەختی برینەکەی زوو گیانی پیرۆزی سپاردبوو،هێزی دوژمن ئادەهات زۆرتر دەبوو شەرِیش هەر بەردەوامە ،بەلاّم ئێمە دلْمان زۆر بەوە خۆش بوو لەگەلْ زۆربوونی هێزی دوژمن شەویش نزیك دەبۆوە ،بانگی کاك محمد شینەو کاك مامە قالەم کرد لەگەلْ چەند پێشمەرگەیەك ،گووتم" بچن لەناو

مزگەوت بەبڵند گوێ مزگەوت ووتافی شۆرش گێرانە لێ بدەن و شیعر بخوێننەوەو سروود بڵێن بۆنەوەی وورەی پێشمەرگەو خەڵکی دێ دانەبەزێ و بەبەرزی بمینێتەوە ،بەراستیش دەورێکی زۆر باشیان بینی ،لەلای کاک سەید برایم وبرادەران سەیارەیەك پڕ جاش دەبێ بەرەو ڕوویان دەچێ وناگەڕێتەوە تا دەگاتە ناویان ،ئەوانیش تەقەیان لێ دەکەن وهەموویان دەکوژن،سەیارەکە گوللە ئاربیجی وفیشەکیکی زۆری تیدا بوو ،دووبارە ئەفەرێکم نارد بۆلای کاک سەید برایم کەئەوانیش بێنە خوارێ بۆلای ئێمە بۆ ئەوەی تەکبیری دەرچوون بکەین ،لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك بەبەتانی شەهیدەکەمان گواستەوە بۆدەرەوەی دێ ،بردمە ژێر کۆمەڵە قەسەرێکی گەورە شاردمەوە هێشتا زۆربەی پێشمەرگەکانی خۆشمان نەیانزانی بوو ئەنوەر شەهید بووە یان شەهیدمان هەیە،ئێمە چەند پێشمەرگەیەکی ناو دێمان لەگەڵ بوو ( محمد شینە،عبداللە،دکتۆر مەزن،کەریم ( مەولا ) برای جەوهەر گردەسۆری کەبەڕاستی دەوری بەرچاوی هەبوو )،لەگەڵ هەموو فیرارەکانی ناو دێ کۆبووینەوە وتەکبیری دەرچوونمان کرد ،کاك سەید برایم و برادەرانی تریش گەیشتن ،ئێمە لەدەرچوون بووین دەنگی دەست ڕێژێکی تەقەی زۆر هات لەناو جەیشەکە ،هاوڕێ کاوە مەخموری لەجەولە بوو لەلای قەراج وکەندێناوە ،دەمەو مەغریب لەجادەی قوشتەپە پەڕیبۆوە هاتبوو لەدواوە لە جەیشەکەی دابوو زۆری لێ کوشتبوون و زۆری لێ کەلوپەل کردبوون ،هێزەکەی دوژمن بەم لێدانە شلەژاوو شپرزە بوو،بەلام لەوکاتەدا مارێك بە هاوڕێ کاوەوە دەدات ، پێشمەرگەکانیش هاوڕێ کاوە هەڵ دەگرن بەرەو دێدەوان دەگەڕێنەوە بۆلای کاك عەلی بچکۆل وبرادەران ،ئێمەش بەرەو دێ ی چۆمە زەردەرە بەرێ کەوتین کەدەکاتە لای ناحیەی پردێ، ئێمە زۆر هیلاك بووین سعات ٥ ی بەیانی لەچۆمە زەردەرەوە بەدەم زێدا بەرێ کەوتین بۆ دێ ی قەشکە بۆلای کاك عەلی بچکۆل و برادەران

،ئەوەی دەمەوێت باسی بکەم ( ئەم شەڕە تەنها بـەخوێنی گەشـی کاکەئـەنوەر کۆتایی هات وەبەڕاستی سەروەریەکی گەورە بوو بـۆ هـەردوو گونـدی گردەسـۆر ،لەسعات ١١,٣٠ ی پێش نیوەڕۆ تـاکو سـعات ٩ ی شـەو لەهـەردوو گونـد شـەڕ بەردەوام بوو بەژن و منداڵ و پیروجوانیانەوە یارمەتی وهاوکاری پێشمەرگەیان دەکردو ئاو وماستاوی ساردیان بۆ دەهێنایە نوقتەکانی پێـشەوە ) ،لەگونـدی سێ گرتکان کاک مەلا ئاراس لەبەردەمی کـاک عـەلی بـچکۆل منـی مـاچ کـرد وگووتی" کاک عەلی کاک نەوشیروان زۆر باسی ئەحمەد کـوردەی دەکـرد بـەلاّم بەڕاستی جێگای ئەوەیە پشتی پـێ ببەسـتی کـاک عـەلیش هـەمووەمانی مـاچ کردو پارەی بۆ هەردوو کەرتەکە سەرف کرد بۆ حـەیوان کـڕین ،لەگونـدی سـێ گرتکان ماینەوە بـــــــۆیەیانی خەبەر هات کە جەیـشەکە لـە گردەسـۆر کشاوەتەوە ،ئێمەش چووین شەهیدەکەمان دەرهێنـاو هێنامانـەوە زێـدی بـاب وبا پیری خۆی کەگوندی ئیلنجاغ بـوو ( گونـدی شـەهیدان ) ،خـەلکی گردەسـۆر سـەریان سـوڕما کەئێمـە ئـەو شـەهیدەمان دەرهێناچـونکە نـەیان زانیبـوو کەشەهیدمان هەیە ،هەر لەو رۆژە خەبـەرمان وەرگـرت ( ٨٥ ) جونـدی وجـاش کوژرابـــوون لاشـــەکانیان چووبـــــــــوە نەخۆشـــخانەی رزگـــاری لەهەولێر،ئێمەش مەفرەزەیەکمان نارد بـۆ دۆڵ و شـیوەکان وشـوێنی شـەڕەکە کەجاش وجەیشی لێ بوو چوار کلاشینکۆف و چەندین گوللە ئاربیجی و سـندوقە فیشەکیان هێنایەوە کەلەشپرزەییان بەجێ یـان هێـشتبوو،ئەم شـەڕە دەنگـی دایەوەو بووە سەروەریەکی گەورە بۆ هێزەکانی یەکێتی نیـشتیمانی کوردسـتان. ئەو پێشمەرگە قارەمانانـە لەگـەڵ ئێمـە بـوون لەگردەسـۆری خـواروو ( مـەلا ئاراز، محمد شینە،مام بێ بەش ، محمد ئیلنجاغی ،مامە قالە ،ئەنوەر مستەفا کەلەو ئەبەردیە شەهید بوو،بابە شێخ، بێ کەس،مەولا،دکتۆر مەزن،عبداللـە گردەسۆری،مەلا جەوهەر،لاوە،خولە،غەفور مجید داربەسـەری،عەلی پونگینـە

،لەتیف شورتە،خالە جەعفەر، عومەرحەمەد،هیدایەت حەمەد، محەمەد چاوشین،شوکر پۆریجەیی،مامۆستا یاسین،کەریم مشاری،برایم ویزە،ئەمینی یاهەییەت،سامی عالآیی ، علی مخموری،علی محمود،تەحسین رەخنە،خەبات حمە شەل،مستەفا مەرزانی،رێبوار-ناسراو بەئەنومر ،برایمە سوور،رەئوف گـــــــــردیشی، خالید حاجی،شوانە هەولێری) داوای لێ بوردن لەو پێشمەرگە قارەمانانە دەکەم کەناوەکانیانم لەبیر نەماوە.

## بۆ رەنێن چووین ،خەریك بوو ،سمێلیش دابنێین

رۆژێك کەرتەکەم هێنا وهاتینە گوندی کانی دەربەند ،لەوێ پێشمەرگەکانم بەجێ هێشت تەنیا من و نصرالله لەگەڵ پێشمەرگەیەك بەناوی حازم گورزەیی بە پیکابێك چووینە سەرجادەی کۆیە-دێگەڵە بۆنەوەی چالاکیەك بکەین یان سەیارەیەکی حکومی دەستگیر بکەین و بیهێنین ،ماوەیەکی زۆر ئەوسەرو ئەوسەری جادەکەمان کرد توشی هیچ سەیارەیەکی حکومی نەبووین ،لەجەولەی کۆتایی خەریك بوو خۆمان و سەیارەکەی خۆشمان لەسەر دابنێین،گوندی سماق شیرینی گەورە کەزۆر دوور نیە لەناحیەی دێگەڵە ،لەجادەی قیر نزیکەی ١٠٠٠ مەترێك دوورە،من پێشتر چەند جارێك بە پیادە چووبوومە ناو گوندەکە،بەلآم شارەزای جادەکانی نەبووم ،لەکوێ بۆی لادەدات بۆ ناو دێ ،دوجادە هەبوون دەچوون بۆ ناودێ ،یەکیان بەناو رەبیەکدا تێ دەپەڕی ئەوەی تر بەناو زەوی یە کشتوکاڵیەکاندا تێ دەپەڕی،ئەوەی سەیارەی ناو دێ بووایە رەبیەکە رایان نەدەگرت وئیزنیان دەدا،کاك نصرالله گووتی" "بالادەینەلای خزمانی سماق شیرن ،سعات ١١ ی نیوەرۆ بوو من سەیارەکەم لێ دەخوڕی هەرسێکمان شایەلەی سەر شانمان هێنابووە خوارەوە بۆ ئەوەی لەسەر جادە خەڵك نەزانێ ئێمە

پێشمەرگەین ،ڕوومان کردە ڕێگایەك لەدوورێگاکە کەبۆدێ ی سماق شێرن لایـان دەدا کاتێك چووینە ناو ڕەبیەکەوە،ڕەبیەکەش مودەرەعەیەکی زۆری پۆشی تێدا بوو،جوندیەك لەسەر مودەرەعەکـە حـەرەس بـوو ،بەدەسـت ئیـشارەتی دایـن گووتی" بۆکوێ دەچن ؟ من بەعەرەبی پێم گـووت "عـل قریـە"،جوندیەکـەش گووتی" ( حبیبی ماکو طریق هنا ) منیش عـەرەبیم بـاش دەزانـی بـەلام حـەزم نەکرد زیاتر گفتوگۆی لەگەڵ بکەم نەوەك لێمان نزیك بێتـەوەو بزانـێ ئێمـە پێشمەرگەین،گووتم" ( شكراً ) یەکسەر بەگێکم داناو بۆ دواوە کشامەوەبەلام کە کشامەوە سەیارەکەمان پاشەکەی لە ڕێ لای داو کەوتە ناو کەندرێك سەیارەکە گیر بوو جوندیەکەش ڕوی لە ئێمە نەبوو منیش بە کاك نصراللەو حازمم گـووت تاخمەو چەکەکانتان بەجێ بهێلن لە ناو سەیارە دابەزن پالێکی پێوە بنێن بـۆ ئەوەی سەیارەکە بێتەوە سەر جادەکە بەلام لـە بـەر ڕەبایەکـە ئـەوەشمان بـۆ نەکرا ناچار بەزەویەکاندا بۆ پێشەوە ڕۆیشتم و بەناو بـەردەلان و زەویەکانـدا چوومە خوارێ تا گەیشتینە ناو دێ لەناو دێ خزمانی سماق شـێرن چـاویان بـە ئێمە کەوت زۆر سەریان سوڕما کەمێکیش پێیان ناخۆش بوو، هەر چـۆنێك بێـت لەوێ نانێکمان خوارد چونکە کات ببوو بەنیوەڕۆ ئینجا خزمـانی سمـاق شـێرن ڕێگای دووەمیان پێشان داین گووتیان" بەو ڕێگایەدا بڕۆنەوە بۆ جادە بەلام ڕێ ی تراکتۆرە کەمێك ناخۆشە،ماڵ ئاوا یمان لـێ کـردن و ڕۆیـشتین، گەڕاینـەوە گەیشتینەوە سەر جادە ئەوجا چووینەوە لای پێشمەرگەکانی خۆمـان لـە کـانی دەربەند ئەوانیش پرسیان چیتان کرد؟ ئێمەش لەگەڵ کاك نصراللە تەماشـای یەکمان کردو پێکەنین من مەسەلەکەم بۆ گێڕانەوە دواتر گووتم" کورد ووتـەنی بۆ ڕدێن چووین خـەریك بـوو سمێلیـشی لـە بـان دابنـێین بـرادەران هـەمووی لەقاقایی پێکـەنینیان داو گووتیـان" بەخێربێنـەوە بەدەسـتی بـەتاڵ و بـە سلامەت .

## شەهید بوونی دوو فەرمانده

ـ ئێمە هەموو هێزەکانی مەڵبەندی (٤) لەناوچەی بالیسان و چیوە کۆبووینەوە بۆ دانانی بەرنامە بۆ گرتنی بێتواتە هەر لەو کاتەدابوو خەبەرمان بیست سەید برایم فەرماندەی کەرت بوو لە ٢١ی کەرکوك لەگەڵ پێشمەرگەیەك لەناوچەی مەرگە بەدیل گیراون لەلایەن برادەرانی حسك و شوعیەوە بۆیە سەرکردایەتی بڕیاری دا کە هێزەکان بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان، تیپی ٩٣ی کۆیە بەدوو قۆڵ کەرابوونەوە.قۆڵێکیان بۆخدران و کاك سەربازو کاك شەماڵ وشۆڕش حاجیش لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك چووبوونە چنارۆك ولەوێشەوە بۆ گوندی باداوەی دۆڵی خەلەکان

ـ برادەرانی حسك و شوعی بۆسەیەکیان لەناوگوند بۆدانابوون کاك شەماڵ و برادەرانیش بە پیادە بۆناوگوند چووبوون بەلام برادەرانی حسك و شوعی کاك شەماڵ وکاك سەربازو پێشمەرگەکان دەنگ نادەن یەکسەر دەست ڕێژی تەقەیان لێ دەکەن ،زۆر بەداخەوە بوە هۆی شەهید بوونی (کاك شێخ شەماڵ و کاك سەرباز ئەحمەد ) کە دوو فەرماندەی تێکۆشەری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بوون لەگەڵ دوو پێشمەرگەی قارەمان و چاونە ترسی گەلەکەمان بەناوەکانی (سەعدی گەرمکی و کامەران کاکە ڕەش ) هەزاران سڵاو بۆگیانی پاکیان ،ئەم دوو پێشمەرگە قارەمانەش برینداربوون (عمرچوارقورنەیی و نهرۆ حمه غزایی ) ٠

ـ وەبرادەرانی کەمینەکەش کوڕێکیان بریندار بوو بەناوی (حاجی بختیار ).

## شەری بێتواتە
## لەسالی ۱۹۸۳ یەکەم ناحیە بوو لەکوردستان گیرالە شۆرشی نوێ دا

بەرێز مام جەلال بەهێزێکەوە لەگەڵ مامە ریشە وحەمەرەش وهێزەکانی گەرمیان هاتبووە گوندی دۆڵە رەقە ،تا لەنزیکەوە سەرپەرشتی شەرەکانی ئەوناوچەیە بکات ،چونکە رژێم بە پالپشتی عەشیرەتەکانی ئەوناوچەیە گوندەکانی ( هەرتەل ، زێوە ، بەرزێوە ، هەرمك ، نێوە ، نواوە ، چیوەی سەروو ،چیوەی خواروو ، مێرگەسەر ، سەر دۆر ، سوێرە ) کەچەکدارکرابوون بەزۆر لەلایەن رژێمەوە. دەبووایە سەرکردایەتی ئێمەش ناوچەیەکی فراوانی بەدەستەوە بێ بۆ ئەوەی هیچ نەبێ بۆماوەیەك ئیش و کاری سەرکردایەتی لێ بەرێوەببەن ، ئێمە لەسەر چیای هەورێ بەرەو گوندی چیوەوچیوە، من و شێخ جەعفەر بۆچیوەی خواروو بەشێکیشمان بۆچیوەی سەروو،کەرتێکی تیپی ۸٦ لەگەڵ تیپی ۲۱ی کەرکوك کەکاك شەوکەت سەرپەرشتی دەکردن بۆ گوندی نێوەو سەردۆر ، پێشمەرگەکانی ۲۱ی کەرکوك شارەزاییان بەوە نەبوو کەخەلکی ئەو ناوچەیە بەزۆرچەکدار کراون. بۆیە هەندێك کاری نارەوایان بەرامبەر خەلکی گوندی نێوە کرد ،خەلکی ئەو ناوچەیە ئەوەی دەرچوو بوو بەتەواوی خۆیان دایە پاڵ رژێم،( هەرتەل و زێوە و بەرۆژە ) بەرەو زینوێ هەرتەل لەلایەن شەهیدی سەرکردە سەیدکەریم سەرپەرشتی دەکرا، ماکۆك دەرە زێوە دەرە هەرتەل دەکاتە ناوقەدی شاخ وپشی قۆلەکەی شەهید سەید کەریم ،بۆشەهید حەسەن کوێستانی و تیپەکانی مەلبەندی ٤ ، قۆلی هەورێ بەسەرپەرشتی کاك شێخ جەعفەر ،کاتی خۆی من مالم لەچیوەی خواروو بوو کەگەیشتینە ناو گوند خەلکەکە زۆر کەیف خۆش بوون من بەکاك شێخ جەعفەرم گووت کەمالی حاجی

بەدیع وەمەلاجەمیل بەگشتی خەڵکی گوندی چیوە خزمەت گوزارو خەڵکی کاسبن بەزۆرچەکدارکراون، شێخ جەعفەریش گووتی" کوردە گیان تۆچی دەڵێ ی وادەکەین ،منیش لەبڵندگۆی مزگەوتەکە بانگەوازێکم کرد، بۆخەڵکی چیوەوچیوە گووتم" داوالەخەڵکی گوندی چیوەی تێکۆشەر دەکەم کەوا بگەڕێنەوە بۆناو دێ من ئەحمەدکوردمم چەکەکانتان تەسلیم بەهێزی پێشمەرگە بکەن ،بەڵام ئێمە ناوی شێخ جەعفەرمان نەهێنا چونکە خەڵك نەیان دەناسی لێ ی دەترسان مەلاجەمیلیش هەمان بانگەوازی کرد گە نجەکان گەڕانەوە بۆناودێ چەکەکانیان تەسلیمی ئێمە کرد ،ئەوشەوە لەماڵی حاجی عزیز بووین حاجی بانگی کردم بۆپەنایەك گووتی" "جوملەیەك فیشەك وگوللە ئاربیجیم لەناو (کا) شاردۆتەوە پاشان وەرە بۆخۆت بیان بە،ئەوکاتە خەڵك لەماڵی ئەنومربەگ دڵنیا نەبوو دەگەڕێنەوە بۆناوچەکە یان نا بۆیە بەنهێنی شتیان دەدرکاند ،لوتکەی نوسەك بۆتیپی ۹۳ی کۆیە کەکاك دانا مجید سەرپەرشتیاری تیپ بوو لەگەڵ تیپی ۹۹ی بیتوێــــــــن ،(مۆتە بەرە وشیشار) یش بۆهەردوو کەرتە قارەمانەکەی (مەجیدە سووروشەهید جوامێر)، پاش چەك کردنی گوندەکان بەڕێزمام جەلال لەلایەن خۆیەوە هێزێکی بەڕێ کردبوو بۆسەر بەرزایی شارۆچکەی بێتواتە پشتی گوندی ئەندێك وئەنگۆز کەلەلایەن مامە ڕیشە وحەمەڕەش سەرپەرشتی دەکران ،دوای شەڕێکی زۆر قارەمانانە توانیان دەست بەسەر شوێنەکە دا بگرن کەچەند ڕەبیە ومۆڵگەی سەربازی لێ بوو

هێزەکەی تیپی ۲۱لەگەڵ کاك شەوکەت بەرەو ناوچەی قەشان ولەوێوە بۆبێتواتە هاتن هێزەکەی ئێمەش لەگەڵ هەردوو کەرتەکەی مەجیدەسوورو جوامێر یەکترمان گرتەوە بەرەوگوندی بێ کێرو لەوێشەوە هاتینە بێتواتە

بەگشتی هێزەکان هەدەفمان شارۆچکەی بێتواتە بوو، پاش گرتنی ڕەبیەکانی دەوروبەری ،هەموو هێزەکان لەکۆشکی کاك نەوزادی ئەنومربەگ یەکترمان

گرتەوە ( ئەوکۆشکە لەشۆڕشی ٧٤ بارەگای عەلی شەعبان و مەلاقادر بوو کە ئامرهێزو جێگر هێزی بێتواتەبوون ) کەگەیشتینە ناو بێتواتە لوتکەی شیشار رەبیەکی لەسەر بوو نەگیرابوو شێخ جەعفەر بانگی منی کردو گووتی" کوردەگیان ئەو رەبیەی بانەوە نەگیراوە برادەرانی تر شارەزانین ئەبێ خۆت بچی ،هەرچەندە کەرتەکەی من بریندارمان زۆربوو لەوانە کاك نصرالله ئیلنجاغی کەجێگرم بوو، بەلام گووتم" باشە ،مەتارەی ئاومان پڕ ئاوکردو بەرێ کەوتین بۆبەرزایی شیشار( کە٨٠٠مەتر بەرزە لە ئاستی رووی دەریاوە ) بەرەو رەبیەکە ،من لەوێ زۆر شارەزا بووم چونکە لەشۆڕشی ئەیلولیش بارەگامان لەوێ بوو بریندارێش بووم، گەیشتینە نزیکی رەبیەکە حەزەرمان وەرگرت تاچووینە ناو رەبیەکە، نائب زابتێکی تێدابوو بەناوی ( عواد ) بێ تەقە خۆی بەدەستەوە دا لەگەڵ جیهازێك ،لەعوادم پرسی ئەی کوا برادەرەکانت ئەویش گووتی" ئەوە چەکەکانیانن بەلام خۆیان رایان کرد ،لەسەر شاخەکە دانیشتم یادەوەری ساڵی ( ١٩٧٤ )م. بۆبرادەران گێڕایەوە کەچۆن بریندار بووم لێرە وەچۆن لەشەرێکدا عەریف جەمیل کەخەڵکی داربەسەری گەورە بوو لەهێزەکەی دکتۆر خالید بوو لەسەر ئەو شاخە شەهید بوو لەگەڵ پیاوێکی تر ناوی حەمە زیاد بوو دەوری مەسئولیەتی هەبوو خەڵکی گوندی باخەجنێری دەشتی کۆیە بوو، شەفیقی مام سۆفیش کەخەڵکی مام قلینج بوو هەر لەو شەڕە لەساڵی ( ١٩٧٤ ) بریندار بوو ،دواتر ( عواد ) وچەك وجیهاز و دەسکەوتەکانمان کۆکردەوە وهاتینە خوارەوە لای شێخ جەعفەر . رۆژی دواتر دوودەبابە لەسەروچاوەوە هاتن بەرەو بێتواتە ،کۆپتەریش بەبەردەوامی بە سەر ناوچەکەدادەسوڕانەوە وتۆپبارانی گوندەکانی ئەندێکو ئەنگۆزیان دەکرد، چونکە لەژێر دەستی پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دابوون، من لەگەڵ مەفرەزەیەك لەکەرتەکەی خۆم بەئاگاداری بەرێزان ( کاك شێخ جەعفەروکاك شەوکەت وکاك سەید کەریم )

چووم بۆلێدانی دەبابەکان ،زۆرلێ یان نزیك بووینەوە ،لەبەر بێتواتە گابەردی گەورەی لێ یە لەناو ئەو گابەردانەوە بەبیکەیسی وئاربیجی لەنزیکەوە تەقەمان لەدەبابەکان کرد،دەبابەکان رایان کرد یەکێکیان بۆماوەیەك ئاگری لێ بەرزبۆوە ،بەلام دواتر کوژایەوە سێ جوندیشمان لەجوندی مشاتی دەبابەکان کوشت . بێتواتەو دەوروبەری ماوەیەکی باش لەژێر دەسەلاتی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان مایەوە،لەبیرم ماوە (رەشۆی کوێخا رەسوڵی بێتواتە لەم نەبەردیە دەوری بەرچاوی هەبوو چونکە خەڵکی بێتواتە بوو) ،داستانی گرتنی ناحیەی بیتواتە بەنوسینی چەند لاپەرەیەك تەواو نابێ ،چونکە یەکەم ناحیە بوو لەشۆرشی نوێی کوردی بەراپەرایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە ئازاد بکرێ ،بەلام زۆر بەداخەوە هەندێك لەوهێزانەی کە بەشداربوون لەم داستانە دەست کاری ماڵ وکەلوپەلی خەڵکی شارۆچکەی بیتواتەیان کرد بۆیە بەرێز مام جەلال زۆرتورەو نیگەران بوو زۆربەی فەرماندەکانی بانگ کرد بۆگوندی مێرگەسەرماڵی شێخ ئەحمەدی زیخان کەخۆی لەو ماڵە دادەنیشت، بەرێز کاك نەوشیروان ودکتۆر کەمال وبرادەرانی مەکتەبی سیاسی زۆربەیان گەیشتنە ئەوێ ،مام جەلال بریاری محاسەبەکردن وچەککردنی هەندێك لەفەرماندەکانی دا کەبووە هۆی تەسلیم بوونەوەیان بەرژێم بۆماوەی چەند ساڵێك.ئەو قارەمانانەی لەگەڵ من بوون لەم داستانە

(مام بێ بەش،نصرالله،مامە قالە ،جەبار (جێماو) ،بێ کەس، بەهرام (ئامانج)، محمود بایز ، خەبات،مام عباس ئیلنجاغی،سەلام عباس،عومەرحمد، محمد چاوشین،صباح ئیلنجاغی،ئەنور مستەفا،بابەشێخ،عەیزالله حەوێز،مستەفا حمد مەرزانی ).

## پێشووەدانی هێزی پێشمەرگە

لەساڵی١٩٧٦ تاکو ساڵی١٩٨٣ شۆڕشی نوێی گەلەکەمان بەسەرپەرشتی راستەوخۆی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان هەڵگیرسایەوە، یەکێتی دەیان خەڵکی دروست کرد لەوماوە زۆر بیروباوەڕی جیا جیا پەیدا دەبوون لەناویەکێتی دا .بەدووسێ جار یەکێتیان کزدەکردو لەت وپەتیان دەکرد بەلام یەکێتی بەسەرپەرشتی سیاسەت مەدارو هەڵکەوتووی گەلەکەمان بەڕێزمام جەلال هەموو ئەوقۆناغانەی بڕی کەشەڕی ناوخۆیان بۆ یەکێتی دروست دەکرد وەك جەماعەتی قیادەی مۆقەتە وسوسیالست و پاسۆك .لەهاتنەدەرەوەی شوعیەکانیش لەناو ڕژێم هەریەکێتی بوو باوەشی بۆگرتنەوە بەلام دوایی ئەوانیش لەگەڵ ئەوحیزبانە بەرەیەکی جودیان پێك هێنا هەموویان کەوتبوونە لێدان وپیلان گێڕان بۆلەناو بردنی یەکێتی ،هێزی پێشمەرگە زۆر زۆر ماندوو بوو حەوت ساڵی ڕەبەق بوو بەکلاشنکۆف وفیشەکی ژەنگاوی پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بەرهەڵستی ڕژێمی عێراقیان دەکرد ،بۆیە سەرکردایەتی یەکێتی بڕیاری دا گفتووگۆ لەگەڵ ڕژێم بکات لەڕێگای حزبە کوردستانیەکانی ئێرانەوە لە پێش هەمووشیان بەڕێز عبدالرحمن قاسملو بەلام ڕژێمی عێراق هەرلەسەرەوە مفاوەزاتی هەبوو .لەژێرەوە مەفرەزە خاسەوکۆنە جاشەکانی خۆی هان دەدا بۆ ئەوەی زەبری گورچك بڕ لەهێزی پێشمەرگە بدەن هەوڵیشی دەدا فەرماندە و پێشمەرگەکانمان بکڕێت بەهۆی پارەوە مەسئولیەت وتوانی هەندێك لەفەرماندەکانمان بەدەستی جاشی کوردە خۆفرۆشەکان شەهید بکات وەك فەرماندەی خۆشەویست( کاك سەیدکەریم ،مامە ڕیشە،شوانەی تەنسیق )

وچەنـــــــــــد پێشمەرگەیەك وەزۆر هـەوڵی کوشـتنی کـاك ئەوشـیروان وچەندین سەرکردەی تریشیان ئەدا هەوڵیان دەدا لـەناو یـەکێتی دوویـەرەکی دروست بکەن، لەبیرمە جارێکیان هەندێك فەرماندەمان چـوویوونە هـەولێر بەناوی نەخۆشی بۆلای پزیشك بەلام لەگەرەکی حی عەسکەری هێزێکـی ئـەمن چووبوونە سەریان وویستبوویان بیان کوژن (کاك سەفین وصلاح شـینەو مـەلا عەزیز وچوار پێشمەرگەبوون ) ئەوانیش تەقـە لەئەمنـەکان دەکـەن ،منـیش بارەگام لەعەوێنە بوو لەگەڵ کاك خالیـد حـاجی وشـەهید رەنجـەو زۆربـەی کەرتەکان رانەوەستاین وهێرشمان کرد بۆگـەرەکی حـی عەسـکەری .حوکمـەت بەئاشکرابوونی ئەم پیلانەی چەند کەسێکی لەئەفـسەرە ئەمنـەکانی هـەولێر نەقل کردەوە بۆلای مـەخمورو کـەرکوك ، هێـزی پێـشمەرگە وردەوردە زیـادی دەکردو کاك ملازم عومەر وکاك شـەوکەتی حـاجی مـشیرو کـاك ئەرسـەلانیش هاتنە بێستانەی گەورە هەرلەوێ کاك ملازم عومەر کۆبوونەوەیەکی پێ کـردین مامە قالەش هەستاوەو پرسیارێکی لەکاك ملازم عومەر کرد گووتی" لـەبارەی مفاوەزات چی لێ دێ ، ئەویش وەلامی دایەوەو گووتی"زۆری نـەماوە بەلایـەکا ئەکەوێ یان بەلای چاکە دەکەوێ یان بەلای خراپ دەکەوێ ، ئێمەش تێگەیشتین زۆر لەسەری نەرۆیشتین ،تەشکیلاتی نوێ یان کرد تیپی قەرەچوغیان کـردەوە و تیپی ٩٣ هاتبوون لەگەڵ کاك جەنگی فەقێیانی ومەولود مام قلینجی و زۆربەی هێزەکانی ئەوسەردەمە، جەولەیەکی ناوچەی بەرانەتی وکەڵەکی یاسین ئاغا و ناوشارۆچـکەی گـوێر ومـەخمورو ئەوناوچـانەمان کـرد ،شـەوێك هـەمووەمان دەعوەتی کاك مەلای مشاربووین لای جەنابی ماینـەوە، شـەوێکی زۆر خۆشمـان بەسەربرد، رۆژێکی تر لە شارۆچکەی دیبەگە دەعوتی مام بایزئاغاباوکی کاك ئەرسەلان وخزمەکانی بووین ، لەدیبەگەش شەوێك ماینەوە ، من لەگەڵ چەند هێزێك چووم بۆ گوندەکانی گردگراوو حوشترالوك وزورپـا دۆرەنیگـو کـە ئـەو

گوندانە هەندێك عەرەبن ئەوگوندانە دەکەونـە دەشـتی قـەراج وچـەند شـەو ورۆژێك ماینەوە.

## نامەی شوعیەکان بۆکوشتنی من (١٩٨٣)

لەساڵی (١٩٨٣) کۆنفراسی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردســتان لەگونـدی ســێ گرتکان دەبەسترا ،هەموو ئەندامانی کۆمەڵە بانگێشت کرابوون بۆ سێ گرتکـان ،منیش وەکو هەموو ئەندامانی تر بانگێشت کرابووم ، خۆم و پێنج پێـشمەرگە لە گوندی گۆپتەپە بەرێ کـەوتین بـۆ ئیلنجـاغ بەشـەریکەی شیواشـۆکدا ،رێ یەکەی شەریکە چەو رێژ کرابـوو رێ یـەکی خـۆش بـوو بـەخێرایی بەسـەیارە دەرۆیشتم (خۆم سایەق بووم) لەناکاو برادەران گووتیـان" راگرە راگرە کۆپتـەر هات ،منیش تەماشای ئاسمانم کردلەو کاتەدا سەیارەکە لە دەستم وەری گرت و ئەولا ئەولای کرد تا وەرگەراین، پێشمەرگەکانی لەگەڵم بوون سـەلامەت بـوون تەنیا من و بێ کەس زامدار بووین ،من سەرو ملم تێك شکا بێ کەسیش قاچـی وەرگەرا ، منیان گێرایەوە بۆگوندی گۆمەشین ،ئەو کاتـە کـاك نـصراللەجێگرم بوو بەلام بریندار ببوو بۆیە شەهید مام بێ بەشم دانـا بۆئـەوەی سەرپەرشـتی کەرتەکە بکات تـاك و من چاك دەبمەوە ،چوون پیاوێکیـان هێنـا لـە گونـدی سماقە بە ناوی مام حەمەد کە دەستی بەیتاری هەبوو ، مام حەمەد شان و ملـی بۆ هەڵ پێچام ، نزیکەی پەنجا شەو من لە گوندی گۆمەشین مامەوە لەو مالانە (ماڵی مەلا ئەحمەد کەکۆمەڵێك کوری هەبوو بەم نـاوانـە ، سـەمەد ، جاسـم ، کەریم ، مەجید ) کچێکیشیان هەبوو بەنـاوی پـەرژین ، مـن نزیکـەی (٢٠) رۆژ لەماڵی ئەوان بووم (١٠) رۆژیش لەماڵی مام واحێد بووم کورێکی هەبوو بەنـاوی سەعید، چەند شەوێکیش لەماڵی کاك مشیر بووم وە چـەند شـەوێکیش لـەماڵی

سەید سەعدون بووم باوکی شەهید سێبور، شەوەکانی تریش لەماڵی مام حەمەد بووم ، ماوەیەکیش خێزانەکەم هات بۆ لام لەماڵی مام حەمەدو سەید حەمەدەمین کوڕی شەهید سەید حوسێن ، بۆ دواجار هەر لەو ساڵە ماڵێکم پێک هێناو هەر لەو گوندە مامەوە ، ئەو ماڵانەی کەناوم هێنان نەك هەر بۆ من بەڵکو بۆ هەموو هێزی پێشمەرگە ماڵەکانی خۆیان وەك بارەگا لێ کردبوو بۆیە حەقی وایە هەرگیز لە بیر نەکرێن ، هەر ئەو کاتەی کەمام بێ بەشم کرد بە سەر پەرشتیاری کەرت مام بێ بەش گووتی" دەچین جەولەیەك دەکەین بۆ لای گورزەیی و کانی دەربەندو ئەو ناوچەیە دوو سێ رۆژمان پێ دەچێت دواتر دەگەڕێینەوە لات منیش گووتم" باشە ، ( پێشتر من لەگەڵ شوعیەکان نێوانم خۆش نەبوو چونکە شەڕمان هەبوو وەکو دوو حیزب ، من کەرتێکی چالاك و بەر چاوم هەبوو لەریزەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بۆیە شوعیەکان زۆر رقیان لەمن بوو هەموو دەم هەوڵی لەناو بردنیان دەدام ) ، مام بێ بەش و برادەران رۆیشتن ، دەچنە گوندی گورزەیی لەوێ دابەش دەبن بەسەر ماڵەکان بۆ نان خواردن مام بێ بەش لەگەڵ دوو پێشمەرگە دەچنە ماڵێك خاوەن ماڵەکە ناوی مام کەریم دەبێت منداڵێکی بچوك لە تەنیشت مام کەریم دادەنیشێت، منداڵەکە دەست لەگیرفانی مام کەریم ڕادەکات و شتێك دەر دەهێنێ کە لە شێوەی بنێشت دەبێ مام کەریمیش بە پەلە دەیخاتەوە گیرفانی وبەمنداڵەکە دەڵێت وامەکە رۆڵە وامەکە بەلام منداڵەکە ئەم کارە چەندجارێك دوو بارە دەکاتەوە ،مام بێ بەش پیاوێکی خوێندەوارو سیاسیی و بەفیکرو بەدیقەت و تا بلێ ی زیرەك بوو دەڵێتە مام کەریم ئەوە چیە ئەو شتە؟ مام کەریم زۆر خۆی لە وەلامەکەی تاخیر دەکات و دەڵێت هیچ نیە بەلام مام بێ بەش وازی لێ ناهێنێ دواجار مام کەریم دەڵێ ئەوە نامەیە منداڵەکەم وادەزانێ بنێشتە مام بێ بەش دەڵێت نامەی کێ یە؟ ئەویش دەڵێت نامەی خزمێکە بۆ برادەرێکی خۆی نوسیوە

بەلام مام کەریم ڕوخساری دەشێوێ مام بێ بەشیش دەلێ نامەکەم بدێ با بیخوێنمەوە هەر چۆنێك بێت لێ ی وەرگرتبوو کەدەیخوێنێتەوە نامەی برادەرانی حیزبی شوعیە بۆ حازمیان ناردووە ( ئەو برادەرانەی شوعی کەنامەکەیان ناردبوو خەڵکی گۆپتەپە بوون خزمایەتیان لەگەڵ حازم هەبوو، حازمیش یەکێك بوو لە پێشمەرگە نزیکەکانی دەستەکەی خۆم ) لەکاغەزەکە نووسیبوویان ( تۆ لە ئەحمەد کوردە نزیکی ئێمەش لە بەر ئەو لەو ناوچەیە جێگامان نابێتەوە وەشەڕی ئێمە ئەکات بۆیە داوات لێ ئەکەین کە ئەحمەد کوردە بکوژیت و سەنگەر بگوازیتەوە ناو حیزبمان ئێمەش تۆ چی بلێ ی بۆت دەکەین، لای خۆمان دەتکەین بە ئامر هێز ) . بەلام من نازانم حازم عیلمی بەو ئیشە هەبوو یان نا ( الله یعلم ) دوای نان خواردن مام بێ بەش برادەرانی خۆمان کۆدەکاتەوەو مام کەریمیش لەگەڵ خۆی دێنێ و دەگەڕێنەوە لام ،هەر لەگوندی گورزەیی کە دەگەڕێنەوە مام بێ بەش نا هێلێ هیچ کام لە پێشمەرگەکان بەم مەسەلەیە بزانن جگە لەو دوو پێشمەرگەی کە لەگەڵ خۆی بوون تاوەکو هاتەوە لای من ، کە پێشمەرگە دەچووە گوندەکان لە شەودا دەبوو بەسەگ وەڕان و غەلبەغەلب هەست دەکرا شتێك هەیە، سەعات ( ١٠,٣٠ ) دەقیقەی شەو لەگۆمەشین بوو بەسەگ وەڕان قەرە بالغیەك بۆلای مزگەوت دەچوون، منیش ئەو کاتە دوو پێشمەرگەم لەلا بوو بەناوی ( خەبات و بارزان موراد ) دەستیشم پێچرابۆوە وەك باسم کرد لەسەیارە وەرگەڕابووم ، خەبات دەمانچەکەی بۆ سوار کردم بەوانیشم گووت چەکەکانتان ئامادە بکەن بابچینە سووچی ئەو دیوارە کەشوێنەکە تاریك بوو تەماشام کرد دوو سێ نەفەر بۆ لای ماڵی ئێمە هەڵدەکشان، نزیك بوونەوە دەنگمان دان مام بێ بەش جوابی دایەوە گووتی" کاکە خۆمانین ، کە دەنگی مام بێ بەشم بیست یەکسەر بە دڵم داهات کە شتێك ڕوی داوە چونکە ئەوان بۆ جەو لە چوو بوون بۆوا زووهاتنەوە ،

گەیشتنە لامان و فەرموی ژورەوەم کردن لە ژورەوە مام بێ بەش نامەکەی بۆ خوێندمەوەو گووتی مام کەریمیشم هێناوە مام کەریمی فەقێر مەڕ دارو نەخوێندەوار بوو ، بۆ خۆم دووبارە نامەکەم خوێندەوە بەمام بێ بەشیشم گووت دوو پێشمەرگە لەگەڵ مام کەریم ڕەوانە بکە بۆ ئەو بەری ئاوایی با بگەڕێتەوە بۆ گورزەییان ،مام بێ بەش کەمێکی لەدڵ ناخۆش بوو ( چونکە منی ئەوەندە خۆش دەویست بەو با هەر کەسێك دەست بخاتە ڕێگام سەری بقرتێنێ ) بەلام لەبەر من قسەی نەکرد ،مام کەریمی بەستەزمان باوەڕی نەدەکرد گەدەمان گووت برۆ تۆئازادی وای دەزانی دەیکوژین مام کەریم وەك باسم کرد خوێندەواری نەبوو ئەویش نەیدەزانی نامەکەچی تێدا نوسرابوو تائێمە پێمان گووت ،هەرچۆنێك بێ قەناعەتم بەمام کەریم هێنا ،ڕەوانم کردەوە بێ ئەوەی لەگوڵ گرانتری پێ بڵێم تائێستاش لەگەڵ مام کەریم هەردۆستین ،من ئەوشەوە لەڕووی حازمم ئەدا بۆیەیانی جەولەمان کرد بۆگوندی سماقەو ئۆمەرگومبەت لەوێشەوە بۆ سێ گرتکان ،کاك شێخ جەعفەر فەرماندەی تیپمان بوو لەوێ بوو نامەکەم پیشان داو مەوزوعەکەم بۆگێڕایەوە ئەویش گووتی" حازم ڕەمی بکەو لەشوعیەکانیش ووریای خۆت بە چونکە گەرمکیانە بتکوژن بەلام من هەرچی کردم ویژدانم قبوڵی نەکردو نەم توانی هیچ بەحازم بڵێم چونکە حازمم زۆر خۆش دەویست کوڕێکی زۆر ئازابوو بۆیەبەچەکەوە نەقلم کردبۆلای شەهید فەقێ گۆمەشینی دڵم نەهات هیچی لێ بکەم بەلام لەبەردەمی پێشمەرگەکانی خۆمان پێم گووت ( ئەگەر دەستت لەومەسەلەیەدابێ ئەوا خودا تۆڵەی منت لێ دەکاتەوە ) حازم لای کاك فەقێش نیدارەی نەکرد چوو لەگوندی کانی دەربەند دانیشت ،قادرمستەفا گرتبووی زۆری لێ دابوو گووتبووی تۆ جەماعەتی ئەحمەدکوردەی ،چەکێکیشی پێ کڕی بوو لەدوای ئەمە حازم جێگای نەبۆوە ناچار تەسلیم بەرژێم بۆوە ،شەوێك لەناو هەولێر شەو درەنگ دەبێ لەگەڵ

چەند کەسێکی تر مکافەحە تەقەیان لێ دەکات وحازم برینداردەبێ بەداخەوە هەردووچاوی لەدەست دەدات ،تاکو ئێستاش لەژیان ماوە دووسێ منداڵی جوانیشی هەیە ،ئێستاش نازانم لەومەسەلەیە حازم دەستی هەبوو یان نا بەلاّم من هەر ئەو کات گەردەنیم ئازاکرد لەبەرئەوەی پێشمەرگەیەکی ئازابوو ،لەژیانی پێشمەرگایەتیم زۆر هەوڵی کوشتنیان داوم تائاخیر جارلەهەوڵێکی تیرۆرکردن قاچی چەپم لەدەســـــــــت دا.

## حـاجـی وسـوو

لەساڵی ١٩٨٣-١٩٨٤-ئێمەگفتوگۆمان لەگەڵ میری هەبوو بەلاّم بەرەی جوود بەتایبەتی حسك وشوعی زۆردیعایەیان بۆئێمە دەکرد کەگوایەئێمەدەست دەپارێزین لەمۆڵگەکانی ڕژێم ،لەسەر پردی حاجی وسووتیپی ٨٦ بەرەوگوندی حاجی وسوو دەهاتین کەرتی ٣ وکەرتی ٤ ودەستەکەی شێخ جەعفەر کەسەرتیپمان بوو،دەستەکەی کاك مەلا ئاراز کەجێگرتیپمان بوو من وکاك مەلا ئاراز ڕۆیشتین بۆلای تەرواڵ، قۆڵەکەی کاك جەعفەروان کەنزیك دەبنەوە لەماڵە ڕەشماڵەکانی بەرگوندی حاجی وسوو لەناو ماڵە ڕەشماڵەکان بەرەی جودی لێ دەبێت لەڕەشماڵەکان دێنەدەرەوە بەرەو شاخەکانی پشتی گونددەچن ، ئێمەش گوێمان لێ بوو تەقە دروست بوو،تەقە لەشێخ جەعفەر وهێزەکەی ئێمە دەکەن .ئەوانیش بلاّوەی لێ دەکەن ولەگوندی حاجی وسوو دەوروبەری بۆماوەی دووساعەت شەڕ بەردەوام بوو من وکاك مەلا ئاراز چووینە گوندەکانی هەمزەبەگ وگردیش هێزەکەی جود بەسەرپەرشتی عەریف عەلی و تەحسینە شەلی خوارازی بوو زۆر بەداخەوە لەوشەڕەدا چوار پێشمەرگەی حسك بوونە قوربانی بەلاّم هەموویان لەشەڕ شەهید بوون بەناوەکانی :-

عبداللە ئەحمەد

نەسرەدین حاجی

ئەسکەندەر

پشتیوان کەریم

من ئەوکاتەبۆ ڕۆژی دواتر ئەوناوانەم لە پێشمەرگەیەك وەرگرت لەدەفتەری یادەوەری خۆم نووسیم ٠

## شەری گوندی کانی سەگان

بۆ بەیانی ئێمەلەگەڵ شێخ جەعفەرو کەرتەکان لەهەمزە بەگ وگردیش یەکترمان گرتەوە خەبەریان هێنا بۆکاك شێخ جەعفەر گووتیان"" هێزێکی حیزبی سۆسیالست لەگوندی کانی سەگانن ئێمەش لەبەر ئەوەی زۆر مەبدەئی بووین لەسەر پەیرەو و پرۆگرامی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ) بۆیە بەرێ کەوتین بەرەو گوندی باخچە لەوێ چووینە ناو گوندی باخچە ،بەلام کەسی لێ نەبوو لەوێ بووین بەدوو بەش کەرتەکەی من وکاك مەلائاراس بەبەرزایی یەکان ڕووەو کانی سەگان کاك جەعفەرو هێزەکەی ترمان لەگەڵ عەلی پونگینە بەرەو کانی سەگان بەرێ و ڕێدا بەرەو شینایی یەکانی بەرگوندی کانی سەگان ،لە پشت گوندی تەقەیان لە من ومەلائاراس کرد لەبەرەوەی گوندی لەوێش تەقە دروست بوو جەماعەتی حسك هێزێکی کەم بوون لەناو گوند چوونە دەرەوە بۆلای ڕەبیەکانی حکومەت ،من ومەلا ئاراس زوو لەدوایان گەڕاینەوە چونکە زۆرحەزمان لەشەڕی براکوژی نەبوو یەکێکمان بەدیل گرت بەناوی شێرزاد چەکێکی ژێرسەی پێ بوو خەڵکی هەولێر بوو من پێشمەرگەیەکم لەگەڵ بوو بەناوی غەفور خەڵکی داربەسەر بوو ئاگام لێ بوو

نیتاقی لە پشت کردبۆوە لەکابرای گیراوی دەدا منیش لێ ی تورە بووم وقسەم پێ گووت گووتم" کابراگیراوە لەبەرچی لێ ی دەدەی بەلاّم کاك مەلانـاراسیش لای غەفوری گرت و لەو شاخە لەسەر کابرای حسك لێمان بوو بەدەنگـەدەنگ ،لەرقی من کاك مەلاناراسی رەحمەتی تۆزێکی تریشی لێ دا ،منیش بـەجێم هێشت و بەرەو دێ ی کـانی سـەگان چـوومەخوارێ بـەلاّم لـەخوارووی دێـش پێشمەرگەیەکی حسك کوژرابوو کەچوومە خوارەوە شێخ جەعفەر لەناو دێ بوو گووتی" کوردەگیـان چیتان کرد منـیش مەسـەلەکەم بۆگێڕایـەوە مـەلاناراس وکابراشیان پێ بوو لەدوای من ئەوانیش گەیـشتن شـێخ جەعفـەر زانـی مـن هەقمەو زۆرتورەم بەو مەسەلەیە بۆیە تۆزێك قسەی لەگەڵ مەلاناراس کردو گووتی" کوردەگیان ئەو پیاوە گیراوە بالای تۆ بێ تۆ چی لێ دەکەی من ڕازیـم منیش غەفورم ئەقل کرد بۆلای کاك عەلی پونگینـصە کـەرتی ( ٤ ) کابراشـم لەگەڵ خۆم دەگێرا ،ماوەیەکی پێ چوو ئێمە لەگەڵ کاك جەعفەر جەولەمان دەکرد کاك شێرزادیشم هەر لەگەڵ خۆم دەگێرا پێم گووت ببـە بە پێـشمەرگە لەگەڵ خۆمان گووتی" چەکداری ناکەم گووتم"چی دەزانی گووتی" پیاوێکی قورئان خوێنم گووتم" باشە دەتبەینە گوندی سماقـە لـەوێ ببـە بەمـەلای گوندی چونکە مەلای گوندیان نیە ،لەگەڵ کاك جەعفەر جەولـەمان کەوتـە گوندی سماقە لەوێ کـاك جەعفـەر گـووتی"کوردەگیـان بـا پێ یـان بلـێین ،بەخەڵکی سماقەمان گووت مەلامان بۆهێناون ئەوان زۆریان پێ خـۆش بـوو شێرزاد بوو بەمەلا شێرزاد، ماوەکی بـاش پـێش نوێـژیان بۆدەکـا و ئێمـەش چەند جارێك دەچووینە سماقەو سەردانی مەلامان دەکرد، مەلا وەزعی بـاش ببوو بەلاّم دیاربوو لەناخدا پیاوێکی متکامل نەبوو بۆیە بەعـەرەبی جنێـوی بەخەڵکی سماقە دابوو لەنوێژو ووتاری هەینی،رۆژێکیان کەسێکی لێ دەبـێ گوێ ی لێ ڕادەگرێ بەعەرەبی بەخەڵکی سماقە دەڵێت خودا ماڵتان کاولکـاو

لەقورتان بباتە خوارەوە و لەوبابەتە قسانە ئەوانیش بۆیان کەشف دەبێ کە پیاوەکی چۆنە ئینجا مەلا شێرزاد ئاگادار دەکەنەوە لەدێ دەری دەکەن من مەلا شێرزادم نەبینیەوە، هەر لەدوای ئاگادارکردنەوەکە من گەڕامەوە بۆلای شاخە پێسکە کەماڵم لەوێ بوو کەرتەکەی ئێمە جەولەیان کردبوو لەگوندەکانی کورداوەو چەمرگەو هەمزەبەگ وتەڕواڵ هێزەکەی ئێمە لەهەمزەبەگ هاتبوون بۆ تەڕواڵ بەلام چەکدارەکانی حسك و شوعی دوویارە کەمینیان لێ دانابوون کەسەیارەکەی ئێمە لەهەمزەبەگەوە بۆ تەڕواڵ دێت وایان زانی بوو منی تێدام کەمینەکە دەست رێژ لەسەیارەکە دەکات لەگەڵ سورانەوە پێشمەرگەیەك بریندار دەبێ ولەسەیارە دەپەڕێ وسەیارەکە دەگەڕێتەوە، بەلام ئەو بەجێ دەمێنێت بەبرینداری دێنە سەری و شەهیدی دەکەن ،ناوی صلاح مستەفا مام قلینجی بوو ناسراو بوو بە بێکەس خزمی دایکم بوو، چەکەکەیان بردبوو مەفرەزەکەی ئێمەش لەبەرئەوەی ژمارەیان کەم بوون گەڕابونەوە بۆ گوندی هەمزەبەگ هێزەکەی حسك دەچنە گوندی باخچە دەچنە ماڵی حاجی سابیر، ماڵی حاجی سابیریش زۆر دۆستی من بوون لەوێ دەڵێن ئەحمەد کوردەمان کوشتووە ئەمەش چەکەکەیەتی بەلام منداڵەکانی حاجی سابیر کوروکچ چەك و تاقمەکەی منیان زۆرباش دەناسی چونکە چەندجارێك لەمنیان وەردەگرت و لەخۆیان دەبەستاو رەسمیان پێوە دەگرت بۆیەوەلامیان دەدەنەوە پێ یان دەڵێن ئەو چەکەهی کاك ئەحمەد نیە ئێمەچەك وتاخمی ئەحمەدکوردە دەناسین، ئەوانیش لێ یان دەپرسن بۆخزمتانە ؟ ئێمە لەگەڵ حاجی سابیر یەك عەشیرەتین بەلام ئەوان دەڵێن خزممان نیە بەلام خۆشمان دەوێت پاش ئەو هەموو قسە داوای نانیان لێ دەکەن نانیان پێ بدەن دەڵێن برسیمانە نان وماستێکیان پێ دەدەن بەرێ یان کردبوون، چەند رۆژێك دوای شەهیدبوونی بێ کەس خۆم گەڕامەوە لای

کەرتەکەو چووم بۆگوندی بانی ماران بەرۆژەوە سێ چوار پێشمەرگەی نوێمان بۆ هاتبوو لەگوندی بانی ماران تۆزێك فێری تەقەو ئوسولی شەرکردنم دەکردن ،جەماعەتی سەید کاکەو قادرمستەفا و شوعیەکان لەقەبری بەتانۆك دەبن گوێ یان لەتەقەکانی ئێمە دەبێت سەیدکاکە لەناومالەکان دەلێ ( ئەوە مندالە جەلالینە لەبانی ماران تەقەی دەکەن ئەمشەو نیوەیان بەدەستی دەگرم )، سەید کاکە بەئێمەی نەدەگووت یەکێتی ،ئێوارە ئێمە لەناو بانی ماران دابەش بووین بۆنان خواردن بەجەماعەتم گووت لەمالەکان دابەش بن حەرەسیاتمان دانەنا ئێمە بیست وپێنج پێشمەرگە دەبووین من و سابیر و فەتح اللەی مام حەمید لەمالی مام حەسەن بووین کورێکم لەگەڵ بوو ناوی فەتح اللەبوو خەلکی بانی ماران بوو برایەکی هەبوو مالی لە پەرگەی گوندی بوو دوو پێشمەرگەی سەیدکاکە دێنە مالەکەی و پرسیاری لێ دەکەن ناودی' کێ ی لێ یە؟ لەوەلآمدا دەلێت مالی ئێمە کەسی لێ نیەو ئێوارەش هەندێك پێشمەرگە لەناو دێ بوون ،بەلآم نازانم ماون لەناو دێ یان نا ئەفەرەکان ئەوندە دەپرسن ودەگەرێنەوە بۆلای سەیدکاکەو قادرمستەفا، ئەوانیش هاتبوونە گردو شاخەکانی رۆژئاوای دێ یەکە براکەی فەتح اللە تاقیبی منی کردبوو تاکو هاتبووە مالی مام حەسەن بە پەلە خۆی کرد بەژورەوەوگووتی"هەستە چواردەورت گیراوە منیش بە پێکەنینەوە گووتم" چی بووە؟ گووتی" سەید کاکەو شوعیەکان هاتوونەتە سەرتان وخەلآستان دەکەن ،بەلآم من ئێوارە خەباتی خوارزام لەگەڵ سێ پێشمەرگەی تر ناردبووە مالی کوێخا عبداللە گردێك لەتەنیشت مالەکەیان بوو بەخەباتم گووت هەرکاتێك تەقە دروست بوو تۆ یەکسەر بۆئەم گردەبەسەر دەکەویت من و فەتح اللەو سابیر هاتینەوە بۆلای مزگەوت تەنیا یەك پێشمەرگەمان بینی ناوی دکتۆر ئامانج بوو دکتۆری کەرتەکەمان بوو بەدکتۆر ئامانجم

گووت ئەگەر جەماعەت هاتنەوە بۆ مزگەوت خەبەریان پێ بدە بڵێ ئەحمەد سوراپتەوە بۆ پشتی شوعی وحسکەکان لەسەرگردەکان ئەوانیش بالەلای مزگەوت دا بمەزرێن ،من بەهێواشی چوومە لای مەکتەبەکەی گوند ٣ پێشمەرگەم لەگەڵدا بوو،لەسەر شەهید کردنی بێ کەس زۆر لە حسك و شوعیەکان پەست ببووم،لای مەکتەبەکە چۆڵ بوو مانگ هەڵاتبوو مانگە شەو بوو ،ئەم بەزمە نیو سعاتی خایاند ،ئێمە کەوتینە پشت حسك وشوعیەکان ،هەرچوارمان لە پشتەوە را دەست رێژمان لێ کردن ،بەلاَم ئەوان هیچ وەلامیان نەبوو،خەباتیش لەگەڵ ئەو سێ پێشمەرگەی لەگەلی بوو بەتەقە بۆ ئەو شوێنەی بۆم دانابوون بەسەرکەوتن،ئێمەش هاتینە خوارێ ،لەگەڵ خەبات یەکترمان گرتەوە ، پێشمەرگەکانی ئێمە پێشتر تۆزەك چاو ترسابوون ،بۆیە هەندێك بەرەو گوندی شاخە پێسکە بەرێ کەوتبوون،من لەسەر شاخەکان دەنگم دەهات ،وایان زانی بوو برادەرانی حسکن ،برادەرانی بەرەی جود ٧ کەسیان لێ برینـدار ببوو،زۆربەیان لێك دابڕابوون،شپرزە ببوون،سەید کاکەو کاك قادر مستەفاو هەندێك لەشوعیەکان چووبوونە گوندی سماقە ،بریندارو دابڕاوەکانی تر بەرەو دێدەوان هەلاتبوون ، بۆ سعات ١١ ی نیوەرۆ خەبەرم بۆ هات گووتیان" بەرەی جود لەگوندی سماقەنە،مریشکیان کڕیوە بۆ نیوەڕۆ ،من ئەوکات سەیارەیەکی پیکاب دەبڵ کابینەم هەبوو، پڕ لە پێشمەرگەم کردو چوومە گوندی بایزاغا ،بەلاَم کەسی لێ نەبوو لەوێشەوە بەرەو گەروی فاقێ وگوندی سماقە،گوندی سماقە (لەناو دۆلاَیی یەك دایەو چوار دەوری دراوە بە زورگ وگردۆلکە ) ئەوان لەناو گوندەوە ئێمەیان بینی بوو کەلە سەیارە دابەزی بووین،بۆیە بە پەلە کۆدەبنەوەو لەدێ دەرچووبوون ،جیهازم بۆ کاك جەنگی فەقێیانی وکاك مەولود مام قلینجی کرد کە لەداربەسەری سەرەوە بوون ،ئەوانیش هاتن

،گەیشتنە لامان و چووینە ناو گوندی سماقـە ،بـەلام جودەکـان نـەمابوون ،منیش بە خزمانی سماقەم گووت کەستان مریشکەکان مەشـارنەوە ،بیـدەن بەو پێشمەرگانەی ئێمە با عافیێتی کەن( لەجیاتی ئەوەی سەید کاکـە ئێمـە بەدەست بگرێ ئێمە لەجیاتی ئەو مریشکەکەشمان خوارد ).برادەرانـی جـوود بۆشەوی دواتر بـەرەو چیای بـاواجی خۆیـان پێـچابۆوە بـەرێ کـەوتبوون لەگۆمەشین و گۆپتە پە ئەفەرێکیان خۆی دزی بۆوە بەیانی بەچـەکەوە خـۆی تەسلیمی من کردەوە،گێڕایەوە گووتی"کـاك قـادر لـەنێوان هـەردوو گونـد لەرێگا دەیگووت "( وەرە ئەحمەد کوردە پێشمەرگەی خۆم بووە ئێـستا لەبـەر ئەو جێگامان نا بێتەوە ) ،کاك سەید کاکە بـا ئیتیفـاقێکی لەگـەڵ بکـەین ( چونکە منی زۆر خـۆش دەوێ ) ،بەراسـتیش وابـوو مـن قـادر مـستەفام زۆر خۆشدەویست ،سەید کاکەش جوابی دابۆوەو گووتبوی "نەخێر ئەوە بەتەواوی مێشکی تێك چووە وبۆتە جەلالی"

ـــ شـەهید <u>مـام بـێ بـەش</u> دەسـتێکی بـالای هـەبوو لەشـیعر نوسـین هەرپێشمەرگەیەکی خۆشەویستی بەتایبەتی ئەو پێشمەرگانەی تاقانە بوون کە شەهید دەبوون وەك وەفایەك پارچە شعرێکی لەسەر دەنوسین ،ئەم پارچـە شیعرەی لەسەر شەهید بێ کەس نووسی بەناوی:-

## هەواڵێکی دڵ تەزێن

باکەمێك بکەم نیشانەو باسـی
هەرچەندبلێی زۆر بەکەساسـی
تەمەنی ژینی دووساڵان بوو کەدایکی مـرد
ئەو ناچار بوو هانای لە بۆ مامی بـرد
سوتانی مامی هاتـەکایـەوە
دوبارە بێکەس ،بێکەس مایـەوە
لەجادەو کۆڵان بێکەس وکەسـاس
درەهەمێ نەبوو بیدابـەکـراس
دەساڵ تەواوبوو لەمـلاو لـەولاوە
کەسێ نەپرسی مـردوە ،یـامـاوە
دوایی رویکردە دەرگـای هـەژاری
ماوەك مایەوە هەربـەکـرێکـاری
کوردستانەکەم ناوی حـەیـاتـم
پێشمەرگایەتی رێگای نـەجـاتـم
ئینجا دەست دەکات بەهەوڵ وخەبـات
خوێن بۆگەلەکەی ئەکات بەربـەرات
کاتی جموجۆڵ هەم راپەریـنە
بۆ رزگاری کورد، گیان بەخشیـنە
خەبەرگەیشتەگوندیگۆمەشین
خەبەرچ خەبەر، خەبەری غەمگین

دونیا بێدەنگ بوو لەکوچەو کۆڵان
تەنها دەنگی مەل ئەچو بۆماڵان
خەڵك نە یانزانی خەبەر ناخۆشە
بۆیەلەئێمەیاننەکردفەرامۆشە

لە ناکاو لە پڕ مژدەی جەرگ بڕ بیستمسەرسامبوم،کەوتمەوڕ

وتم لەکوێ شەهید بووە ئەم قارەمانە
وتیان باباسی کەین بەوردی ورونی
ئێمە دەهاتین لەدێی هەمـزەبەگ
لەنیوەی رێگا بەرەی جوودی ( ... )
سەیارەی ئێمەیان کـــرد بە نیشانە
لەوێ ،بەجێما ئـەم قارەمانە
جا، پەیمان ئەدەم بەخوێنی گەشت
رێگات بەرنەدا هاورێ بێبەشت

دووبارە پەیمان سێ بارە پەیمان
رێگات بەرنەدەم ئەیی قارەمان
تامنیش ئەبم بە کۆچی قارەمان
بێشك بە ،بە خوێنی پیرۆزت
رێگات بەرنەدا هاورێ ( بێ بەشت )

## پردی حاجی وسوو و بۆسە نانەوە لەجیاتی دوژمن دۆستەکانمان کەوتنە ناو بۆسەکە

( ۱۹۸۳ ) من فەرماندەی کەرتی سێی بەردەباز بووم لە تیپی ( ۸٦ ) ی دەشتی هەولێر ،شەهید علی پونگینە جیگرم بوو ، محمەد چاوشین فەرماندەی مەفرەزەبوو لە کەرتەکەی من ، شەفیق چاوشین فەرماندەی مەفرەزەبوو لەکەرتەکەی من ، بەگشتی ( ٤٠ ) پێشمەرگە دەبووین لەسەر جسری حاجی وسوو بە دوو شوێن بۆسەمان دانایەوە، بۆسەی یەکەم خۆم لەگەڵیان بووم لەقۆڵی لای تەڕواڵ کەلە بێستانەوە دێ ، بۆسەی دووەم کاك علی و بەشێك لە پێشمەرگەکان لەلای سماق شێرن کە لە دێگەڵەوە دێ ، سەیارەیەکی جۆری کرۆنای شین لەلای دێگەڵەوە هاتبوو دوو ئەفەندی خاوێنی تێدا بوو بۆسەی دووەم ڕایان گرتبوو پرسیاریان لێ کردبوون دواتر ئیزنیان دابوون ، گەیشتە لای ئێمە،ئەو پێشمەرگەی لەسەر جادەبوو ڕایگرتن دوو ئەفەندی خاوێن و باوێن بوون منیش گووتم لایان دە لێواری جادەکە چوومە لایان و سویچەکەم لێ وەرگرتن ، بەلام ئەوان لەبرادەرانی بۆسەی دووەم پرسیاریان کردبوو ئێوە کێن ؟ ئەوانیش گووتبوویان جەماعەتی ئەحمەد کوردەین لەلای ئێمەش دووبارە پرسیاریان لە پێشمەرگەکەی سەر جادە کردبوو ئەویش هەر گووتبووی جەماعەتی ئەحمەد کوردەین ،دوو ئەفەندیەکەلەناو سەیارەکە دانیشتن و خۆیان ئاشکرا نەکرد چونکە دڵنیا نەبوون کە ئێمە پێشمەرگەی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانین ماوەی سەعات و نیوێك لای ئێمە مانەوە ، نەئەوان قسەیان کرد نەئێمەش چووینە لایان ، کاتێك محمەد چاوشین هاتەلام و گووتی کوردە بۆ ئەوانە ئیزن نادەی بڕۆن ؟ منیش گووتم کێن ئەوانە؟ حمە گووتی

یەکیان دەناسم ناوی ( عبدللە ) یەخەڵکی شیواشۆکە منیش گووتم چۆن دەیناسی حمە گووتی گوێم لیٚ بووە باسی دەکەن کە بەرپرسی رێکخستنەکانی کۆمەڵەیە لە شار بەناوی ( کۆسرەت ) ،دیاربوو حمە چاوشێن وردە کاریەکی دەزانی ، هەرچەندە من لەگەڵ ماڵی باوکی کاك کۆسرەت زۆر ئاشنا بووم بەلاَم هەرگیز ئەوم نەدی بوو ، چومە لایان و سویچەکەم دایەوە بەکاك کۆسرەت چونکە ئەو سایەق بوو ، دابەزی گووتی چۆن ئیزنمان دەدەن ؟ منیش گووتم ئیٚستا دەتان ناسم فەرموو برۆن ،کاك کۆسرەت گووتی تۆ کیٚیت ؟ منیش گووتم ئەحمەد کوردەم ،کاك کۆسرەت گووتی ئەوانی ئەو بەری جسرەکەش گووتیان جەماعەتی ئەحمەد کوردەین بۆیە ئیٚمە خۆمان ئاشکرا نەکرد ، منیش گووتم بەڵیٚ ئەوانیش هی ئیٚمەن ، کاك کۆسرەت ماچی کردم و جگەرەی تەقدیم کردین و کەمیٚك خۆی ئاشکرا کرد بەلاَم بەتەواوی نا،ئەوەی تریش کە لەگەڵی بوو شەهید بەهرۆز قەشقە بوو،(دواتر کەهاتنە دەرەوە بوون بە برادەرم ) ،ئینجا من پیٚم گووتن فەرموو کوێتان دەویٚ با یارمەتیتان بدەم کاك کۆسرەت گووتی هاتوم بچمە لای شێخ جەعفەر ،(کاك شێخ جەعفەر سەرتیپی ئیٚمە بوو لەدیٚی بانە قەلاَت بوو چەند کیلۆمەترێك لەئیٚمەوە دوور بوو ) ،ئینجا کاك کۆسرەت سندوقی سەیارەکەی کردەوەو دوو تەکە پاکەتی گریٚڤن ورۆسمەنی پیٚدام و گووتی بە پیٚشمەرگەکانی دابەش بکە ،بۆیە من لەورۆژەوە ئەو پیاوەم خۆش دەویٚ چونکە پیاوێکی ئازاو چاو نەترس بوو پیٚشمەرگەشی زۆر لاخۆشەویست بوو ئەو کاتەئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە بوو لەناو هەولیٚر بەم شیٚوەیەش هاتووچۆی ناو هیٚزی پیٚشمەرگەشی دەکرد ،بەمەرجیٚك رژێم جاریٚکی تر هەر لەسەر کاری رێکخستن گرتبووی چەند ساڵیٚك حوکمدرابوو دواتر بەر لیٚبووردنی گشتی کەوتبوو،زۆری پیٚ نەچوو کاك کۆسرەت هاتە دەرەوە و بوو بە لیٚپرسراوی

مەڵبەنــدی ٣ لــەرێزەکانی یــەکێتی نیــشتیمانی کوردســتان وسەرپەرشــتی ڕاستەوخۆی چەندین ئەبەردی کرد.

***شەری من وبەرێزمام جەلال***

فەرماندەی کەرتی ٣ ی بەردەبازبووم لــەتیپی ٨٦ ی دەشــتی هــەولێر ســاڵی ١٩٨٣-١٩٨٤ مفاوەزاتمان هەبوو چۆن ئەمنەکان ئەنــدام ولایــەنگری ئێمــەیان دەکوشت وبزردەکرد ئێمەش لەتۆڵەی ئەوە دەگەڕاین پیاوێکی گەورەی بەعسمان بەبەر دەست بکەوێت دەستی لێ بوەشێنین من ومحەمەد چاوشین ودوو پێــشمەرگە سەیارەکمان پەیداکرد بەرێکەوتین بۆجادەی کوییان نزیك گونــدی مــەلا قــەرە ئەورۆژە لەڕاوەکە سەرکەوتوو نەبووین وهیــچمان دەســت نەکــەوت ،ســەیارەکی عەرەبمان ڕاگرت زۆرمان هەوڵ لەگەڵدا بمان گەیەنێتەوە مەقەڕەکانی خۆمــان لەگەڵمان نەهات سەیارەکەمان لێ وەرگرتوو ترمۆزێــك نــاوی لابــوو ترمــۆزە ناوەکەم بۆجێهێشت دنیا گەرم بووگووتم ئەوەك لەتینوان بخنکــێ بــۆ بــەیانی هاتینەوە گوندی بێستانە من ماڵم لەوێ بوو بارەگای تیپمان لەوێ بــوو عــەلی ئیلنجاغی ( عــەلی مــەحمود ) ئــامۆزای محمــەد چاوشــین بــوو توێتەکــەی لــێ وەردەگرێت دەڵێ پیاسەکی پێ دەکەم بەلام بردبوویە کەرتی ڕێکخــستن و پێــی گووتبوون ئەحمەد کوردەو محەمــەد چاوشــین ئەوســەیارەیان لــەناو عــەرەبان فڕاندوە، ئەوانیش یەکسەر کردبوویــان بــەراپۆرت بۆبــەرێزمام جــەلال بــەبێ ئەوەی بەئێمە بڵێن چۆنتان هێناوە ئێمەش تەنها خۆمان پێ ڕزگارکردبوو هــیچ مەبەستەکی ترمان نــەبوو لەســەر ئەوســەیارە ، عەرەبەکــە لــەرێی هەنــدێك پێشمەرگەی قەراج گەیشتبووە کەرتی ڕێکخستن ،لەوێ ناوی منیــان بەتــەواوی پــێ گووتبــوو بــەلام لێــی غەڵــەت دەبــوو "لمــا خذ سیارتی اسمها حــسن

کوردە"بە محەمەدیشی دەگووت لەجیاتی بلێ حەمە چاوشین دەیگووت "حمە جاش"وابزانم فێرکرابوو،کاك سابیر رەسوڵ ئەو کاتە فەرماندەی تیپمان بوو ،لیژنەیەکی دانا بۆ ئەوەی بەدواداچون بۆ ئەو مەسەلەیە بکەن و لێی بکۆڵنەوە ،کابرای عەرەبیان بانگ کرد من و محمد چاوشینیان لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تر تێکەڵ کرد ،بەلآم کابرای عەرەب دەست نیشانی کەسمانی نەکرد لەو چەند کەسەی ریز کرابوون بەلآم دواتریش کەرتی رێکخستنی کۆمەڵە وازیان لەمەوزوعەکە نەدەهێنا منیش سەرم تێمابوو زۆر بەرقدا چوو بووم ،مام جەلالیش ناوەناوە بروسکەیەکی دەکرد دەیگووت ئەحمەد کوردەو چاوشینم بۆ رەوان بکەن،من توورە بووم و قاچاغ بووم نەچووم بۆلای مام جەلال ،کاك سابیرو هەیئەتی تیپ منیان لەفەرماندەی کەرت لادا وەمحمدچاوشینیش لەفەرماندەی مەفرەزە لادرا ،هەردوکمان ماڵەکانمان بارکردو چووینە دێی گۆپتە پەی رۆژئاوای کۆیە ،کەدێ یەکی خۆش بوو ئاو وکارەبای هەبوو یەکەو هۆدە خانویکمان پەیداکرد ژن ومنداڵەکانمان لێ دانا بۆماوەی سێ مانگ ،خۆمان لەبەرێز مام جەلال شاردەوە دیاربوو مام جەلال لەنزیکەوە چاوی بەکاك سابیر کەوتبوو ،کاك سابیر لەدوای منی نارد گووتی "پێم باشە سەردانی بەرێز مام جەلال بکەن چونکە کەرتی رێکخستنی کۆمەڵە قەناعەتیان بەمام جەلال هێنابوو کەوا ئێمە ئەو کارەمان کردووە دوایی من تێگەیشتم کەلەسەر چی یە ( خدر چەمرگە کە برا گەورەی خزمەکانی خۆمان بوو ( عەشیرەتی گەراری ).هاتبوو بۆبیستانەی گەورە ،کەوا سەردانی من بکات ولەوێشەوە سەردانی خزمان بکات لەچەمرگەو کورداوە ،بەلآم کەرتی رێکخستنی کۆمەڵە گرتبوویان ،سەیارەکەیان لێ سەندبوو پێش ئەوەی بگاتە لای من لەبێستانە،منیش زانیم و چووم لەسجن دەرگاکەم کردەوەو خدرم دەرهێنا بردم بۆلای کاك سابیر رەسوڵ ،لەگەڵ کەرتی رێکخستن کێشەمان بۆ دروست بوو

لەماڵی سابیر رەسوڵ خدر چەمرگە وەرەقەیەکی بەمۆری دەرهێناوگووتی "ئێـوە بـەس دەتـانویـست مـن کەشـف بکـەن کەچـی دەکـەم مـن چـەند رۆژێـك لەمەویەرچوومەتەسـەرکردایەتی ( یـەکێتی نیـشتیمانی کوردستان )ئەویارمەتیەشم داوە بەیـەکێتی دیـاربوو وەرەقـەی چـەند هـەزار دیناریکی پێ بوو .بەرپرسەکەی کـەرتی رێکخـستن پەشـیمان بـوو لـەوکارەی کەکردبووی کاك سابیریش زۆری قـسەکرد گـووتی کـوردە گیـان تـۆش لەگـەڵ محەمەد سەردانی بەرێز مـام جـەلال بکـەن . صـباحی بـرای محمـد چاوشـین سەیارەیەکی جێبی هەبوو پێمان گووت وەرە بمان بە بۆ سـورداش، بـەرێز مـام جەلال ئەوکات لە سورداش بوو، بەیانی یەك زوو لـە گـەڵ محەمـەد چاوشـین چووین بۆ سورداش دەوری کاتژمێر ۹ گەیشتینە سورداش کورێك لای مام جـەلال بوو بە ناوی دلاوەر خەڵکی کۆیە بوو،بەدلاوەرمان گووت بەبـەرێز مـام جـەلال راگەیەنە کە ئێمە هاتووین هەرلەو کاتە مام رۆستەمیش گەیشتە ئەوێ ،چـاك وچۆنی لە گەڵ کردین ، چووە ژووری بۆ لای مام جـەلال ئینجـا دلاوەر بەبـەرێز مام جەلالی گووتبوو ئەحمەد کوردە و محەمەد چاوشین هاتوونە ،مام جـەلالیش زۆر مشتاقی ئێمە بوو کە بمان کوتێ بەگۆچانەکەی یەکـسەر گـووتی بـابێن ئێمەش چووینە ژوورەوە سەلامان کرد جوابی نەداینـەوە گـووتی دانیـشن رووی کردە حەمەو گووتی حەمە تۆ لە شەستەکان کورێکی باش بووی بەلام بۆ بەگـەر ئەو پیاوکوژو چەتەو ژن هەڵگرە کەوتووی ئەوسـەگبابە! کـەمام جـەلال ئـەو قسەی کرد منیش دەستم بڵند کردو گووتم بەرێز مامە گیان حەزدەکەم گـوێم لێ بگری زۆر حەزدەکەم دەمانچە سمسەکەت هەڵکێشی یەك گوللەم لێ بدەی بـەلام جنێو بەباوکم نەدەی چونکە باوکم لەگەڵ شێخ محمود پێشمەرگە بووە ،هەندێك هەویەی ظابط طیارو پیاو خراپانی رژێمم لابوو لەبەردەمی بەرێز مام جـەلال دەرم هێنـان وگووتم مامە گیان من ئەوە کارمکا نمە کەئەوانە سەگ و پـشیلەو ژن

ومندالّی کوردسانیان هەموو بۆمب باران کرد بۆیە ئیجرائـاتی پێـشمەرگانەیان لەگەڵ کراوە نەك من بچم سەیارە بڕفێنم .بـەرێزمام جـەلال کـەگوێ ی لـەم قسانەی من بوو ئەو بەلگانەی بینی کە پێم بوو دەستی لە ملـی کـردم و ماچـی کردم و دڵ ئەوایی داینەوە گووتی بەراستی تێگەیشتم کە ئێوە کوڕی باشن ئـەو شتانەی لە سەر ئێوەیان نوسیوە ڕاست نی یە،مام ڕۆستەمیش کۆمەڵێك مـەدح و سەنای منـی کـردو گـووتی مامـە گیـان ئەحمـەد کـوردە پێـشمەرگەیەکی زۆر قارەمانی دەشتی هە ولێرە ، ئینجا مام جەلال دلاوەری بانگ کردو گووتی دلاوەر لـە نـاو فلاّنـە چـەکمەجە دەمانـچەیەکی لـێ یـە بـۆم بێنـە دەمانـچەیەکی چـواردەخۆری دایـەمن بـەدیاری وەرە قەیەکیـشی بـەئیمزای خـۆی داینـێ بـۆ ئیدارەکەی خۆی هەریەك (٥٠٠) دیناری بۆ سەرف کردین، گووتی کورم بڕۆنـەوە دەشتی هەولێر من خۆم مەیدانی کێشەکانتان حەل دەکەم بۆ خۆم دێمە خوارەوە، ئێمە دوعا بونمان خواست و لەماڵی بەرێزمام جـەلال هاتینـە دەرەوە ، (١٠٠) مەترێك دوور کەوتینەوە دلاوەر ڕای دەکرد بەدواماندا دەیگووت ڕاوەستن منـیش گووتم حەمە ئەم جارەنەمان گرێ ،دلاوەر گووتی ڕاوەستن بادوماچـت لێ بکـەم دوو ماچی لەمن کردو منیش گووتم ماڵت بەقوڕنەگیرێ خۆ ڕوحت بردین ،دلاوەر گووتی لەگەڵ قسەکانت کرد! زۆر خۆشم ویستی پیاوی ئازاو چاو نەترسم خۆش دەوێ.

## شەڕی حوجران و قەراسنج سالی (١٩٨٤)

لەهاوینی ١٩٨٤ لەدەشتی هەولێر بووم بەبروسکە ئاگـادار کرامـەوە کەبـچم بۆبناری چیای سەفین (گوندی حوجران و قەراسنج) و هێزێك لەگەڵ خۆم ببەم، کاك شەوکەتی حاجی مشیر سەرپەرشتی هێزەکانی ئەوێی دەکرد لەوێ بـوو،من

لەگـەڵ محمـد ئیلنجـاغی و بـێ بـەش وسـەلام عـەباس ،دەوری شەسـت پێشمەرگەیەکی قارەمانم برد،بەرێ کـەوتم بەمەسـیف سـلاحەدیندا ،لـەوێ لاماندا بۆ چێشتخانەکان بۆنـان خـواردن ،کاتێـك مدمرەعـەو جونـدی هـاتن ،ئەوسەر وئەوسەری بازاڕیان لێ گرتین ،خەڵکی مەسیفیش زیاتر لە ٥٠٠ کـەس دەورەیان لەئێمە دابوو ،دام و دەزگای مەسیف بەمە مشەوەش ببـوون ،ملازمێـك ودووجوندی بە پیادە دەهاتن بۆلای ئێمە ،گوێم لەخەڵکە کـە بـوو دەیـانگووت ملازم ئەیاد هات ،ملازمەکە هاتە بەردەمی چێـشتخانەکەو بەعـەرەبی قـسەی کردو گووتی "منو مسئول بکم" منیش چوومە پێش و گووتم "نعم" خەڵکەکـەش وا تـەماشامان دەکەن ،لەجیاتی چاك وچۆنی یەکەم قسەی ئـەوە بـوو گـووتی "سدوك انتم مخرب"منـیش لێـی چـوومە پـێش و تـاتوانـام تێـدابوو دەسـتم ڕاستکردەوەو بەبنی گوێمدا کێشا ،سورو شینم کردەوە ،هیچ دەنگی نەکردو "الی وراو دور" ەکی کردو گەڕایەوە بۆلای مودەڕەعەکان پیاوێك هاتە پـێش گـووتی کاکە من پارەی نـان خواردنەکـەتان دەدەم بـەس ئێـوە بـڕۆن باشـەڕ دروسـت نەبێ،منیش ڕۆیشتم و بەڕێکەوتین بۆحوجران لای کاك شەوکەت،بەلام حوکمەت خەبەری لوجنەی تـەنسیقی دابوو کەمن ئەو کارەم کردووە ،دوسێ ڕۆژ لەناوچەی حوجران و چیای سەرکەشی سەفین ماینەوە ،لەگەڵ شوعیەکان شـەڕ بوو،چـوار پێنج عەرەب بەدیل گیران یەکیان ناوی ئەبو لیلا بوو بـرادەران زۆریـان هـەوڵ لەگەڵدا ناوە ڕاستیەکەی خۆی بلێ بەلام نەیگووت ،دواتر گەڕامەوە بۆ دەشـتی هەولێر لای برادەرانی خۆمان ،ئەو شەڕە ماڵ وێرانی یە بووە هۆی شەهید بوونی چەندین پێشمەرگەی قارەمانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و حیزبی شوعی و چەند هاولاتیەکی گوندی قەراسنج ،کەهەرگیز لە یاد ڕەش نابنەوە.

## شەهید بوونی سەید کەریمی سەرکردە

شەهید سەید کەریم ئەفسەرێکی ئازای سوپای عێراق بوو،لەشۆڕشی ئـەیلول بەژداری کردووە لەبەرلێهاتویی کراوە بەفەرماندەی بەتالیۆن لەهێزی سـەفین ،شەهید لەدوای کارەساتەکەی شۆڕشی ئەیلول ومونتەمەری جـەزائیر چـووبووە سوریا لەساڵی ( ١٩٧٦ ) پەیوەندی بەیەکێتی نیشتمانی کوردسـتانەوە کردبـوو ببوو بەئەندامی کۆمەڵـەی ڕەنجـدەرانی کوردسـتان۰ شـەهید خـەڵکی گونـدی هەودیان بوو لەسنوری شاری ڕواندزە ، لەشۆڕشی نوێ لەتەشکیلی هەرێمـەکان کرا بەجێگری فەرماندەی هەرێمی خۆشناوەتی ،وە کـرا بەئەنـدامی مەکتـەبی عەسکەری یەکێتی نیشتیمانی کوردستان.وەئەندامی سـەرکردایەتی کۆمەڵـەش بوو سەرپەرشتی دەیـان داسـتانی شـەڕی کۆپتـەری کـرد ،لـەگرتنی بێتواتـە دەورێکی بـاڵای هەبوو کەیەکەم ناحیەبوو لەکوردستان لە شۆڕشی نوێ لەلایـەن هێزی پێشمەرگەوە گیرا .شەهید لە١٩٨٤/٩/١٥ لەکاتی گەڕانەوەی لەسـلێمانی لەگەڵ دوو پێشمەرگەی تر .لەکاتی مفـاوەزات کەوتنـە کەمینـەوە ونۆکـەرانی ڕژێم شەهیدیان کرد.

## شەڕی سەرجادە

لەبەهاری ساڵی ١٩٨٥،من وکاك جەنگی فەقێیانی لەسەر جـادەی هـەولێر-کۆیە لەشیوی ساماڵ لەنزیك گوندی شێخەروان کەمینێکمان دانا بۆ خۆفرۆشـان لەسەعات شەشی ئێوارە سەیارەیەی پڕلـە جـاش کەوتنـە کەمینـە کـە ئێمـە ویستمان تەقەیان لێ نەکەین و بەدەست بیان گرین بەلام چـەکدارەکانی ڕژێـم

تەقەیان کردو ئێمەش ناچار بووین دەست ڕێـژمان لـێ یـان کـرد و جاشـەکان زۆریان کوژران و هێندێکیشیان بەدیل گـیران دوای ماوەیـەك لەمەڵبەنـد ئـازاد کران ،لەشاری کۆیەوە هێزیکی عەسکەری بەهانای هێزە تێك شکاوەکەی خۆیان هات ئێمە زۆر بە توندی لەوهێزەشماندا بەبیکەیسی و ئاربیجی سەیارەکمان لێ شکاندن ناچار بوون ئەوانیش بەرەو سەربازگەی ئامریەی کۆیە ڕایان کرد، لـەو شەرە هێزی پێشمەرگە سەلامەت بووین دەسـکەوتمان چـوار چـەکی هەمـەجۆرو یەك سەیارەی تویتا وبیست بەتانی نوێ و برێك کەل و پەلی سەربازی بوو.

## سوتانی گوندی مام قلینج وشەهید بوونی پێشمەرگەیەك

مانگی ٤ ی ١٩٨٥بوو دەنگی ئەوە هەبوو کەوا مفاوەزات کۆتـایی هـاتوە بۆیـە دەبوایە هێزی پێشمەرگە لەخۆمان وریابین من ئەوکات ماڵم لەدێ ی مام قلیـنج بوو خانووم نەبوو بینایەك کرابوو بۆمزگەوت چۆڵ بوو من ماڵەکەم لەوبینایـە دانابوو, سێ پێشمەرگەم لەگەڵ بـوو یـەکێکیان بـێ ژن ومنـداڵ بـوو لای مـن دەخەوت بەناوی نازم مە لا تەها , مامەقالە وبێ بەش ماڵ وخێزانیان لەگـەڵ دابوو ،چەند پێشمەرگەیەکی ترهەبوون لـەناودێ بـەناوەکانی ( مـەولود مـام قلینجی ف-ك لەتیپی ٩٣ ومالی لەگوندبوو ،جەبار عبدالله (ڕابەر) ئـەویش کادیروخـەڵکی مـام قلیـنج بـوو بـۆ حەسـانەوە هـاتبووە مـاڵی مـامی وەچەند پێشمەرگەیەکی تر لەناو گوندبوون کەهەمویان خەڵکی ئەو گوندەبوون ،بەناوەکانی (ڕۆستەم حەمەدەمین ،شەفیق ئیبراهیم ، هاوار ئیسماعیل ،سەلام سولێمان ،جبار کەریم،بەهرام ڕەشید ، محمەدکەریم ،ڕەئوف ڕەحمـان ، محمـەد ڕەنجە ) هەندێك خەڵکی تریش کـەفێراری سـەربازی بـوون هـەموو لـەناو دێ بوون، جیرانێکم هەبوو بەناوی مام برایم ڕەشە وولاغی هەبوو بەیانی زوو بەری

دابوون بۆناو قەرسیل تەماشای کردبوو بەرزایەکانی دەورو بەری دێ هەمووی چەکداری لەسەرە، وولاغەکانی بەجێ دێلی وبە پەلە گەڕابۆوە لەدەرگای ئێمەی داو بانگی منی کرد وگووتی: تۆلەمالی گووتم : بەڵێ ،مام برایم گووتی :خۆت نەجات دە جەیش وجاش دەورەی گرتوون ،ئەوکاتە من تەنها نازمم لابوو،مامە قالەوبێ بەش هەرکەس لەمالی خۆیان بوون ،یەکەم جار بێ بەشم ئاگادارکردەوە چونکە لەسەرێگام بوو بە پەلە چووینە مالی مامەقالە ئەویشمان هەڵساندو دونیا ڕووناك داهات تەماشامان کرد ڕۆژهەلاتی گوند نەگیرابوو ،ئێمە بەناو دۆڵەکان ڕۆیشتین تالەگوند دوورکەوتینەوە من لەدڵمدابوو کەواهەموو پێشمەرگەکان ئاگادار بکەمەوە بەلام کات زۆر کەم مابوو دونیا ڕووناك داهات مام قلینج ئەوکاتە ئاوەدان بوو گوندێکی گەورە بوو، بێ بەش ومامە قالە زۆریان هەوڵدا کەتەقە لەجاشەکان بکەین بەلام من قبوڵم نەکرد لەبەر دوو هۆ، هۆی یەکەم ناودێ پێشمەرگەی زۆر لێ مابوو دووهەم هۆ دێ یەکە هەمووماد خزمین لەساعات هەشتی بەیانی لەناو گوند هەندێك تەقە کرا بەلام هیچ کامەك لە پێشمەرگەکان تەقەیان نەکردبوو خۆیان شاردبوەوە بەلام سەلام سولێمان لە پێش چاوی جاشەکان ڕادەکات بەدەورەی مالی حاجی برایم دا دەڕوات کاك حاجیش کوڕێکی پێشمەرگە بوو بەناوی کاك شەفیق ئەویش لەمالێ بوو لەجاشەکان وابێ ئەوکوڕە (سەلام) چۆتە مالی مام حاجی بەلام لەڕاستیدا سەلام نەچووبووە مالی ئەوان ڕایکرد بوو بۆدەرەوەی دێ دەورەی مالی حاجی برایم دەگرن کوڕەکەشی پێشمەرگەیەکی ئازاو بەغیرەت بوو ، پێشمەرگەیەکی قارەمان بوو، بەلام تەنها یەك دەمانچەی لادەبێت جاشەکان ناوێرن بچنە ژورەوە لەدەرەوە زۆری بانگ دەکەن ئەویش جوابیان ناداتەوە بۆیە خانوەکە ئاگر تێبەردەدەن وکاکە شەفیقیش دەسوتێ و شەهید دەبێ ،جاشەکانی قاسماغا چەندخانوێکی تر دەسوتێنن و زۆر ئەزیەتی خەڵکی مام قلینج دەدەن

بەگشتی و باوکی ئەحمەد برنەو بەتایبەتی ،ئەو رۆژە رۆژێکی رەش وناخۆش بوو ئێمەش دەمان توانی لە پشتەوە لەهێزەکەی دوژمن بدەین بەلام یەکەم بەیانی زۆر زوو بوو دووهەم فکرمان کردەوە گووتمان سەرەتایە هێشتا شەری ئێمەو رژێم بەتەواوی ئیعلان نەکرابوو ئەمەلیکمان مابوو نەشمانزانی ئەوها کاری خراپ دەکەن ، لەخەلکی گوندی تەنها دوو پێشمەرگەیان بێچەك گرتبوو ئەوانیش بەفیرار ناوی خۆیان دابوو پاش ماوەیەك بەواستە ئازادیان کردبوون ناوەکان رەئوف رەحمان عەلی ، محمەد رەزا حمەلان ،نازم لەسالی ١٩٨٦ حوکمەت باوکی تەنگاو دەکات وئازاریان دەدات بۆیە قاسمی برای هات بۆلای من زۆری رجا کردو گووتی باوکم مەلایەو زۆریش ئیختیار بووە بەلکو نازمم بۆ ئیزن بدەی بیبەمەوە بۆئەوەی رژێم باوکم نەگرێت منیش نازمم ئیزندا بەلام نازم هەر پێشمەرگەی داخیلی بوو جاشەکان باوریان پێ نەدەکردو دەیان گووت تۆسەر بە ئەحمەد کوردەی ، بۆیە ئێوارەیەك لەگەرانەوەی بۆ مالەوە دەست رێژەکی لێ دەکەن وشەهیدی دەکەن

هەزاران سلاو لەگیانی پاکی شەهیدان ( کاکە شەفیق و کاکە نازم )

ئەوەی دەمەوێ باسی بکەم مام برایمی رەحمەتی سوێندی دام گووتی ناوم مەهێنە لای کەس (کەمن خەبەری تۆم داوە ) بەلام من ناوەکەیم تەنها بەبەرێز کاك کۆسرەت گووت کەوا برادەری خۆی بوو ئەویش بۆ مێژوو بۆیە ناوەکەیم نووسی چونکە کورەکانیشی نەیاندەزانی مام برایم ئەو دلسۆزیەی کردووە

## <u>*ئەقل بوونم بۆ بەرانەتی*</u>

لەدوای ئەم شەرەی مام قلینج کە پێشتر باسم کردبوو، ئێمە بەرێکەوتین بۆ گوندەکانی ئیلنجاغ ،داربەسەری گەورە، داربەسەری گچکە،شاخە پێسکە ،بانی

ماران ،لە گوندی بانی ماران توشی بەرێز کاك کۆسرەت بـووین دیـاربوو کـاك مەولودو کاك فارۆق و کاك جەبار عبدالله لـە پێش ئێمـە را پۆرتێکیـان دابـوو بەکاك کۆسرەت دەربارەی هاتنی جەیش بۆ مام قلینج ،کاك کۆسرەت بانگی منی کردو چۆنیەتی سوتانی گوندی مام قلینج و شەهید بوونی پێـشمەرگە ( شـەفیق ابراهیم )ی لیٚ پرسیار کردم منیش ئەوەی دەمزانی جوابم دایەوە کاك کۆسـرەت هاتبووە خوارەوە بۆ جۆش دانەوەو رێکخـستنەوەی هێـزی پێـشمەرگە ،لـەمنی پرسی تۆ لەکوێی منیش گووتم " لە تیپی ٨٦ی دەشتی هەولێر، کاك کۆسرەت گووتی تۆ دەبیٚ بچیت بۆ تیپی٨٥ بەرانەتی فەرماندەی کـەرتی ( ٢ ) وەرەقـەی نەقلی بۆ کردین من ئەو پێشمەرگانەم لەگەڵ بوو ( بـیٚ بەش، مامـە قالـە، نازم تەها اسماعیل ،بـارزان موراد، اسماعیـل مەغدیـد )،ئـەو کاتـە کـاك هـێمن فەرماندەی تیپ بوو خەڵکی سلێمانی بوو بە هێمنە رەش ناسـراو بـوو کـورێکی زۆرباش بوو پێشمەرگەیەکی کۆن بوو من فەرمانی بـەرێز کـاك کۆسـرەتم جـیٚ بەجیٚ کرد ئێمە لە مانگی ( ٥/ساڵی٨٥ ) پەیوەندیم بەتیپی ٨٥ ی بەرانەتی کرد ،بووم بە فەرماندەی کەرتی ٢ ،بیٚ بەش کـرا بەجێگرکـەرت لەکـەرتی عومـەر عەوێنە مامە قالە کرا بە رابەری سیاسی کەرتی دوو ، خەڵکی دەورو بەری کۆیە کەزانیان من لەتیپی ٨٥ی بەرانەتیم پەیتا پەیتا پێشمەرگە نەقل دەبـوون بـۆ لام ،ئەوانەی هاتن بۆلام ( خلیل حمدامین، جمیل حمدامین، شعبان کێلەخوارەیی ،چەند پێشمەرگەیەکی تر ) ماوەیەك کاك هـێمن لەگـەڵمان مایـەوە دواتـر نەقل بوو بۆ لای سلێمانی ،دوای ئەو کاك سابیر رەسوڵ بەمۆقەت سەرپەرشـتی تیپەکەی دەکرد ،کەماوەیەك بوو کرابووە مەسئولی بەشی عەسکەری مەڵبەنـد ،فەرمانـدەی کەرتـەکانی تیپـی بەرانـەتی ( کـەرتی یـەك –عومـەر عەوێنە. جێگرەکەی بیٚ بەش بوو، کەرتی دوو-ئەحمەد کـوردە. جێگرەکـەی مـام صالح رەسوڵ بوو، کەرتی سیٚ –مەلاسلێمان. جێگرەکـەی بورهـان سعید سـۆفی

بوو، کەرتی چوار-عەلی مەسیفی. جێگرەکەی سەنگەر بوو ) ،شێخ خالید ڕابەری سیاسی تیپ بوو، چەتۆی مهندیس کادیری کۆمەڵە بوو ( ئەوەی دەمەوێ باسی بکەم لەتیپی بەڕانەتی دووشت هەبوو کەسەرسامی کردم ئەویش :-

١- ئازایەتی سەرداری سەعید سۆفی بوو کەگچکە ترین پێشمەرگەی تیپەکەمان بوو لەتەمەن ،سەردار دەیان جار لەناو شاری هەولێر دەمانچەکەی خاڵی دەکردەوە لەمێشکی سەری خۆفرۆشان و پیاوانی ڕژێم ،وای لێهاتبوو پیاوانی ڕژێم لەناو هەولێر لە ترسی سەردار و ئەیوب وزەکیە خان وبەختیار کاوانی و چەند پێشمەرگەیەکی قارەمانی تر شەوان لەماڵی خۆیان نەدەخەوتن ،بەداخەوە سەردار دواتر لەگرتنی ڕەبیەیەك شەهید بوو.

٢- لەکاتی هێرش کردنی ڕژێم بۆ زیارەت چەتۆی مهندیس لەنزیکەوە ڕووبەڕووی خۆفرۆشان دەبێتەوە پاش شەڕێکی قارەمانانە چوار خۆفرۆش دەکوژێت و ئەوراقەکانی خۆی بەدەستی خۆی لە ژێر خۆڵ نابوو بۆئەوەی نەکەوێتە دەستی دوژمن کەزانی بووی دەرناچێت بەدەستی خۆی خۆی شەهید کردبوو ،دوای شەڕەکە ئێمە لەناو جاشەکانەوە ئەو دەنگو باسەمان پێ گەیشت ).

## گرتنی زنجیرە ڕەبیەی جادەی پردێ-هەولێر

لەمانگی ٥ی ساڵی ١٩٨٥ بەڕێز کاك کۆسرەت هاتە خوارەوە بۆدەشتی هەولێر بۆئەوەی چەند گورزێك لەدوژمن بوەشێنین لەدەوروبەری هەولێر ،شەهید ڕێبازو مام غەفوری نارد بۆدەشتی شەمامك سەر جادەی گوێڕ-هەولێر ،ئەوان دەستی باشیان لەدوژمن وەشاندبوو لەقافلەیەکی سەربازیان دابوو کەڕۆژانە ئەوقافلەیە لەجادەی گوێڕ-هەولێر هاتوو چۆیان دەکرد دەست کەوتیان

سەیارەیەك وچەند پارچە چەکێکی هەمەجۆر بوو بەلام رۆژێ دواتر لەکاتی گەرانەوەیان لەگوندەکانی شێخ شەروان وسیاو هێلەوە کەسێ گوندی زۆر نزیك لەیەکن تووشی شەری کۆپتەر بوون خۆش بەختانە بەگشتی سەلامەت بوون تەنها شەهید رێبازو مام غەفور بەسوکی بریندار دەبن .

ئێمەش ( من وکاك سەفین مەلاقەرەوشەهید دەشتی وشەهید فواد گۆمەشینی وشەهید ئازاد داربەسەری وشەهیدبێ بەش ومحمەد چاوشین ومامە قالەو چەند فەرماندەیەکی تر ) زنجیرە رەبیەی سەرجادەی ( هەولێر- پردێ ) مان بۆ داندرا ،من وشەهید دەشتی وشەهید بێ بەش ومامە قالەو محمەد چاوشین رەبیەکەی خۆمان گرت قەناسێك وحەوت کلاشینکۆفی دوو دەسك دەس کەوت بوو ،شەهید فواد گۆمەشینی وشەهید ئازاد داربەسەری ئەوانیش رەبیەکیان بۆ دانرابوو لەولای ئێمەوە رەبیەکەیان گرت ئەوانیش دەست کەوتیان هەبوو بەلام بەداخەوە ئەم شەوە وەك پێویست هەموو رەبیەکان نەگیران کەهەر رەبیەو بۆچەند فەرماندەیەك دانرابوو

## چەند قسەیەکی خۆش

ـ محمد تورکمان خزمی نەسرەت وکەمال شینە بوو هاتبووە لای ئێمە ببێ بە پێشمەرگە منیش لەبەر کەمال ونەسرەت وەرم گرت ،شەوێك بەفرزۆر باری بوو لەنیوەی شەو محمد تورکمان دادەندرێ بەحەرەس ،شەو مانگایەك بەسەر بەفرەکە دادەروات بەرەو بارەگاکەی ئێمە چونکە فێرمان کردبوو ئێواران خواردن دەمایەوە دەمان داپێی ، محمد زۆر ترسابوو کاتێك بینی بووی شتێکی رەش بەرەو رووی دێت نەیزانی بوو چی یە وردە وردە بەترسەوە کشابۆوە دواوە نەیتانی بوو بانگی برادەران بکات بەدەنگ بەقاچ لەدەرگای ژووری بارەگای

دابوو بەیانی کەچوومە بارەگا هاتە لام ومەسەلەکەی بۆگێڕامەوە بەم شێوەیە گووتی (کاك ئەحمەد من پێشمەرگایەتی ناکەم دەبێ ڕەوانەی ئێرانم کەی من گووتم بۆ ؟ ئەویش گووتی شەو حەرەس بوومە "مالـەوەدان "ئەوانە لەسعات یەکی شەومنیان بەحەرەس داناوە ! کاتێك تەماشام کرد شتێکی گەورەو ڕەش بەرەو ڕووم دێ منیش هەرکشامەوە بەرەو دواوە بۆلای ژوورەکەی برادەران بەلام شتە ڕەشەکە هەربەرەو ڕووم دەهات لەو کاتە دا لەدڵی خۆم دەم گووت "مالەوەدان "دەڵێم بەتاڵ کەم (بەتاڵ نەکەم! هەرخۆشم بەخۆم دەگووت ئەگەر بەتالم کرد دوای توشی بەرپرسیاریەتی دەبم "مالـەوەدان "دوایی تەمەشادەکەم"گۆلەیە"( مەبەستی مانگابوو ) منیش دواتر بەرێم کرد بۆئێران گووتم با ڕۆژێك لێمان ( بەتاڵ نەکات )•

- پیرێژنەك هەبوو لەگوندی زیارەت کۆمەلێك قازی هەبوو ناو ناوە پیرێژن دەهاتەلام دەیگووت"کاك ئەحمەد دووقاز....سێ قازم دیارنی یە منیش مەبەستم بوو ئەم قازدزە بدۆزمەوە پێشمەرگەیەك بەناوی (      ) مەشروب خۆر بوو ڕۆژێك هەر بۆخۆشی چووم بۆلای لەماڵەکەی تەماشا دەکەم پەڕو سەری قازەدزراوەکان لەماڵەکەی لە پەنایەك فڕێ دراوە ، پیرێژنەکەش زۆر گوناح بوو چووم هەندێك قازم بۆ کڕیەوە بۆم بردەوە گووتم پیرێژن قازەکانی خۆی ناناسێتەوە پێم گووت پورێ گیان ئەو قازانەم دۆزیوەتەوە ئەویش گووتی قازەکانی من ئاوانەبوون بەلام هەر بەزیاد بێت ، بە (      ) یشم گووت جارێکی تر ئەوجۆرەکارانە دووبارەنەکاتەوە •

- لەتیپی ٨٥ ی بەڕانەتی بووم شتی سەیرم دەبینی یەك لەوانە ئەمەیە کەنووسیومە، ماڵان لە زیارەت بوو زۆربەی پێشمەرگەکانمان ماڵ و منداڵیان هاتووچۆی زیارەتی دەکرد بۆ سەردان ،هەبووماڵی لەوێ بوو هەبوو دایك وخوشکی لەگەڵ بوو یان دەهاتن بۆسەردانی ،جاران دێومرە هەبوو دەگەڕا یان

حوشتر یان بارگین یان گوێ درێژێکی پێ بوو کەلوپەلی لێ بـاردەکردن جۆرەهـا کەل وپەل ، کابرای دێومرە ناوی حوسێن دیومرە بوو لەهەموو ناوچـەی دەشـتی هەولێر دەگەڕا ئێمەش دێومرە حوسێنەکمان هەبوو ناوی مام باپیر بوو لەگوندی زیارەت لەساڵی ١٩٨٥ بەڵام جیاوازی مـام بـاپیرو دێـومرە حوسـێن ئـەوە بـوو لەجیاتی گوێ درێژ مام باپیر سەیارەی پێ بوو ،مام باپیر ئێواران پێش ئـەوەی بەڕێ بکەوێ بۆ هەولێر پێشمەرگەکان پسولەیەکی بچوکیان بـۆ دەنووسـی جـا هەبوو بۆ دەرزی هەبوو بۆبتلە مەشروبێك هەبوو بۆپشتێن هەبوو بۆ جەمـەدانی وهتد............مام باپیر خوێندەواری نەبوو کەمێکیش بەتەمەن بـوو جـاری واهەبوو پێشمەرگە عینوانی ماڵی کەسوکاریان دەدایە لەهەرگـەڕەکێك بـا دەی دۆزیەوە ،ڕۆژێك پێشمەرگەیەك عینوانی ماڵی دایکی دا بەمام بـا پیر بۆنـەوەی مام باپیر بیان هێنێ مـام بـاپیر ڕۆیـشت لەهـەولێر زۆر دەگـەڕێ عینوانەکـە نادۆزێتەوە، ئێوارە کەهاتەوە بـۆ زیـارەت زۆربـەمان چـووین بۆپێـشوازی جـا هەرکەس بۆشتی خۆی پێشمەرگەکەش هاتبوو بزانێ مـام بـاپیر مـاڵی دایکـی دۆزیوەتـەوە یـان نـا مـام بـاپیر مـەژغولی خەڵکەکـەی دەوروبـەری بـوو پێشمەرگەکەش چەندجارێك لەسەریەك گـووتی مـاڵی داکمـت دیتـەوە سـەری لەمام باپیر شێواندبوو مام باپیریش زۆر تەنگاو بوو گووتی نەم دۆزیەوە هـەی لەهینی داکت بەم ·

ـ مام باپیر پیاوێکی زۆر سوعبەتچی بوو پیکابێکی بەرزی پێ بوو ئەوەنـدەی پشت بۆ دایك و ژنە پێـشمەرگە دانـا بـوو بۆنـەوەی سـواری سـەیارەکەیان کـا لەژێرەوەش تەماشای کردبوون جا هەرپێشمەرگەیەك توڕەی بکردبا مام بـاپیر دەیووت وازبێنە دەزانم ژنەکەت یان دایکت چی لەبەردایە ،دواتر بەداخەوە مام باپیر لەلایەن دەزگای ئەمن گیرا زۆر ئەزیە تیاندا کەبەریانـدا توانـای ئیـشی تێدا نەمابوو ·

- لەناوهێزی پێشمەرگەو بەتایبەتی ئەوانەی خێزانیان هەبوو سوعبەتی ئاوایان هەبوو،(بابەشێخ لەماڵی ئێمە دانیشتبووین نانمان خواردبوو خێزانەکەم ( نجیبه ) چای بۆتێدەکردین بابه شێخ گووتی" :براژن نابێ تۆزێک نەسیحەتی ئەحمەدکوردە بکەی چونکە زۆر چاودەگێڕێ خێزانەکەم وەڵامی دایەوەگووتی" :بابەشێخ دەڵێن تۆخوشکی جوانت هەیە تۆومرە خوشکێکی خۆتی بدەرێ وەعد بێت منیش ڕازی دەبم بابەشێخ نوقەی نەکردو دوایی گووتی" :بەخوا نەجیبە داغی کردم، ئەم شتانە هەمووی بۆکات بەسەر بردن بوو،

***شەهید بوونی فەرماندەیەکی قارەمانی یەکێتی ( بێ بەش )***

ساڵی ١٩٨٥ بوو،لەمانگی شەش ئێمە لەبارەگاکانی خۆمان بووین لەگوندی زیارەت ،دووکەرتمان چوو بوون بۆجەولەی گوندەکانی کانی بی و قورتەلاس بەلاّم برادەرانی شوعی تەقەیان لێ کردبوون ،چەند پێشمەرگەیەکیان بریندار کردبوو لەوانە مەلاسلیمان فەرماندەی کەرتی سێ بوو، کاک کۆسرەت نامەیەکی نووسی بوو بۆتیپ کەکاک تەحسین کاوانی ئەو کات سەرتیپ بوو لەشوێنی کاک هێمن ،بەلاّم کاک تەحسین مەوجود نەبوو بۆیە من لەشوێنی کاک تەحسین نامەکەی کاک کۆسرەتم جێ بەجێ کرد کەنوسیبووی "هەندێک پێشمەرگە بنێرن بۆ مەلا سلێمان و عومەر عەوێنە لەگەڵ شوعیەکان توشی شەڕ بوون"،من بەشێکی کەرتەکەی خۆم بردو چووم بەهانایان ،هێزی شوعیەکان زۆربەیان لەم شەڕە بەشداربوون ،کە گەیشتینە لای برادەران لەشەڕگە من بووم بە فەرماندەی شەڕەکە چونکە من فەرماندەیەکی کۆنی پێشمەرگەی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان ) بووم ،شوعیەکان چەند لوتکە شاخێکیان بەدەستەوە بوو هێرشمان بۆکردن، ئەوان شکان وڕایان کرد ،بەلاّم بەداخەوە لەم هێرشە فەرماندە و پێشمەرگەی قارەمان ودڵسۆزی کوردایەتی (بێ بەش ) شەهید بوو وچووە

کاروانی ئەمران ، پێشمەرگەیەکی قارەمانی تریش بریندار بوو بەناوی ( بارزان موراد )، شوعیەکانیش چەند کەسێکیان کوژرابوون بەجێمابوون بەلام ئێمە وەك کارێکی پێشمەرگانەو هەم وەك مرۆڤایەتی لاشەی کوژراوەکانی ئەوا نمان بەجلی خۆیان لەهەمان شوێن لە ژێر خاك نا ،کوژراوەکان پێدەچوو عەرەب بن هیچ ناسنامەیەکیان پێ نەبوو،مامە قالەو جەمیل حەمەدەمین دەوری باشیان هەبوو ،ئێمەش تەرمی پیرۆزی شەهید بێ بەشمان هێنایەوە گوندی قورتەلاس،شەوێك تەرمی پیرۆزی لامان بوو ، شەو تۆزێك دونیا ساردبوو بەتانیەکمان بەتەرمی پیرۆزی دا دابوو، من کە حەرەسیاتم بەدل کرد بەحەرەسەکەی دوای خۆم گووت وادەچم لەگەڵ بێ بەش دەخەوم بەلام تۆش بەحەرەسی دوای خۆت بلێ کەمن لەوێمە،دواتر کە حەرەسیات بەدل دەکەن بەیەکتری نالێن کەوا من لە لای بێ بەش خەوتوم ، حەرەسەکە زۆربەیانی بە خەبەرهێنابوو گووتبوی"جەنازەی شەهید بێ بەش وا دەجولێتەوە"دیاربوو ترسا بوو ،کاتێك من لە غەلبە غەلبی پێشمەرگەکان بە ئاگا هاتم و گووتم "کاکە گیان ئەوە چیە؟چی بوە ئەم غەلبەغەلبە؟؟ گووتیان ئەمە تۆی لەوێ ؟منیش گووتم "خۆ بە حەرەسەکەم گووتبوو"،دواتر ئەخەوتینەوە هەر ئەو شەوە تەرمی پیرۆزی بێ بەشمان بردو بەرێ کەوتین و هاتینە گوندی پیرەر لەوێ جوابم بۆ خزم و کەس و کار رەوان کرد بۆ کۆیە،ئەوانیش هاتن تەرمی پیرۆزی شەهید بێ بەشیان بردەوە بۆگوندی مام قلینج لەوێ بەخاکیان سپارد، چونکە نەیان دەتوانی بیبەنەوە بۆ شار ،من و پێشمەرگەکان زۆر زۆر بە شەهید بوونی ئەو قارەمانە دڵ گران بووین ،چونکە پیاوێکی خوێندەوارو تابلێی قارەمان و چاو نەترس و بەدەست و بەویژدان بوو ، وابریار بوو بکرێتە فەرماندەی کەرت بەلام بەداخەوە قەدەر رێی پێ نەدا ،چونکە خۆی پیرۆز بوو بۆیە رۆژی شەهید بوونەکەشی پیرۆز بوو چونکە لەرۆژی یادی دامەزرانی

کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان بووله (١٠ی ٦) ٠ شەهید مام بێ بەش دەستێکی باڵای هەبوو لە نوسینی شیعروپەخشان , ئەمەش یەکێکە لە نمونەی شیعرەکانی :-

## گەر من

گەر من بۆ تۆ رەنجە رۆمەو خۆشی لە دڵا ئەمـــــــــای
لە دووریت بووم بە بێ بەش و دڵ بێ ئەمەل ئەتۆش چەمـــای
یان دەم خنکێنی وسوتێنی وادیـــــــــــارە وابەتەمای
ئەی ئەستێرەی گەشی دوورم وا ڕاوەستـــــــاوی لەسەمـــای

ئاسمانم ئەگریێو ئەرزم خۆی لەخۆڵێ ئەگەوزێنـــــێ
بـــــەهارم لە باخچەی غەم دا خونچەم لە بۆ ئەڕازێنێ
کۆرپەی غەم هەردەم لەسەر دڵ لەسەر جەرگ ئەنازێنێ
هەربۆیـــــەش هەناسەی سەردم ڕەشەبای کۆ ئەبەزێنێ

زستانم لەبەر ســــاردی خۆی چۆن بەرگی سپی پۆشیـــوە
باغەوانم خونچەی شادیم من بــــــــە هەرزان فرۆشیــوە
لە بیدایەت تا ئاخیرەت بۆ ئەم کــــــــارەم تێ کۆشیوە
بۆیە پێستم لەو کاتەوە ووشەی بــــــــێ بەشی نۆشیوە

سەرو پرچی خۆی ئــــــەڕنێ درەختی پـاییزی دڵم
مـــــەیلی ئاوی جامی شێتی هەیە دیسان مێشکی زڵم

غـــەم لەسەر پێم دای گرتووم هەتاکو سەر پشتی ملم

بـــــــــــۆیە ئاوات خوازوهیوام بۆ مردنوگۆڕو گلم

مەیلی تەقەو تۆقی تۆقەی تاقە دەستی ڕاستی تۆمــە

گەر دوو بست لەگیانم دوور بی دڵم ئەڵێ وا لە ڕۆمـــە

گەر باوەڕ ناکەی هەر ئێستا سوێند ئەخۆم بەم نارو مۆمـە

نەگۆڕاوم وەك جارانم بێ بەشەکەی شاری کۆمـــــــــە

بـــێ بەش

١٩٧/٥/١٩

## پێشمەرگەیەکی تاقانە

ئازاد رەحمان حەمەد ناسراوبە (بێ بەش) لەساڵی ١٩٥٧ لەگوندی مام قلینج سەربە قەزای کۆیە لەدایك بووە، خوێندنی سەرەتایی وناوەندی لەکۆیە تەواکردووە، لەدوای چاو هەڵهێنانی ئازاد باوکی کۆچی دوایی دەکات، ئازاد لای دایکی و دا پیری گەورە دەبێت ،وەك هەموو خەڵکی گوندەکەمان لەشۆڕشی ئەیلول لەساڵی ١٩٧٤ بووبە پێشمەرگە تاکو کارەساتی ١٩٧٥، لەشۆڕشی نوێدا لەساڵی ١٩٧٨ پەیوەندی دەکات بەرێکخستنەکانی کۆمەڵەی رەنجدەرانی کوردستان ،ساڵی ١٩٨١بوو بە پێشمەرگە لە تیپی ٨٣ ی هەورێ دواتر گوازرایەوە بۆتیپی ٨٥ی بەرانەتی کرا بە جێگری فەرماندەی کەرت، لەبەر ئازایەتی وگورج وگۆڵی ،بڕیار بوو بیکەین بەفەرماندەی کەرت ،بەڵام بەداخەوە قەدەر رێ ی پێ نەدا لەرۆژی (١٠-٦-١٩٨٥) لە پشت گوندی قورتەلاس لەناو شاخەکان لەشەرێکی دەستەویەخەدا بەداخەوە شەهید کرا، شەهید مام بێ بەش دەستێکی باڵای هەبوو لەشیعر نوسین ،بەتایبەت شعری نیشتیمانی پارچە شعرێکی لەسەر پێشمەرگەیەك دانابوو کەشەهید ببوو ئەوە کۆپلەیەکیەتی :-

(دێم بۆ سەر گۆڕت لەساڵێ جارێ گەر وەکو تەرزە گوللە بباریٚ)

هەروەها دەنگێکی بەسۆزو خۆشی هەبوو جاروبار حەیرانی بۆ دەگووتین ،شەهید مام بێ بەش وەکو خۆی تاقانە بوو کوڕێکی چاوگەشی تاقانەشی لەدوای خۆی بەجێ هێشت بەناوی (چیا) ،قەدەر وابوو کاکە چیاش لای دایکی ودا پیری گەورە بوو.هەزاران چەپکە نێرگز پێشکەش بەگۆڕی شەهید مام بێ بەش و سەرجەم شەهیدانی کوردستان.

## کادیرێکی ئازاو تەمەنێکی کورت

شەهید فەقێ گۆمەشینی کادیرێکی ئازاو هاورێ یەکی تێکۆشەری کۆمەڵە بوو لەساڵی ١٩٧٧ کەرێکخستەکانی کۆمەڵە کەشف بوون کاکە فەقێ یەکێك بوو لەو هاورێ یانە کەبەر شالآوی گرتنی بەعسیەکان کەوت، بەهۆی ئازایی وجەربەزەیی خۆی هیچ ئیعترافێکی نەبوو، چەند ساڵێك حوکم دراو دواتر بەر لێ بوردنی گشتی کەوت و بەربوو هەرلەگەڵ بەربوونی پەیوەندی کرد بەهێزی پێشمەرگە لەتیپی٨٦ لەکەرتی ٣ ی بەردەباز من فەرماندەی کەرت بووم، کاك فەقێمان کرد بەجێگرکەرت ماوەیەك لای من مایەوە لەبەر رێك و پێکی کرا بەفەرماندەی کەرتی (٤) ماوەیەکیش لەکەرتی ٤ مایەوە بەبڕیارێکی مەڵبەند گواسترایەوە بۆ تیپی٩٣ ی کۆیە بەجێگری فەرماندەی تیپ، فەقێ جێگای خۆی لەناو جوتیاران و رەنجدەرانی ناوچەکە کردبۆوە لەگوندەکانی دەمزێ لەدەشتی کۆیە بەهۆی شۆرتێکی کارەباوە لەماڵەکەی خۆی گیانی لەدەست داو شەهید بوو دوو کۆرپەی چاوگەشی لەدوای خۆی بەجێهێشت و کورەکەی ناوی هەکاریە .شایانی باسە کاك فەقێ دووبرای تریشی شەهید کراوە بەناوی بەکرو عوسمان گۆمەشینی و ئەوانە هەر بەبنەماڵە خەڵکی شۆرش گێروکورد پەرومر بوون سێ براشیان ماوە بەناوی مامۆستا تاهیر وکاك هەژاروکاك سابیر ئەوانیش تائێستا لەخەبات کردن بەردەوامن ، گوندی گۆمەشین تێکۆشەری تری زۆرهەبوو لەوانە :

ـ سەید جەمال گۆمەشینی خۆی ودووبرا ئەوانیش شەهیدی شۆرشی نوێن.

ـ فوئاد محەمەد گۆمەشینی ناسراو بە (فوئادە گچکەل) لەبەر ئازایەتی خۆی پلەکانی پێشمەرگایەتی بری کرا بەفەرماندەی کەرتی (٦) لەگرتنی

زنجیرەیەك ڕەبیە لەسەرجادەی پردێ-هەولێر نزیك گوندی شێراوە شەهید کرا.

## شەڕی زیارەت ١٩٨٥

لەزستانی ساڵی ١٩٨٥ دوژمن هێرشێکی هێنا لەگوندی زیارەت و ناودارۆکان و بیرۆکان و سولاوك ، ئێمە وەك تیپی بەڕانەتی ناو دێی زیارەتمان چۆڵ کرد وکەرتەکانمان دابەش کرد مەلاسلێمان و بورهانی سعید سۆفی بۆ ناودارۆکان، منیش بۆ کەپکی شیلانە شاخی پشتی زیارەت ، عومەر عەوێنەو کاك سابیر ڕەسوڵ بۆ پشتی دێی زیارەت علی مسیفی مەفرەزەیەکی ڕێکخراوی کۆمەڵە بۆ سەر ڕێی ئیشکۆر و (سوسێ سماقوڵی)، بەیانی زوو بوو دوژمن بە کۆپتەر جوندی دابەزاند لەسەر شاخی پشتی ئێمە ,لە کەپکی شیلانە هێزەکەی دوژمن سەد ئەوەندەی هێزەکەی ئێمە بوو لەڕووی ژمارەو چەکەوە ،لە پشتی زیارەت و ناو گوند لەگەڵ کاك سابیر ڕەسوڵ و برادەران لەسەعات نۆی بەیانی لە (١٢-١٢-١٩٨٥) بوو بەشەڕ ،هەر لەو شەڕەدا چەتۆی موهەندیس شەهید بوو کاك سابیریش بریندار بوو، جاشەکان گوندی زیارەتیان سوتاند و ماڵی پێشمەرگەکانیان بارکردو بردیان بەماڵەکەی منیشەوە ( بەرمیلێك نەوتی پڕ) ،من سەیارەکی مۆدێل (١٩٨٣) م هەبوو لە جۆری لاندگرۆزەر بردیان، خێزانەکەم لەگەڵ سێ منداڵ بەیانی زوو لەبەر خۆمانەوە لەئەشکەوتێکم دانا بوو (( ماڵی خۆمان لەگوندی مام قلینج بوو بەلام چەند ڕۆژێك پێش شەڕەکە خێزانەکەم هاتبووە سەردانم سوکەماڵێکیشی هێنابوو لەگەڵ بەرمیلە نەوتێك ،چەند ڕۆژێك پێشتریش کوڕێکمان خوا دابووی دایکی هێنابووی بۆلای من بۆ زیارەت لەوێ ناوم نا ( سەردان) ، سەردان ئێستا خاوەنی ژن وماڵە و پیاوێکی

بەرەحمیشە بۆ سەردانی خزمان )، ناوچەکە ژن و منـدالّی زۆر کـەم لـێ مـابوو زۆربەیان ئێوارەی پێشوو رۆیشتبوون، ئەو رۆژە تا ئێوارە ژنەکەم و مندالّـەکانم هیچ خواردنێکیان نەخواردبوو ، هێزی دوژمن تا نزیك ئێوارە زالّ بوو، سـەعات چواری ئێوارە کۆپتەرهات بۆ هەلّگرتنـەوەی جوندیـەکان ئێمـە بـەئاربیجی و بیکەیسی تەقەمان لێ کردن بەلاّم ئەوان رەدیـان نەدانیـەوە خێـرا رۆیـشتن ، سـەیارەکانی جـاش و جەیـشی شـەعبی لـەناو گونـدی زیـارەت و سـولاوك کۆبیوونـەوە، سـەیارەیەکی تویّتـا پیکـاب دەهـات بـۆ ئـەو شـوێنەی کـەمن مندالّەکانم لێ دانا بوون، منیش لەبەیانیەوە زۆر پەست ببووم دەستم گەیاندە قەناسەکەو رام کردە خوارەوە بەرەو رووی پیکابەکـە چـەند پێـشمەرگەیەکیش بەدوام داهاتن دووسـێ فیـشەکی قەناسـم لـە پیکابەکـە گـرت ، سـایەقەکە سەیارەکەی بەجێ هێـشت و لەگـەلّ یـەك دوو جـاش رایـان کـردو هـەلاّتن ، پێشمەرگەکانمان بەگشتی هاتنـە خـوارەوە کـەزانیان مـن سـەیارەکەم گـرت ،چوومە سەر سەیارەکەو تەماشام کـرد دوو کلاشـینکۆف و تـاخمـەی تێـدا بـوو لەگەلّ دوونەفەر کەباب و یەك فەردە سەمونی گەرم رووم کردە برادەران و ووتم " برادەرینە دەلّێن ئەوەی لەخوای غافلّە کافرە راکەن سەمونی گەرم بخۆن "رۆژ بەرەو ئاوا بـوون دەچـوو تەقـەمان لەسـەیارەکانی نـاو گونـد کـردو چـەند ئاربیجیەکمان تێگرتن ، ئەوانیش بەرەو لای دەربەندی گۆمەسپان رایان کـردو گەرانەوە ئینجا گەرامەوە بۆ لای مندالّەکانم لە ئەشکەوتەکە کەچاوم پێ یـان کەوت زۆرم دلّ پێ یان سـوتا هـەموویانم ماچـکردو چـەند سەمونێکیـشم بـۆ بردبوون دواتر سواری پیکابەکەم کردن بەرەو سماقولّی گرتك چـووین چـونکە گوندی زیارەت بەتەواوی سوتابوو هیچی لەسەر هیچ نەمابوو بۆ ژیان بەکـەلّك بێت تەنیا من بوومە خاوەنی پیکابێك و یەك فەردە سەموون ، مندالّەکانم بردە مالّی پێـشمەرگەیەك لـەسماقولّی گرتـك بـەناوی ( خـەلیل حمـەدەمین کـە

خێزانەکەی کچی خوشکمە ) چەند رۆژێك لەوێ مانەوە دواتر دەنگی ئەوە هەبوو دووبارە رژێم هێرش بکاتەوە بۆ ئەم دۆڵە ، ژن و منداڵی ناوچەکە چۆڵیان کردو رۆیشتن منیش ناچار بووم منداڵەکانی خۆم بنێرم بۆ گوندی گۆمەتاڵی سەیدان بۆ ماڵی ( حاجی محێدین و حەتەمی کوڕی ) چونکە خزمایەتیەکیان لەگەڵ ماڵی خەسوم ، داهەبوو( خەسوشم لەوێ چاوی بەمنداڵەکانم کەوتبوو، خەسوم زۆر بەدوامانەوە هیلاك بوو، سێ کوڕیشی لەگەڵ من پێشمەرگە بوون بەناوەکانی ( مامە قالە، نادر ئیمام، حسێن ئیمام ) ، چەند رۆژێکیش لەماڵی حاجی محێدین مابوونەوە پێشمەرگەیەکیشم لەگەڵ ناردبوون بەناوی ( نازم تەها، ئەویش کوڕی خوشکم بوو ) دواتر چووبوونە گوندی کانی دمربەند چەند ماڵە برادەرێکی من هەبوو لەوێ خێزانەکەم دەیناسین بەناوی ( عەباس ڕەحمان و ڕەسوڵ ڕەحمان کەبرابوون ، ( پیرەداکێکیان هەبوو بەناوی ئەخشین بایز کەدایکی هەموو هێزی پێشمەرگە بوو شەو کەدەچووینە ماڵەکەیان شوێنەکەی خۆی بۆ ئێمە چۆڵ دەکرد وتا بەرەبەیان نەدەخەوت وەك حەرەسێك بەدەم دانیشتنەوە خواردنیشی بۆدروست دەکردین ) منداڵەکانی ئێمە چووبوونە ماڵی پورە ئەخشین ئەوکاتە کاك عباسی کوڕی هێشتا ژنی نەهێنابوو کاك ڕەسوڵیش لەگەڵ خۆیان بوو بەڕێکەوت ئەوکاتە بەفروباران بوو بەفرێکی زۆرکەوتبوو سەیارە بۆهیچ شوێنێك دەرنەدەچوو عەباس یەك دوو گوێدرێژ پەیدا دەکات لەگەڵ هەندێك بەتانی وکەل وپەلی ماڵی خۆیان بۆیان دەپێچێتەوە دوای شەوێك حەسانەوە، لەسەر داوای خێزانەکەم دەیان بات بۆگوندی بانی ماران کەدەگەنە گوندی بانی ماران بەفرهەرلەبارینە بەلام لەبانی ماران ڕوودەکەنە چەند ماڵێك بەداخەوە هاوکاریان ناکەن ونەوتیشیان پێ نادەن بچن لەمزگەوتیش بخەون لەوێش داوا لەعباس دەکەن بیان با بۆدێ ی شاخە پێسکە ، هەر لەگەڵ گەیشتنیان

بۆگوندی شاخە پێسکە دەچنە ماڵی کاك خالید وکـاك حمیـد پـیرە ژنێکیان هەبوو بەناوی پورە نازدار زۆر ڕێزیان لێ دەگرێ وخۆیان بەقوربان دەکات دەڵێ هیچ خەمتان نەبێ ئێوە خێزانێکن لەخێزانەکانی خۆمان وخانویان بـۆ پەیـدا دەکەن وچەند ساڵێك ماڵەکـەی مـن لەشـاخە پێـسکە مایـەوە بـەهۆی باشـی ودڵسۆزی خەڵکی گوندی شاخە پێسکەوە دواتر زیـاتر لـە (١٠) کەسـیان بـوون بە پێشمەرگە لەگەڵ من ئەوەی جێگـای باسـە ئـەوەی کـاك عـەباس و ڕەسـوڵ ونەخشینی دایکمان بۆ ئێمەوهێزی پێشمەرگەیان کردوە بەلاپەڕەیـەك و دووان باسی ناکرێت من تەنها بەوە دەتوانم لێرە دەستخۆشی زۆریان لێ بکەم وبڵێم تـا خێزانی ئاوا لەناو لادێکانی ئێمەدا مابێ هێزی پێشمەرگە هـەر سـەر کـەوتوو دەبێ .وە مامۆستا عوسمانیش کە برای کاك ڕەسـوڵ و کـاك عـەباس بـوو لـە شاربوو ئەندامی کۆمەڵە بوو لە تە نزیمی شـار ئیـشی دەکـرد چـەند جارێـك لەماڵی کاك ڕەسوڵ یەکترمان بینیەوە ئەویش پیاوێکی شۆڕش گێـڕو خۆبـەخش بوو بۆ کۆمەڵەو هێزی پێشمەرگەی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستـان).

ئەو فەرماندەو پێشمەرگە قارەمانانەی بەشداربوون لەشەڕی زیارەت تیپی ٨٥ ی بەڕانەتی

(سابیر ڕەسول-ئەحمەد کوردە-شێخ خالید –مـەلا سـلیمان- بورهـان سـعید سۆفی-عەلی مەسیفی-عومەر عەوێنە-عەلی کەوری-مام صـالح-فـاروقی مـام صالح-سەنگەر-هەرێم کەمال ئاغا-چەتۆی موهەندیس-حەمە عەلی –ئەمیر-سەرکەوت-تۆفیق قەلاچۆغانی-سەلام محمد گۆران-حەسەن عەوێنە-سیامەند گردەچاڵ-هیوا-سەفین-هونەر-دلشاد حەلاق-حەسەن کاکـە-سـەردار سـەعید سۆفی- قازی-عبداللە مەلا-ئەحمەدە-مامۆستا ئەحمەد مەلا-حاجی مەسیفی-سامان-کەمال-ئیدریس حـاجی-قـەهار-کـەمال مەسـیفی- محمـد گـاینجی-ئیسماعیل بچکۆل-سابیر بکر-خلیل حمدامین-جمیل حمدامین-بـارزان مـوراد-

مامە قالە-ئیسماعیل مفدید-نادر امام-شێرزاد سابیر-شێرۆی سایەق-کەمال ئەنوەر- سدیق خەزنەیی-دیار مەلای ئاشگە-بەهرام مەلا قەرە-ئەعمان مەلا قەرە-کەمال شینە-ئەسرەت-محمد تورکمان-سابیر هەژار-لەتیف شورتە-مەعروف عەزیز باخچەیی-کاوە تەها- سعدی مامە هەولێری- سدیق سابیر گردیشی ) ٠

## هێرش بۆ سەر مەڵبەندی سێ

لەسەرەتای ساڵی ١٩٨٦ پێشتر دوژمن هێرشی کردبوو بۆ سەر گوندی زیارەت و دەوروبەری ، نیمچە سەرکەوتنێکیان بەدەست هێنابوو بۆیە لەمانگی ( ١ ) دووبارە هێرشی هێنایەوە بۆ سەر گوندی سماقولی سەروچاوە کە بارەگای مەڵبەندی ( ٣ ) ی لێ بوو ، پێشتر بەڕێز کاك کۆسرەت بە بۆردومانی فڕۆکەکانی دوژمن لە گوندی سوسێ بریندار بوو چووبووە دەرەوەی وولات بۆ تیمار .
ئەندامەکانی مەڵبەند ( شێخ عەلی ، شێخ محمد سەرگەڵویی ، مامۆستا چەتۆ ، مامۆستا بەکر ) ئەوانە هەموویان لە مەڵبەند بوون ، شێخ عەلی حمە صاڵح لەجێگای بەڕێز کاك کۆسرەت سەرپەرشتی ئەم شەڕەی کرد ، شێخ عەلی بروسکەی کردبوو بۆ تیپەکانی خوارەوە بەلام هەموویان پێ رانەگەیشتن بۆیە ژمارەیەکی کەم پێشمەرگە لەدەوروبەری مەڵبەند هەبوو، ئەو رۆژە لە بەیانیەوە تاکو سەعات ( ٩ ) ی شەو شەڕی باشمان کرد بەلام وەك باسم کرد هێزەکان نەگەیشتبوون بۆیە برادەرانی مەڵبەند وایان بەباش زانی کە پاشە کشێ بکەین بۆ لای گوندەکانی ( فریزومەندێر ) کە کەدەکاتە چیای پشتی گوندی کونە فلوسە

ئێمە بۆماوەی ( ٣ ) رۆژ ناوچەی سماقوڵیمان بەجێ هێشت، دوژمن گوندەکانی سماقوڵی سوتاندو گەڕایەوە دەربەندی گۆمەسپان، ئێمەش دووبارە گەڕاینەوە شوێنەکانی خۆمان و مەڵبەندمان دامەزراندەوە .

بەڕێز کاک کۆسرەت گەڕایەوە ناوچەکەو جۆش وخرۆشی هێزی پێشمەرگەی دایەوەو دووبارە گۆڕانکاریەکی تریان دەست پێ کرد ، دوای ئەم شەڕە من نەقڵ کرامەوە بۆ تیپی ( ٨٦ ) ی دەشتی هەولێر فەرماندەی کەرتی ( ٥ ) ی گۆڕقەرەج ، ئەوکاتە کەرتەکەمان لەنوێ دامەزراندەوە و پێشمەرگە لەگەڵ دابوو کەرتی ( ٦ ) دامەزرا

## بۆسەیەک

لەساڵی ١٩٨٦ شەڕی ئێران عێراق بوو شەڕ لەگەرمەدا بوو لەحاجی ئۆمەران کاک تەحسین دیبەگە زۆربرادەرم بوو رۆژێک هاتە لام ئەو کاتە لەتیپی بەرانەتی بووم کاک تەحسین عوسمان دیبەگەیی لەتیپی ٩١ فەرماندەی کەرت بوو گووتی با چالاکیەک بکەین پێکەوە منیش گووتم زۆر باشە رێک کەوتین کەوا بچین بۆسەرجادەی کەسنەزان ، بەرێ کەوتین لەزیارەت بۆ لای ماڵی حەسەن جوانی خەیلانی ( زۆر پیاوێکی وریاو ئازاو نیشتیمان پەروەر بوو ) بۆیەیانی بەرێ کەوتین بۆ سەرجادەی کۆیە هەولێر بەدووری تەنها یەک کیلۆ مەتر لە پشتی شارۆچکەی کەسنەزان دەمەو ئێوارە بۆسەمان داناوە بۆ پیاوانی رژێم ، کاروانێکی جاش کەوتنە بۆسەکەوە تەقە دەستی پێکرد چەند جاشێک کوژران و حەوت جاشیشمان بەدیل گرت ، یەکێک لەدیلەکان ئامرمەفرەزی جاشەکان بوو خەڵکی مەسیف بوو ناوی حەیدرلاوکۆ بوو، بەلام ئەو گووتی من وەرەقەی کاک کۆسرەتم لایە بردمان بۆلای بەرێز کاک کۆسرەت ئەویش بەری دا دەست

خۆشیشی لەنێمە کرد،دەست کەوتمان سێ سەیارەبوو لەگەڵ چەندین چەکی جۆراوجۆر ٠

داستانی سێ گرتکان و شەهیدبوونی خۆشەویستترین فەرمانده ( ١٩٨٦ )

شەوی ( ١٠/٩ ی ٧-١٩٨٦ ) نامەیەك لەکاك فاروقی عەلی مەولودەوە دەگات بەدەستی شەهیدی فەرمانده ( ڕەنجدەر ) ی خۆشەویست ،کەگوایا رژێم بەنیازە هێرش بکـــــات بۆ سەرناوچەکە ،چونکە هێزێکی زۆری لە شارۆچکەی تەق تەق ئامادە کردووە ، لەوکاتەشدا ئەو فەرماندەی کەرتانە لەناو گوندی سێگرتکان بوون ( شەهید ڕەنجدەر فەرماندەی کەرت ،نوری قادر فەرماندەی کەرت،قارەمان شینە فەرماندەی کەرت ) دوای گەیشتنی نامەکە کۆبونەوەیەك دەکەن بڕیار دەدەن کەبێ شەڕ ناوگوندی سێ گرتکان چۆل نەکەن .شەهید ڕەنجدەر دوو پێشمەرگە ڕەوانی لای مام غەفور دەکات بۆنەوەی تۆپێکی ( ١٠٦ ) یان بداتێ بۆلێدانی دوژمن ،بەلآم مام غەفور تۆپەکەیان پێ نادات بۆنەوەی شەڕ نەکەن لەناو گوندی سێگرتکان ،بۆیەیانی هێزەکان دابەش دەکەن بەم شێوەیە :-

ـ ( شەهید ڕەنجدەرو زانا کوشافی وشەهید یاسین معلم و شەهید جەوادە شێت وشەهید حاجی و مام عەلی دوشیوانی و حمدامین تەلەرخێمی و گۆران و حمیدو دینۆو شەهید ئیبراهیم ) بۆسەرەتای گوند لە ڕۆژهەلآتی دێ.

ـ ( قارەمان شینەش بەچەند پێشمەرگەیەکەوە بۆ ڕۆژ ئاوای دێ پشتی مەکتەبەکە )

ـ ( نوری قادر لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك بۆ بەرزایی گردی ناو گوند ).

ــ ( شەهید ڕەوەنــد وشــاکر سۆربەشــی و کــاوە بــێ کــەس وحمیــدو دینــۆ ) بۆیەرزایی بەرجادە.

ــ ( مامۆستا خالیدو هاشم زمارەیی و سەربەست و عدنان خورمەلەو شـەهید عزالدین وتوانا سەید عوبێدی ) بۆناوڕاستی گوند

دوژمن هێرشی کرد کاتژمێر ( چواروچارەگ ) ی بەیانی شەڕ دامەزرا لە ڕێکەوتی ( ١٠-٧-١٩٨٦ ) ،لــەقۆڵی شــەهید ڕەنجــدەرەوە بــەناربیجی دوو ســەیارەی جاشیان سوتاند لەسەر جسرەکە بەلام ڕژێمی بەعس هێزێکی زۆری بە پشتیوانی تانك و هەلیکۆپتەر هێنابوو تۆپ بارانێکی زۆریش لەبەری بیست و یەکەوە بــۆ ژمارەیەکی کەمی پێشمەرگە ،ئەوەی جێگای لەیاد نەچوونە قــسەکەی شــەهید ڕەنجدەرە کە گووتبووی" تا شەهید نەبین ناو دێ چۆڵ ناکەین "زۆر بەداخــەوە لەدەوری سعات نۆ کاکە ڕەنجدەر شەهید دەبێــت لەگــەڵ یاســین معلــم و شــاکر سۆربەشی هەزاران سڵاو لەگیانی پاکیان ،بەداخەوە حەمیــدو دینــۆو ئیــبراهیم بەدیل گیران دواتر حمیدو دینۆ بەربوون ئیبراهیمیش لەسێدارە درا هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی کاکە ئیبراهیم ،عدنان خورمەلەو کاوە بێکەس وحمــە دیــسکۆ و حمدامین تەلەرخێمی بریندار بوون ،شەڕ تا دوای نیوەڕۆ بەردەوام دەبێ دواتــر وردەوردە هێزی پێشمەرگە ناودێ چۆڵ دەکــەن. شــەهید خاڵــە یوســف و بــەکر گردەسۆری هەوڵیان دابوو بچن بــەهانای شــەهید ڕەنجــدەرو بــرادەران بــەلام کۆپتەرەکان ڕێگەیان نەدابوو.

<u>سوپاسی مام حمدامین تەلەرخێمی پێشمەرگەی دێرین دەکەم بۆ پێدانی ئەو زانیاری یە ٠</u>

شەهید رەنجدەر زۆر برادەرم بوو،کوڕێکی قسەخۆش و دەنگێکی خۆشی هەبوو گۆرانی یەکانی هونەرمەند حەسەن زیرەکی دەگووتەوە کاتی خۆی دوو گۆرانی حەسەن زیرەکی لە ئیزاعەی کوردی بەغدا تۆمار کردبوو ،خۆشەویستی جوتیارانی ناوچەکە بوو ، لەگوندی (گ) کچێکی خۆشدەویست لەدوای شەهیدبوونی رەنجدەر من و شەهید خاڵە یوسف چووینە ئەو گوندە کچەکەمان بینی پێی گووتین توخوا مەیێن بۆ ماڵی ئێمە چونکە رەنجدەرتان لەگەڵ نی یە من و خاڵە یوسفیش تێر گریاین و بە پەژارەوە گەڕاینەوە , هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی شەهید رەنجدەروکاکە ئیبراهیمو سەرجەم شەهیدانی رێگای رزگاری کورد وکوردستان

***<u>سوودەکانی شەری ( عێراق- ئێران ) بۆگەشەکردنی شۆرش</u>***

هەرلەدروست بوونی شەڕی نێوان عێراق وئێران میللەتی ئێمە لەکوردستانی عێراق بەشەڕێکی نارەوایان دەزانی بۆیە بووە هۆی گەشەکردنی هێزی پێشمەرگەی کوردستان وە زۆربەی ئەوکەسانەی کەناوی عەسکەریان دەهات یان گەنج بوون و هەستی نەتەوایەتی وکوردایەتیان هەبوو پەیوەندیان دەکرد بەهێزی پێشمەرگەی کوردستانەوە ،زۆربەی ئەو سەربازە کوردانەی کەلەریزەکانی سوپای عێراقی بوون هەستی کوردایەتیان هەبوو پەیوەندیان دەکرد بەهێزی پێشمەرگەوە ئەوە لەلایەك ،لەلایەکی ترەوە ئەوکەسانەی کەخاوەن شەهادەو بروانامەبوون ( مامۆستاو دەرچووی ئامادەیی ومعهدەکان وکۆلیژەکان ) ئەوانەی نەبوون بە پێشمەرگە لەلادێکان دانیشتبوون

شۆڕشی نـــــــــــوێ ی گەلەکـەمان بەسەرپەرشـتی ڕاســتەوخۆی یـەکێتی نیـشتمانی کوردسـتان بـە بەرنامەیـەکی ڕێـك و پێـك زۆربـەی هـەرە زۆری ئەوکەسانەیان ڕێکخست لەدێهاتەکانی کوردستان بۆ وانە گووتنەوە ئەمە بووە هۆی پڕکردنەوەی بۆشایی یەکی گەورە لەڕووی نەخوێندەواریەوە لەناوچەکانی ژێر دەسەلاتی شۆڕش ( مـن پـێم وایـە ئەوکەسـانەی ئـەوکات لەدێهاتـەکانی کوردسـتان خـەریکی وانـە گووتنـەوەو خوینـدەوار کردنـی خـەلکبوون هـیچ جیاوازیەکی ئەوتۆیان نەبوو لەگەڵ ئێمە کە پێشمەرگەبووین ).

هەروەها بووە هۆی لێك بەستانەوەی خەلکی شار بەدێهاتەکانەوە چونکە وای لێهاتبوو سەربازی ڕاکـــــــــردوو لەهەمووگوندەکانی کوردسـتان لەگـە نجی گونـدەکان زۆرتربـوون، لـەڕوی کۆمەلایەتیـەوە قـازا نجێکی زۆری هـەبوو بۆتێکەلاوی شارو لادێ چونکە هەرکەسێك لەهەرگوندەك بووایـە مانگانـەخزم وکەس وکاری دەهاتن بۆسەردانی لەئـە نجامی ئـەوهات وچـۆیە تێکەلاویـەك پەیدا دەبوو لەنێوان خەلکی شارو لادێ تاوای لێهات زۆرکەس لـەلادێکان ژنـی هێنا ومزۆرکەسیش لەڕێ ی ئەو پەیوەندیانەوە کچـــــــــــەکانی خۆیان دەدا بەخـەلکی لادێ بۆیـە دەتـوانم بلـێم بـووە هـۆی گـۆڕین و پێـشکەوتن و ووشیاربوونەوەی خەلکی لادێ دورە دەسـتەکان وەك ناوچـەی مەلـەکان ودۆلـی جافایەتی و دۆلی مەلەکان وناوچەی وەرتێ وگونـدەکانی دەوروبـەری و دۆلـی بالیسان هتد.....

چـونکە ئەوناوچـانە سەرچـاوەی کۆبونەوەوحەواندنـەوەی هـەموو سـەربازە ڕاکردووەکانی ( فیرار ) سوپا بوون

لەکۆتاییدا ئەنفالیش سەبەبێکی شەڕی عێراق ونێران بوو چـونکە خـەلکی کوردسـتان وەك ئـەوەی ڕژێمـی بـەعس دەیویـست ئـاوا بـەژداری نـەکرد ،بۆیەحوکومەتی ڕژێمی بەعس بە پیلانی عەرەبە شۆڤینی یەکان ئەو ئەنفالـە

بەدناوومالْ وێرانیەیان داهێنا ئـەو نەهامـەتی یـەیان بەسـەرمیللەتەکەمان ( میللەتی کوردی شۆڕشگێر ) داهێنا کەبووە هۆی لەناوبردنی بەشـێکی میللـەتی کورد ( ۱۸۷۰۰۰ کەسی بێدیفاع ) بەئەنفال وکمیابارانەوە کەعاقیبەتەکەی بووە هۆی لـەگۆڕنانی سـەرانی رژێـم خۆیـان ٠بـەلاْم شۆڕشـگێڕانی میللەتەکـەمان هەربەردەوام بوون لەخەبات تا ئەمرۆ دروست بوو.

## بەرگری قەیوان ماوەت لەمانگی ۹ /۱۹۸٦

چـەند رۆژێـك پێـشتر ئێمـە بەبروسـكە ئاگـادار کرابووینـەوە کەبـچین بۆسەرکردایەتی,ئەوکاتە من لەتیپی ۸٦ ی دەشتی هەولێر فەرماندەی کـەرتی پێنج بووم کەرتەکەم نزیکەی ( ٤٠ ) پێـشمەرگەبووین کـاك جـەلال ئیلنجـاغی جێگرکەرت بـوو, محەمـەد چاوشـین فەرمانـدەی مـەفرەزە بـوو, مامـە قالـە فەرماندەی مـەفرەزە بـوو ،کەرتەکـەی ئێمـە بارەگامـان لەگونـدی مەوکەبـە دانابوو،تیپی ۹۳ ی کۆیە لەسـەر شـاخی خـەمزە جەبهـەیان پـێ سپێردرابوو ,لەشەوی ۱ /۹ /۱۹۸٦ دوژمن لەسەری ئەزمیر بەرەو گوندی خەمزە چیای دووبرا هێرشی دەست پێ کرد تیپی ۹۳ ی کۆیە بەسەرپەرشـتی بـەرێز کـاك رەهبـەری سەید برایم شەرێکی ( ۷۰ ) سەعاتیان لەوشـاخە رووتـە لەگـەلْ ئـەو دوژمنـە بەهێزەی جەیشی عێراقـی کـرد، دوژمـن زیـانی زۆر بـوو لـەو شـەرەدا یـەك پێشمەرگە شەهید بـوو, قـۆلی دووەم لـەبناری خـەمزەوە بۆگونـدی نۆمـەراغ وسەرشاخی هەرشینە رۆژی یەکەم من کاك جـەلالم لەگـەلْ ( ۲۰ ) پێـشمەرگەی کەرتەکەمان لەگەلْ کەرتەکانی تریش چـەند هێرشـێکیان تێـك شـکاند رۆژی دووەم هێرش بەردەوام بوو لە سەر شاخ بەرەو شاخی قەیوان لـەخوارێوە بـەرەو گوندی مارەڕەش و مەوکەبە. لـەمارەڕەش ئەسـوەدی خـدری عـارف لـەوێ بـوو

فەرماندەی کەرت بوو لە تیپی ٩٣ بوو دەبوایە کەرتەکانی ئێمە بەدلی بکەن بەلام شارەزانەبوون مام غەفوریش بە پەلە هێزەکانی دابەش دەکرد بەکاك عەلی پونکینەی گووت ئەو دۆڵە بگرە دەچیە ناو هینی ئەسوەدی خدری عارفی ,بەو قسەیەی مام غەفور زۆر پێکەنین شەری قەیوان ماوەت نزیکەی ٢ مانگی خایاند رژێم زۆر شوێنی گرت چیای دوبرا زۆر رووتە شاخ و دارو گابەردی نی یە سەری تەختە شاری سلێمانی تەنها ٢٠ کیلۆ مەتر لەمعەسکەر سەلام دوورە بەردەوام تۆپ باران دەکراین وکۆپتەر لەنوێ چەکێکی بەکاردەینا بەسلك بوو دەبوایە لە هەدەف بدات ئینجا ئەی تەقاند، تەیارەی پیلاتۆز مەیدانی شەرەکەیان تۆپ باران دەکردو خانوو بەرەی هاوولاتیانیان دەروخاند وە جارو بار رەزو باخچەکانیش دەسوتان. کاك رەهبەر مقەری لەگوندی قەیوان بوو لەبیرمە رۆژەکیان پێشمەرگەکان دابەش دەبن دوو دوو خواردنیان تێ کردبوو بۆ نانی نیوەرۆ گوللە هاوەنێك لەناو مقەرەکەیان دەکەوێتەوە بە مە نجەلی خواردنەکەیان کەوتبوو شلەی پەتاتە بوو لەخۆیان وابێ هەموویان برینداربوون بەلام دوایی زۆر سەلامەت بوون بەلام شلەی پەتاتەکەیان پێ کەوتبوو لەلایەك پێکەنینمان پێ یان دەهات لەلایەك دیمەنێکی خەمناك بوو. من لەگوندی مەوکەبە بووم کاك صلاح چاوشین مەسئولی عەسکەری بوو لەم جەبهەیە نامەی مام غەفورم بۆ هات کە بچینە گوندی مارەرەش لەگەل کاك جەلال و برادەران یەکترمان گرتەوە. لە مارە رەش پیاوێکی لێ بوو بەناوی غەریب کونجرینەیی زۆر لەمێژ نەبوو ببوو بە پێشمەرگە کاك صلاح نامەکی بۆ مام غەفور نووسی بوو دەڵێت بەرێز مام غەفور هاوکاری غەریب بکەن و بەقسەی بکەن مام غەفور تورەبوو گووتی ئەحمەد کوردە غەریب پیاوێکی خراپە منیش جوابم دایەوە گووتم نازانم باشە یان خراپە چونکە نای ناسم. مام غەفور تورەبوو گووتی وەرن بابرۆین بۆ لای صلاح چاوشین ئەویش لەقەیوان بوو

چووینە لای کاك صلاح سەلامی ئەکرد گووتی غەریب کونجرینە هەر رۆژێ شتێکەو من باشترین پێشمەرگەو فەرماندەم لەگەڵن بەقسەی غەریب ناکەم کاك سەلاح پیاوێکی زۆر نەرم و نیان بوو گووتی باشە مام غەفور من هەڵۆ دەنێرم ( هەڵۆی مام ئەحمەد کوردە ) مام غەفور کەگوێی لەکوردەکە بوو گووتی باشە منیش ئەحمەد کوردە دەنێرم کەرتەکەی من لەگەڵ کاك هەڵۆ ،مامۆستا جەمال ( جەمالی عەبەڕەق ) شەو هێرشمان کرد ئەوشوێنانەی گیرابوو گرتمانەوە لەگەڵ تیپی ٢١ شەوانە هێرشمان دەکردوبەڕۆژ دوژمن هێرشیان بۆ دەکردینەوە، مام بێستون پیاوێکی زۆر بەتوانا بوو جێگیر تیپی ٢١ ی کەرکوك بوو لەوشەڕە شەهید بوو،من وکاك عەلی بەڕێکەوتین من بۆ سەرشاخی قەیوان کاك عەلی پونگینە بۆ مارەڕەش ئەوشەڕە درێژەی خایاند شەوێکی تر شاخی قەیوان گیرابوو من وکاك عەلی پونگینە،حەمەی تەیب تیپی ٢٣ ی سورداش هێرشمان کردو شاخەکەمان گرتەوە بەلام بەداخەوە حەمەی تەیب چاوێکی لەدەستدا ،چالاکیش کەفەرماندەی مەفرەزەبوو لەگەڵ کاك عەلی پونگینە ئەویش بریندداربوو پێشمەرگەیەکیش شەهید بوو بەداخەوە ناویم لە یاد نەماوە، لەگوندی مالومە بەڕێز کاك کۆسرەت خێمەیەکی هەڵدابوو چاودێری جەبهەکانی دۆربێشك وکارێزەکۆن وقەیوانی دەکرد بەزۆری ئەوانەی لەگەڵ بوو ( شەهید رێباز ،مامۆستا بەکر ،مامۆستا ئەحمەد ،سابیر رەسوڵ )،لەوسەرو بەندەدابوو بەداخەوە هەواڵی شەهید بوونی دوو کوڕی کاك کۆسرەتمان بیست هەمووومان زۆرنیگەران بووین بەلام کاك کۆسرەت خۆی نەی زانیبوو تارۆژێك کاك ئەوشیروان نامەی بۆ ناردبوو لەسەر گەلۆ مەسەلەکەی لە کاك کۆسرەت گەیاندبوو بەلام کاك کۆسرەت دەی ویست دوای ئەوخەبەرەش نەگەڕێتەوە بۆ سماقوڵی بەڕێز مام جەلال و کاك ئەوشیروان بەزۆر ڕەوانیان کردەوە. لەتیپی ٨٦ ئەوەی دەوری هەبوو کەرتەکەی ئێمەو کەرتەکەی عەلی پونگینە وکەرتی

تیپ ودەستەکانی مام غەفورو کاك ڕێباز بوو , بۆ مێژوو راند جەلال لەبیرنەکەین کەوا گەورەترین دەوری بینی لەشەڕی قەیوان لەزۆربەی شەڕەکان ئەوانەی لەگەڵ بوو چونکە جگە لەکادیری ئەو چەند کەسە دەورەی هاواناتیان بینی بوو مامۆستا سەیفەدین ،مامۆستاڕێبوار ،تەلعەت خدر ،بێستون ، ئەوانە هەموویان دەوری باشیان هەبوو لە پشتیوانی کردنی پێشمەرگە ,تیپی۸۷ی قەرەچوغ بە سەرپەرشتی کاك سەفین مەلاقەرە لەگەڵ هەموو فەرماندەی کەرتەکان وە مامۆستا تەحسین رابەری سیاسی لەجەبهەی دۆلی بێشك چەندین شەوو رۆژ شەڕیان کرد بێنەوەی کەس بەدلیان بکات ئەوانیش دەسکەوتیان هەبوو شەهید و بریندارێشیان هەبوو ،لەشەوی شەڕەکەی مارەڕەش کوڕێکمان لەگەڵ بوو ناوی یداللە بوو خەلکی گۆمەشین بوو جەلال ئیلنجاغی خۆشی دەویست بەزۆری لەگەڵ ئەو دەگەڕا خەڵك وایان دەزانی کوڕی خۆیتی بەلأم کاك جەلال ژنی نەهێنابوو ئەوشەوە دوو دەبەناومان پێهەلگرتبوو چونکە چەکی پێ نەبوو لەشانسی وی ئەوشەوە کەس داوای ناوی نەکردبوو ئەویش ماندوو دەبێ و دەبەکیان دەرێژێ منیش دیتم پێم گووت دەزانم زۆر هیلاك بویی بەلأم ئەگەر لەو شەڕە شەهید نەبووین ئەواچەکەکی باشت دەدەمێ بەم شێوەیە کە پێشتر کارێزە کۆن گیرابوو دوژمن هێواش هێواش شەڕەکانی کەم دەکردەوەو لەشوێنی خۆیان وەستابوون ئێمەش گەڕاینەوە سەر گەلو بەر گەلو.

## لێدانی چالە نەوتەکانی کەرکوك لەسەرمتای مانگی ۱۰ / ۱۹۸٦

ئێمە هێزەکانی تیپی ۸٦ ی دەشتی هەولێر بەشێکی تیپی ۸۷ ی قەرەچوغ تیپی ۹۳ ی کۆیە ۲۵ ی خاڵخالأن ۲۱ ی کەرکوك هەموومان لەسەرکردایەتی بووین، هەڤاڵی بەرێز مام جەلال فەرماندەی تیپ و کەرتەکانی دەعوەت کرد

لەبارەگای خۆی لەهەمان کات کۆبوونەوەیەك ئـە نجام درا بەرنامـە دانـرا بـۆ لێدانی چاڵەنەوتەکانی بابە گوڕگوڕو معەسکەرەکانی مەنتیقەی حەسارو تـاکو نزیکی پردێ , کۆبونەوە لەگەڵ هێزەکان کـراو بەسـەر پەرشـتی بـەرێز کـاك نەوشیروان برپیار درا کە بێینە خوارەوە چەند گورزێك لەدوژمن بدەین لەناوچەی کەرکوك و هەولێر بەسەرپەرشتی کـاك نەوشـیروان بـەناوی ( حەمـە صـالح ) ماوەیەکی زۆربوو شەڕ لەسەر سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی کوردسـتان بـوو بۆئـەوەی ئـەو قورسـا یـی یـە لەسـەر ناوچـەکانی سـەرکردایەتی لاببـەین هێزەکا نمان لە دۆلی شەدەڵەوە پەڕینەوە بەرەو گوندی شیلە خـان و گـەورە دێ لەوێش هاتینە گوندەکانی گۆپتە پەو عەسکەرو دەورو بەری، یەك دوو رۆژ لـەو گوندانە ماینەوە من زۆر پێم سەیر بوو جارو بار پێکەنینم دەهات چونکە یەکەم جاربوو کاك نەوشیروان ناوی خۆی بگۆڕێت ناوەکەش زۆر ناخۆش بوو حەمە ساڵح , کاك حەمەساڵح خۆی هاتـە گونـدی تورکمـان بـاخ کۆبوونـەوەکمان کـرد و هێزەکان دابەش کران کەرتەکەی من کاك جەلال جێگر بوو چـووینە مەنتیقـەی بیبانی کەدەکاتە سەرجادەی هەولێر پردێ ئـەو قاعانـەی مخـازنی جەیـشی عێراقی لێ بوو وەبەشێك لەقاعەکان مەقەڕاتی موجاهیدینی خەلقی تێـدابوو ئێمە دوو تۆپی ۱۲۰ ملیم مان پێ بوو لەگەڵ ۱۲۰ گوللە تۆپ , سەعات ۱۰ ونیوی شەو گەیشتینە شوێنەکانی خۆمان تۆپەکا نمان دامەزراند گوللـەکا نمان حـازر کردو بەقومباز هەموو شوێنەکا نمان دەست نیشان کـرد لەسـەر خەریتـە پێـنج کەسی زۆر شارەزامان لەگەڵ بوو کەدەورەیان کردبـوو , مـن خۆشـم لـەهاوانات شارەزام سەعـاتی سفر نزیك بۆوە کاك حەمەساڵح پێی وابـوو پاشـی شـەڕەکە ئێمە هاوەنەکان بەجێ دەهێڵین بەمنی گووت لەگـەڵ لێـدانی بـیرە نەوتـەکان کۆپتەرو تەیارەی حوکمەت هەڵدەستێت ئێوە دەبێ دەست و بردی خۆتـان بکـەن، دەست بەشەڕ کراو هەر چـواردەورەی کـەرکوك بـوو بـەگرم و هـۆڕو ئاگربـاران

بەڕاستی زۆر خۆش بوو ئەگەر یەکێك لەدوری شەڕەکە تەماشای بکردبایە شارەکەی بابە گوڕ گوڕ بەتەواوی باوەشی کردبۆوە بۆ ئەوڕۆڵە جەربەزانەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، ئێمە بەرنامەی گرتنی کەرکوکمان نەبوو ئەگەرنا ئەو شەوە زۆر لە فەرماندەو پێشمەرگەکان گەیشتبوونە ناو شاری کەرکوك ئێمە ئەوەت و پێنج گوللەمان باراند بەسەر مقەڕەکانی مجاهید و مخازنەکان یەك پارچە ئاگریان تێبەربوو، ئەوناوچەیە بوو بەنوێژی نیوەڕۆ پاش سەعاتێك تۆپ باران ڕەکیزەی تۆپەکان چوو بوونەژێر زەوی هەر چۆنێك بێت دەرمان هێنان و بارمان کردنەوە لە عارەبانەی تراکتۆرەکان وئەو شەوە لەئاسمانی کەرکوك و دەوروبەری ئاگرباران بوو ئێمە گەڕاینەوە قەرە سالمی بانەوە بەرەو زێی بچوك و پەڕینەوە بۆ گوندی شەیتان هەر لە پاش لێدانی ڕەبیەکان و معەسکەرەکان و بیرە نەوتەکان و دوو سێ جۆر تەیارە لەکەرکوك هەستان بۆ ئاسمانی شەڕەکە یەکەم جارمان بوو کە ببینین بەشەو کۆپتەر تەنویر فڕێ بدات هەربۆ بەیانی کۆپتەرەکان ئاسمانی ئەو ناوچەیان چۆڵ نەکرد ئێمە پێشمەرگەکانمان لەناو گوندی شەیتان لەخانووەکان دابەش کردبوو من و کاك جەلال لەگەڵ غەفور چەند پێشمەرگەیەك لەناو شینایی یەکان بووین لەماڵی سەید ئەحمەد. هێزی پێشمەرگە لەهەموو گوندەکانی دەمزێ هەبوون کۆپتەرەکان بەردەوام لەسەرگوندەکان جەولەیان دەکرد لەکاتی هاتنی کۆپتەرەکـــــــــــــان بۆسەر گوندەکە پێشمەرگەیەکمان لەگەڵ بوو بۆ شارەزایی کەخۆی پێشمەرگەی تیپی ٢١ ی کەرکوك بوو ناوی (کامۆ) بوو لەکاتی هاتنی کۆپتەر بۆ سەر گوندی شەیتان بە ئارپیجی تەقە لەکۆپتەرەکان دەکات بەلاّم لەدوای خۆی صوتی ئاربیجیەکە نزیك بوو لەزەوی لەسەرشانی تەقیبۆوە بەداخەوە شەهیدی کردبوو ,لەتیپی ٩٣ ی کۆیە لە قوڵەکەی ئەوان بۆ لێدانی بیرەنەوتەکانی نزیك کەرکوك بەداخەوە دوایی زانیمان کادیرێکی کۆمەڵە

بەناوی ( هاوڕێ قاسم محەمەد ) خەڵکی کۆیە شەهید بووە، بەگشتی هێزەکانمان لەلێدانی چاڵەنەوتەکانی کەرکوک و سەربازگەو مەخفەرەکان سەرکەوتووبوون وەئەو شەڕە بەسەرپەرشتی بەڕێز کاك ئەوشیروان بوو سەدایەکی گەورەی هەبوو کوردەکانی کەرکوکیش زۆر دڵیان پێ خۆش بوو ڕژێم لەدوای ئەم شەڕە لەناو شاری کەرکوك چەند کەسی گرت و چەندان ماڵیشی لەکەرکوك وەدەرنا هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی شەهید قاسم و شەهید کاکۆو گشت شەهیدانی کوردستان

## *شەڕە گەورەکەی گوندی ئیلنجاغی سەربەقەزای کۆیە ٢٢/١٠/١٩٨٦*

■ ناوچەی سێگرتکان بووین دەنگو باسمان بۆهات کەڕژێم تەحەشودێك دەکات بۆئەو ناوچانە، ئەوکەرتانەی ئامادەبووین لەوکاتە بڕیارماندا خۆمان لەهێزەکە لابدەین، ناوچەی سێگرتکانمان بەجێهێشت وبەرەو گوندی ئیلنجاغ ، شەوی ٢١/٢٢ لەگوندی ئیلنجاغ ماینەوە بۆ بەیانی دەوری سەعات حەوت ونیوی سەرلەبەیانی بوو دووکۆپتەر لەلای کۆیەوە هاتن جەولەیەکی سەرگوندی ئیلنجاغ وگوندەکانی دەوروبەریان کرد، ئێمەش گوو تمان ئەوکۆپتەرانە شتێکیان بەدواوەیە بۆیە بڕیارماندا دابەش ببین بەچەند قۆڵێك،ڕۆژئاوای ئیلنجاغ بۆ صەلاح شینەو بیست پێشمەرگە، تەنیشتی صەلاح شینە بەڕووی داربەسەرەوە بۆشەهید خاڵە یوسف قەشقە،جادەی کۆیە ئیلنجاغ بۆقارەمان شینە ، ڕۆژهەلاتی ئیلنجاغ بەری لای مەکتەبەکە بۆ کاك شەماڵ قەرەبەگی بەم شێوەیە جەبهەی دێ یەکە دابەش کرا ، من کەرتەکەی خۆم لەگەڵ نەبوو هێزێکیان پێکهێنا من سەرپەرشتیم دەکرد کە پێکهاتبوون لەوچەند کەسە (

ئەحمەد کوردە ، محمەد چاوشین ،شۆڕش کاکە ،لەتیف شوڕتە ،خاڵە نادر ،ڕەسوڵ حەمەد ) ئێمە لەهەر لایەك شەڕ گەرم دەبوو یارمەتیمان ئەدان ،لەسەعات هەشت ونیوی ئەو ڕۆژە دوژمن بە پاڵ پشتی هێزێکی زۆری جەیش وجاش لەگەڵ مەفرەزەیەکی کۆپتەر هێرشیان کرد بۆسەر گوندەکە ولەسەعات هەشت ونیوی بەیانی شەڕدامەزرا، جیهازی تیپی ٨٦ لەماڵی مام عەباسمان دانا بووو مام عەباسیش کوڕێکی هەبوو بەناوی سەلام ئەویش فەرماندەی مەفرەزبوو مام عەباس خۆشی پێشمەرگە بوو بەلاّم دانیشتبوو لە گوندی ئیلنجاغ، بەتێکڕای گوندەکە پێشمەرگەبوون ،کاك نصرالله پێشتر برینداربوو جێگری فەرماندەی کەرت بوو ئەویش لەوشەڕە دەستێکی بالآی هەبوو،شەهید دەشتی کادیری کۆمەلآیەتی بوو ئەوڕۆژە دامان نا سەرپەرشتی جیهازەکە بکات ،لەگەڵ برادەرانی مەڵبەند بۆنانی بەیانی مەفرەزەیەکمان بۆنان خواردن چووبوونە گوندی مەرزان ومستەفا مەرزانیان لەگەڵ بوو ئەوانیش لەبانی تاڵەبان کەدەبینن جەیش وجاش بەرەو ئیلنجاغ دێ ئەوانیش گەڕانەوە لای خۆمان وبەتەواوی تێگەیشتین کەوا دەبێ شەڕبکەین ، من ومحمد چاوشین لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك خۆمان گەیاندە قەبرستانەکە کەچەند سەد مەترێك لەناودێ وە دوورە چەند سەیارەکی جاش لە پێشەوەبوون بەرازیلی و پیکەب وهتد... بوون لەگەڵ یەکەم دەست ڕێژ سێ سەیارەمان لێ گرتن وچەند جاشێکیش کوژران، سایەق شۆفێلێکیشمان گرت کەهێنابوویان گوندەکانی پێ تەخت بکەن من ویستم بیکوژم بەلاّم خەلکی دێ یەکە ناسیان وگووتیان ئەوە مام عەزیز مەرزانی یە سایەقی ئیشغالە ئینجا مام عەزیز لەزۆری وکەمی قوەتەکە تۆزێك قسەی بۆ کردم، سەعات بوو بەدەوری دە، شەڕ لەهەمو ولایەك گەرم بوو لەسەر گوندی ئیلنجاغ مام حەمەد خەلکی گوندی ئیلنجاغ بوو چوار کوڕی پێشمەرگە بوو بەم ناوانە ( هیدایەت، عومەر، ڕەسوڵ ،غەفور ) مام حەمەد پیاوێکی زۆر بەهیمەت

بوو تفەنگێکی پەرەشوتی هەبوو لەسەر بەیتونەی ماڵەکەی خۆیان شوێنێکی چاك کردبوو بۆ شەڕ کردن ناردی بە دوام ومنیش چوومە لای گووتی کوڕم ئەحمەد بەری لای رۆژئاوا (سەر شاخەکان) پێشمەرگەی لێنەماوە منیش گووتم خاڵە حمەد کاك صەلاح شینە لەوێ یە بەدووربین تەمەشام کرد قسەکەی زۆر تەواو بوو، جاشەکان بەبیکەیسی تەقەیان رووڵەگوندی دەکرد بەنیسبەت گوندەکەوە ئەم شوێنە زۆر گرنگ بوو هەرلەوێ وە جاشەکان دزەیان کردبوو بۆپشتی خاڵە یوسف وپێشمەرگەکانی ،زۆری پێ نەچوو نزیکی سەعات یازدەو نیو بوو، من جەولەم دەکرد لەسەر شەڕەکە کەسەیرم کرد جاش وجەیش لەشوێنی خاڵە یوسفو ئەوان دەسوڕانەوە خۆم گەیاندە قارەمان شینەو گووتم قارەمان وا پێ دەچێت خاڵە یوسف وپێشمەرگەکانی شەهید بووبن بۆیە جاش لەجێگای ئەوان تەقەلەئێمە دەکەن، قارەمان کەئەو خەبەرەی بیست ئاربیجیەکی هێنا لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك بەناو خانووەکاندا سوڕاینەوە ئەوجاشانەمان ڕاونا وهەندێکیشمان لێ کوشتن بۆمان ئاشکرابوو کەخاڵەیوسف وپێنج پێشمەرگەشەهید ببوون، مەغدیدی ئامۆزای صەلاح شەهید دەبێ وصەلاحیش ئەوشوێنە چۆڵ دەکا بەبێ ئەوەی بەئێمە بڵێت ،دەبابەکان لەلای داربەسەرەوە هاتن بەتۆپ لەمەکتەبەکەیان دەدا کاك شەماڵ وکەرتەکەی لەناو مەکتەبەکە بوون پێشمەرگەیەك شەهید دەبێ و شەماڵیش بۆخۆی بریندار دەبێ، تاسەعات دووی پاش نیوەڕۆ هێزی پێشمەرگە زۆر وورەمان بەرز بوو بەلام هێواش هێواش پێشمەرگە بریندار دەبوون وشەهید دەبوون و زۆر هیلاك ببووین رۆیشتنی صەلاح وشەهیدبوونی عوزێر کەهێزی پشتگیری بوو دەورێکی بالای هەبوو، بریندار بوونی کاك شەماڵو کاك شکراللەش ئەویش بووە هۆی شپرزە بوونی ئێمە، لەناو دێ شەهید توانا عەدەد بیکەیسی بوو لەخانوی یەکەم دابوو،بۆلای ئێوارە کەبەری لای مەکتەب چۆڵ کرا قارەمان شینە وەزعی

باش نەبوو گوێی لەهیچ نەدەبوو لەگەڵ جاشەکان لەناو دێ بانگی یەکترمان دەکردو تێکەڵ ببووین ،مەفرەزەیەکی پێشمەرگە لەلای داربەسەرەوە هاتن بۆیارمەتی دا نمان خۆیان گەیاندە گوندی ئیلنجاغ پێك هاتبوون لەم ناوانە (کاك سدیق وستارو فەرهادو شکراللەی داربەسەری ،چەند پێشمەرگەیەکی تر) بەهاتنی ئەوان ورەمان باشتر بوو رۆڵێکی بەرچاویان بینی لەشەڕەکەدا من گەڕامەوە بۆ سەرپەرشتی پێشمەرگەکان کەلەناو خانوەکانداببوون پێشمەرگەیەکم بینی شەهید ببوو بەناوی (ئەسکەندەر مەناف ) خەڵکی گوندی گۆمەشین بوو، وای لێهات شەڕکۆلان بەکۆلان وماڵ بەماڵ تا کو ئێوارە سەعات چوارو چارەگ درێژەی کێشا من وقارەمان شینە ومحمەد چاوشین وکاك نصراللەو محمەد عبدالوهاب وەچەند پێشمەرگەیەکی تر کەناویانم لەیاد نەماوە هەر ئەوندەمان لەناو دێ مابووین، ماڵی مام سمایل عائیلەکی شیوعی بوون دەورێکی زۆر باشیان هەبوو لەیارمەتی دانی پێشمەرگە لەو شەڕە دوو ئافرەتیان هەبوو بەناوی بەلقیس و خەرمان داوای چەکیان لە پێشمەرگەکان کردبوو بۆ ئەوەی بەشداری لەشەڕەکەدا بکەن، بەکردەوە خێزانی ئازادیش هەرهی ئەوینەماڵەیە بریندار بوو کوڕێکیشی بەناوی هەوراز ئازاد لەباوەشی دایکی هەرلەوێ شەهید کرا، لەئاخیری وای لێهاتبوو کە پێمان نەکرێ بچینە دەرەوە، ئەو پێشمەرگانەی کەمابووین لەناوگوند سەعات چوارونیو کۆبوینەوەوهەموومان سوێندمان بۆیەکتر خوارد کەواهیچمان تەسلیم بەرژێم نەبین و لەدەقەی ئاخیری خۆمان بکوژین کەتەماشام کرد مەفرەزەی کۆپتەرەکان گوندی ئلینجاغیان دایە بەردەست رێژی سارۆخەکانیان بوو بەتەپوتۆز لەئێمەو جاشەکانیان دا،لەناودێ محمەد گووتی ئەحمەد کوردە شکراللە برینداره‌و لەوخانوە بەجێماوە، من ومحمەد وقارەمان ومامۆستا تاهیرو چەند پێشمەرگەیەکی تر شکراللە حەمەدەمینمان هەڵ گرت ڕوو لەکەندەکەی

بەرناوایی ڕۆیشتین بەلام کۆپتەرەکان کاریکی وایان کرد کەئیمە ئەجا تمان بێت، ژن ومندالْ وپیرو پەککەوتەکان هەموویان چوویوونە ناومەرجەئەکان لەناودێ یەکە ئەگەرنا خەسارە زۆر لەوە زیاتر دەبوو، سەعات پێنج چارەگی دەویست ئێمە گوندەکەمان بەجێهێشت، جەیش وجاش کۆنترۆلی گوندەکەیان کرد هێزەکەی ئێمە لەگەلْ هێزەکەی دوژمن زۆر نابەرامبەربوو، بۆئەوەی خەلکی گوندەکە زیاتر شەهید نەبێ هیمەتتمان کرد زۆرتر خەلك بنێرینە دەرەوەی دێ، زۆرم هەولْ لەگەلْ مام حەمەد دا کە بیبەمە دەرەوەی دێ بەلام بەقسەی نەکردم ونەهات، مام حەمەد پیاوێکی بەجورئەت وبەغیرەت بوو گووتی منیش لەگەلْ خەلکی دێ یەکە با بکوژرێم، دوژمن گوندەکەیان سوتاندو چەند ژن ومندالیان گرت وبردیان بۆ دائیرەی ئەمنی هەولێر( خێزانی مام حەمەد ،خێزانی بابەشێخ، خێزانی خالە جەعفەر ، پورە زەوەی دایکی مامەی مام خورشید، خێزانی مام هاواری مام قلینج کەمالی لەوێ بوو، خێزانی ئازادی مام سمایل بەبرینداری، ئەوانە هەمویان دەستگیرکران ) بۆماوەیەکی زۆر لەدائیرەی ئەمن مانەوەو پاشان ئازاد کران. ئەوەی جێگای سەرنجە پێشمەرگەیەك چوار دەوری دەگیرێ وفیشەکی پێنامێنێ جاشەکانیش لێی نزیك دەبنەوە بەلام ئەو خۆی لەکونە خانوێك حەشار دەدا تاکو جاشەکانیش دەگەڕێنەوە نایبینن دواتر بەسەلامەتی گەڕایەوە ناو هێزی پێشمەرگە، سەلیم محمەد خدر زۆربەسەختی بریندارببوو پاشان شۆڕش ڕەوانی دەرەوەی ولاتی کرد ئێستاش لەژیاندا ماوە.

ئەوەش ناوی ئەوفەرماندەو پێشمەرگانەیە کەلەو داستانە بەشداریان کرد :-

١. ئەحمەد کوردە
٢ قارەمان شینە
٣ خالە یوسف

٤. کاك نصراللە

٥. شەماڵ قەرە بەگی

٦ کەریمە ڕەش

٧. صلاح شینە

٨. مەغدیدی ئامۆزای صلاح شینە

٩. عوزێر خەڵکی گوند

١٠ کەریم سەلیم مەرزانی

١١. ڕەسوڵ حەمەد

١٢. کازم حەمەدەمین

١٣. محەمەد عبدالوهاب

١٤. محەمەد چاوشین

١٥. خاڵە نادر

١٦. توانا جمکەیی

١٧. ئەسکەندەرمەناف

١٨. شکراللە حەمەدەمین

١٩. شکراللە داربەسەری

٢٠ سەلیم مەحمود خدر

٢١ سدیق حەمەد

٢٢ ستار قادر

٢٣. صباح عبدالرحمان

٢٤ شۆڕش کاکە

٢٥ لەتیف شوڕتە

٢٦ هەژار گۆمەشینی

٢٧ دەشتی موهەندیس

٢٨ ئەیزەن قادر

٢٩ سەلام عەباس

٣٠ گوشاد عبدالرحمان

٣١ هاوڕێ کاوە ئەنوەر

## ناوی شەهیدەکانی شەڕی ئیلنجاغ

( شەهید خاڵە یوسف فەرماندەی کەرت ،شەهید توانا فەرماندەی مەفرەزە ،شەهید ئەسکەندەر ،شەهید مەغدید فەرماندەی مەفرەزە ،شەهید عوزێر خەڵکی گوند ،شەهید هەوراز ئازاد خەڵکی گوند ) ٠

## برینداەکان ئەوانەی کەلەبیرم ماون

( شەماڵ قەرەبەگی فەرماندەی کەرت ،شکراللە ئیلنجاغی ،سەلیم مەحمود ،بەکرسێبیرانی چاوێکی لەدەستدا فەرماندەی مەفرەزەبوو، چالاك چاوێکی لەدەستدا فەرماندەی مەفرەزەبوو ) ئەوفەرماندەو پێشمەرگانەی لەو شەڕە بەشداریان کرد هەموویان دەوری بەرچاویان هەبوو بەتایبەتی ئەوانەی خەڵکی دێ یەکە بوون، کچێکی لێ بوو بەناوی نەورۆز مەحمود پێشتر برایەکی بەناوی ( سەلیم ) لەگەڵ من شەهید ببوو ئەو کچەش ئەورۆژە دەورێکی بەرچاوی هەبوو لەیارمەتی دانی پێشمەرگەکان هیچ خۆی نەدەشاردەوە دەی گووت من لەئێوە زیاترنیم لەدوای دەرچوونمان بۆ خواروی دێ کەهێندێك

ماڵی لێ بوو شینایییان کردبوو لەگەڵ کاک شۆڕش و کاک لەتیف شوڕتە یەکترمان گرتەوە، من زۆر خەفەتم لە کاک قارەمان شینەو خاڵە یوسف و جەماعەت خوارد کەبەجێم هێشتن لەوێ چونکە کاک جەلال لەگەڵ کەرتەکەی خۆمان کەئەوانیش لەلای میرکە بوون دەترسام توشی شەڕ بووین من و کاک شۆڕش و لەتیف شوڕتە بەڕێ کەوتین بەرەو گوندی سماقە و گەیشتینە ناو دێی سماقە نزیکەی بوو بەسەعات ١٠ی شەو لامانەدا ماڵێک پرسیارم کرد پێشمەرگەی کێ لەناودێن ماڵەکە منیان نەناسی گووتیان جەماعەتی ئەحمەد کوردە لێرەن من و کاک شۆڕش زۆر کەیف خۆش بووین و چووین بۆلای مزگەوت سافیرەمان لێداو هەموویان کۆبونەوە لەلای مزگەوت من وکاک شۆڕشیان بینی زۆر کەیف خۆش بوون و هەموومان یەکترمان ماچ کرد خۆش حاڵ بووین و باسی شەڕەکەی ئیلنجاغم بەکورتی بۆ کردن پێیانم گووت حوکمەت دەمینێتەوە لەم ناوچەیە بۆیە دەبێت مشوری خۆمان بخۆین ئێمە دەبێت بەرەو چیای باواجی هەڵکشێین، پەڕینەوە بۆگوندی داربەسەر لەوێشەوە هێواش هێواش بارانیش دەباری، لەدار بەسەر ئیسراحەتێکمان کردو بەرێکەوتین بەرەو جادەی هەولێر- کۆیە لەگۆمەشین و گوپتەپە لامان نەدا، لەجادە پەڕینەوەبەرەو گوندی حاجی کاکۆل لەسەر جادە پێشمەرگەیەکمان بەناوی (گەیلان صابر) زۆر ماندووهیلاک ببوو گووتی من ناتوانم چیتر رێ بکەم لەسەر ئەوجادە بەجێم بێڵن ،گەیلان کوڕی ئامۆزام بوو کوڕی خوشکیشم بوو من بەبرادەرانم گووت ئەگەر ئەڕوات دەبێ بیکوژن چونکە شەڕی پارتی زانی نابێت بریندارو پەککەوتە بەجێ بهێڵی، کاک فەتح الله داربەسەری لەگەڵ نادر ئیمام لەگەڵ کاک هیدایەت گووتیان ئێمە هەر چۆنێك بێت بەسەر پشتی خۆمان بەکۆڵ دەیهێنین زۆریان هیمەت کردو پاروەنانیان لەناو دەمی دەناو ئاوی قوراویشی لەسەر دەکرد لەسەر جادەکە دووریان خستەوە، کوڕێکمان لەگەڵ بوو خەڵکی

گۆمەشین بوو ناوی ( صمد سمایل ) بوو مەجید ئەحمەدیش هەر گۆمەشینی بوو بەلام دونیا تەم و مژبوو ماڵەکانی گوندی حاجی کاکۆلیان نەدەدۆزیەوە لەدەورەی گردێک دوجاریان سوراندینەوە لەبەختی ئێمە سەگەکانیش نەدەحەپین لەبن کەورگە شاخێك خڕبووینەوەو تۆزەك دونیا ڕوناك داهات تەماشام کرد ماڵی حاجی کاکۆل هەر ٢٠٠ مەترێك لە ئێمەوە دوورن، گەیلانمان بردو چووینە ناو ماڵەکان مەجید مەلا ئەحمەد یەك دوو جنێوی بەخۆی داو گووتی جارێکی تر مەدحی خۆم ناکەم چونکە ئێوەم زۆر ئەزیەتداو هیلاکم کردن، ئینجا ئێمە چووینە ناو ماڵەکان و خۆمان گەیاندە دیوەخانەکەی حاجی کاکۆل.

کاك عبدالرحمان کوڕە گەورەی کاك حاجی بوو لەگەڵ ئەکرەمی برای و نەریمان و هەموو برایەکانی تری لەوێ بوون ئەوان ئیشیان ئاژەڵ داری بوو، هەموویان جل و بەرگی خۆیان بۆ هێناین و زۆریان ڕێز لێگرتین و حەیوانێکیان بۆ سەربڕین و کاك ئەکرەم گووتی من زۆر ترسام لێتان وامزانی جاشن، ماڵی حاجی کاکۆل عائیلەیەکی گەورەن ئەو گوندە هی ئەوانە لەوگوندە تەوزیع بوون نیە هەمووی دەبێت لەدیوەخان نان بخوات، ساوار بەگۆشتێکیان بۆ کردین و هێنایان بۆ دیوەخان بەلام پێشمەرگەکان زۆر هیلاك وماندوو بوون هەموویان خەویان لێ کەوتبوو زۆرمان بانگ کردن کەس هەڵ نەدەستا بۆ نان خواردن، من لەنزیك سۆبەکە دانیشتبووم هێواش هێواش بۆکاك ئەکرەم و کاك عبدالرحمانم دەگێڕایەوە زۆرمان هەوڵدا کەقوەتەکە بشکێنین بەلام هێزەکە زۆربوو ئەوان هەردووکیان گوێیان بۆ قسەکانی من شل کردبوو زۆریشیان خەم خوارد کەگوندی ئیلنجاخ سوتاوە، باسی خاڵە یوسف و پێشمەرگەکانم کرد کەشەهید بوونە ئەوانیش هەردووکیان لەداخان ئەوجەمە نانیان نەخوارد ، من نانم خواردو گووتم کاك ئەکرەم من وادەچم بۆ سەر ئەم

گردە تۆزێك حەرەسیات دەگرم، جەماعەت بەخەبەردێن و پرسیاری من دەکەن پاش ماوەیەك کاك ئەکرەم بۆخۆی هات بەدلی کردم و گووتی تاماوم لەهەموو شوێنێك ئەو هیمەتەی تۆ دەگێرمەوە کە پاش ئەو هەموو شەڕکردن و ماندوو بوونەت بۆخۆت حەرەسیات دەگری فیداکاری و تێکۆشان و ماندو بوونی تۆ قەد لەبیر ناکەم ،منیش جوابم دایەوەو گووتم تاخەڵکی وەك ماڵی حاجی کاکۆل و کوڕەکانی هەبێت شۆڕشی کورد لەکوردستان بەردەوام دەبێت و هەر سەر دەکەوێت، ئێمە سێ شەوو سێ رۆژ لەو ماڵە ماینەوە ژمارەمان نزیکی ٤٠ کەس بوو، جەیش لەدەشتی هەولێر گەڕایەوە ئێمەش گەڕاینەوە بۆگوندەکانی دەمەزێ لای سێگرتکان لەگەڵ تیپەکەی خۆمان یەکترمان گرتەوە لەکۆتایی دا زۆرسوپاسی خەڵکی ئیلنجاخ و گوندی حاجی کاکۆل دەکەم هەزاران سڵاویش لەگیانی پاکی ئەو پۆلە شەهیدەو گشت شەهیدانی رێگای رزگاری گەلەکەمان ٠

<u>گوندی قۆڕیتان و کۆمەڵێك شەهید</u>

لە ١٩٨٦/١٠/٢٨ هێزی جەیش و جاش دەرچووبوون بۆ گوندەکانی پەلکانەو قۆڕیتان لە دەشتی کۆیە، لە گوندی پەلکانە جەیش بە پاڵپشتی کۆپتەر رووبەڕووی ئەم چەند پێشمەرگەیە دەبێتەوە ( رزگار مام قلینجی و سابیرو فارس وچەند کەسێکی هێزی پشتگیری بەناوی لەتیف شەوگێڕی ومام بکر ناسراغەیی ) دوای شەڕێکی زۆر قارەمانانە بەداخەوە هەموویان شەهید بوون بەلاّم رزگار بەبریندارى دوای کۆتایی هاتنی فیشەك و نارنجۆك و تەقەمەنی پێی بەدیل، گیرا دواتر لە قەسابخانەکانی رژێم لە سێدارە درا

- ئەوەی شایانی باسە ماڵ و منداڵی ئەم بەرێزانە بە قەصفی کۆپتەر شەهید بوون
- ماڵ ومنداڵی کەریمە رەش
- ماڵ ومنداڵی سابیر قۆڕیتانی

- وەزیاتر لە ۲۰ کەس شەهید بوون بەڵام داوای لێ بوردن دەکەم ناوی هەمووانم لەیاد نەماوە
- شەهید فارس وشەهید سابیر هەردووکیان لە کەرتەکەی من بوون بەئیش و کار چووبوونە ئەو ناوچەیە

هەزاران سڵاو لە گیانی پاکی ئەم کۆمەڵە شەهیدەو هەموو شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری خوازی کوردو کوردستان ...

## داستانی ئاکۆیان (فەوجی ئاکۆیان) ۱۹۸۷

لە ۲۱-۱-۱۹۸۷ ئاگادار کراینەوە کەوا لەدۆڵی ئالانە ئامادەبین ، بەڕێکەوتین بۆ دۆڵی گەرموان لەوێشەوە بۆ گوندی گەرەوان ،ڕائد جەلال چووبووە دۆڵی گەرەوان بۆدانانی نەخشەو پیلان بۆ گرتنی مقر فەوجی ئاکۆیان بۆیە لەگەڵ مام غەفور ئاوابووین بۆلای ڕائد جەلال لە گوندی گەرموان ،لەوێ کۆبووینەوە ئێمە چاوەڕێ بووین کەوا هێزەکانی لای چیای کۆڕەك خۆیان ئامادە بکەن و ئاگادارمان بکەنەوە، ئەوەبوو شەوی ۲۲/۲۳ ی -۱-۱۹۸۷ ئاگاداریان کردینەوە کە ئەوانیش ئامادەن ،کات داندرا بۆنەوەی لەیەك کاتدا دەست پێ بکەین ۰

- ئەوهێزانەی بۆدیوی چیای کۆڕەك داندرابوون ئەمانەن :

- تیپی ۹۳ی کۆیە ( مامۆستا بەکرسەرتیپ بوو ، محمد شینە جێگر تیپ بوو، ئاشتی سابیر میرە .فەرماندەی کەرت ،شەهید جەعفەر حەمە دەروێش فەرماندەی کەرت ،فریاد قەسرۆکی فەرماندەی کەرت ،مەولود مام قلینجی فەرماندەی کەرت ،ئازاد عوسمان ڕابەر سیاسی )۰
- تیپی ۱۹ ی کۆڕەك ( کاك عبداللە بۆر .سەرتیپ بوو، مام زرار فەرماندەی کەرت ،ڕێبین محمد سۆفی ڕابەر سیاسی ، ......... )۰

ـ تیپی ٨٧ ی قەرەچوغ (کاک سەفین مەلا قەرە سەر تیپ بوو ،عومەر ناسر فەرماندەی کەرت ، شەهید فاقە مەخموری فەرماندەی کەرت ،فارۆق عەلی مەولود .ڕابەری سیاسی،.........) •

ـ تیپی ٨٣ ی هەورێ ( شەهیدی فەرماندە کاکە جوان سەرتیپ بوو ،.......)•

ـ تیپی ٧٨ ی کارۆخ (عەزەی داودی فەرماندەی کەرت بوو)•

- ئێمەش چووینە خوارەوە بۆگەرەوانی خواروو لەوێ کۆبووینەوە لەوێ مام غەفور بەبرادەرانی تیپەکەی خۆمانی گووت "ئێوە دەزانن سعیدی حەمە زیاد ئێرەکەری ئەو ناوچەیە! ئەگەر ئێوە لەو ئێرەکەرتر نەبن ئەوە سعید حەیامان دەبات •

کەرتەکەی من کە کەرتی پێنجی گۆڕقەرەج بوو پێك هاتبوو لەم پێشمەرگە قارەمانانە (ئەحمەد کوردە فەرماندەی کەرت ،جەلال ئیلنجاغی .جێگر کەرت ، محسین حەمشێن فەرماندەی مەفرەزە،مامە قالە فەرماندەی مەفرەزە ،سەلام عباس فەرماندەی مەفرەزە ،عەول،بەرزان موراد،لەتیف شوڕتە،فەتح الله داربەسەری ،نادر امام ،سەلیم تاڵەبانی ،هیدایەت حەمەد ئیلنجاغی ،.........) داوای لێبوردن دەکەم لەو پێشمەرگە قارەمانانەی ناویانم لەیاد نەماوە ،من و محسین حەمشێن و مامە قالە بریندار بووین لەم ئەبەردیە•

من هەندێك گوللە ئاربیجیم بردبوو بۆ ئەم شەڕە کەحەشوەی نوێ یان پێوە بوو کاك سعیدی حەمە زیاد (سەرتیپی ١٢ ی سۆران بوو) چاوی بەو حەشوە نوێ یانە کەوت گووتی مام غەفور با گوللە ئاربیجیەکانمان تێکەڵ کەین و دواتر دابەشیان کەینەوە ،منیش ڕازی نەبووم. کاك سعید گووتی مام غەفور ئەو برادەرە ناوی چی یە؟؟ مام غەفوریش گووتی کاك سعید ئەوە کاك ئەحمەد کوردەیە قارەمانی دەشتی هەولێرە • کاك سعید بەتوڕەیی گووتی باشە با

دەبابەیەك بۆ ئەحمەد کوردە بێ ،ئینجا لەباتی یەك دەبابە دوو دەبابە بوو بە عایدی ئێمە منیش رازی بووم • دوودەبابە لەتەك یەك راوەستابوون ،مەفرەزەیەکمان رێك خست لەکەرتەکەی من و لەتیپەکەی کاك سعیدی حەمەزیاد دەستەی هجوممان هەڵبژارد بەم شێوەیە :-
دانانی دەستەی هجوم (ئەحمەد کوردە،مامە قالە ، محسین حەمشین،جەلال ئیلنجاغی ،لەتیف شوڕتە ،عەول ،شەهید سەلیم تاڵەبانی بەداخەوە لەو شەڕە شەهید بوو،شەهید لەتیف ،حەسەنەگەورە ،جەلال حاجی و،مام زرار) ئێمە ئەو کۆمەڵە پێشمەرگە هێرشمان کردە سەر ئەو دوو دەبابەی لەتەك یەك وەستابوون لەگەڵ نوقتەیەکی حەرەسیات •
من و شەهید لەتیف و شەهید حەسەنە گەورە هەرسێکمان بەیەکەوە گەیشتینە سەردەبابەکان ،یەك لەسەربازەکان نارنجۆکێکی بۆ هەڵداین ،من و حەسەنە گەورە بریندار بووین زۆر بەداخەوە کاك لەتیف جێگر تیپی ١٢ ی سۆران شەهید بوو، مامە قالەش لەدووری دوو تاسێ مەتر لەولای ئێمەوە بریندار بوو ،شەڕەکە نیو سەعاتی خایاند دەستمان بەسەر فەوجەکە داگرت لە بەرەبەیانی ئەم شەوە ئێمە تۆزێك خۆمان تاخیر کرد و تاکو هێزەکە بەرێکەوتن بۆ گەڕانەوە من دووبەتانیم هێناو بەگاز وایلم کردن هەردوو دەبابەکەی لای خۆمانم ئاگر تێ بەرداو تەقاندمەوە بەلأم لەحامیەی رەواندوزەوە هێزێك هاتبوون بۆ نزیکی ئەو معەسکەرەی کە ئێمە دەستمان بە سەرداگرتبوو لەکاتی گەڕانەوەمان دەست رێژێکی دوور بەدووریان لێ کردین و بووە هۆی شەهید بوونی پێشمەرگەیەك بەناوی (سەلیم مەحمود تاڵەبانی ناسراو بە(کاروان) ) پێشمەرگەیەکیشمان برینداربوو فەرماندەی مەفرەزە بوو بە ناوی ( موحسین حەمشین )، لە معەسکەرەکە دەرچووین هێندێك لەو رەبیانەی سەر رێگامان دیاربوو نەگیرابوون ئێمە دۆشکەیەك و شەهیدێکمان پێ بوو بەشەویش

هاتبووین دونیاش ساردو سەرما و بەفر بوو لەقەدی شاخەکە هێندێك گەلاًدێی لێبوو (واتا قۆریە چروو) کە بۆ ئاژەڵ بەکاردێ دۆشکەکەو شەهیدەکەم لەناو قۆریە چروویەك شاردەوە چونکە بۆمان دەرنەدەچوو هیلاك و ماندو و بریندابووین تۆزێکی تر رۆیشتم توشی کاك عەزیزی داود بووم پێشتر یەکترمان دەناسی گووتی ئەحمەد کوردە ئەو رەبایە ئەگیراوە گووتی وەرە با هێرشێکیان بۆبکەین لەگەڵ کاك عەزیز ئاربیجیەکمان بەرەبایەکەوە ناو جاشەکان رایان کرد ئێمەش بەرەو شوێنی خەلفی خۆمان گەراینەوە، چووینەوە گوندی گەرەوانی سەروو بۆ شەوی داهاتوو کاك جەلال ئیلنجاغی و چەند پێشمەرگەیەکم رەوان کرد بۆ ئەوەی شەهیدەکەو دۆشکەکە بهێننەوە بەلاًم زۆر گەرابوون نەیان دۆزیبۆوە من عەلاگەکی رەشم لەلای دۆشکەکە خستبوو چونکە قۆریە گەلاًدێیەکان زۆربوون شەوی دووەم دووبارە مامە قالەو کاك جەلالم رەوان کرد لەگەڵ پێشمەرگەیەکی ئەو ناوچەی ئەوێ ناوی محەمەد گۆرەشێری بوو لەو چەکە مزەلیانەی لەناو دەبابەکان گرتبوومان مزەلی یەکم دا بەو محەمەد ناوە ،لەگەلًیان چوو خەلًکی ناوچەکە بوو یەکسەر چوو بووە سەر قۆریە چرووەکەو عەلاگە رەشەکە،دۆشکەکەو شەهیدەکەیان هێنایەوە لای ئێمە و گەرانەوە، بۆ بەیانی یەکەی من لەگەڵ موحسین حەمشین ،نادر ئیمام ،هیدایەت حەمەد ، گەراینەوە بۆ دەشتی هەولێر شەهیدەکەمان بردەوە بۆ گوندی ئیلنجاغ کاك جەلال و مامە قالە لەگەڵ کەرتەکە مانەوە، ئەوەی شایانی باسە ئەم داستانە بەخوێنی گەشی ئەم پێشمەرگانە ئەنجام درا (شەهید لەتیف جێگری فەرماندەی تیپ خەلًکی گەرەوان ، شەهید کاروان خەلًکی تالەبانی گەورە ،شەهید بارزان خەلًکی مەرزان ) هەزاران سلاًو لەگیانی ئەو پۆلە شەهیدەو گشت شەهیدانی گەلەکەمان.

## داستانی رزگاری ١٩٨٧

لەکۆتایی مانگی ئازاری ١٩٨٧ ئاگادارکراینەوە لەدەشتی هەولێر کەهەموو تیپەکان بەرێ کەوین بەرەو سەرکردایەتی، ئێمە هاتینە دەشتی کۆیە لەوێوە لەزێی بچوك پەڕینەوە بۆ گوندی گۆپتەپە لەوێشەوە بەرەو گوندی کەڵەشێرەو گەورەدێ کەدەکەوێتە پشتی چەمی ڕێزان، لەوێش شۆڕبوینەوە هاتینە گوندی شیلەخان ئینجا پەڕینەوە بەشەو بەرەودۆڵی شەدەڵە، گەیشتینە گوندی شەدەڵــە (من وشەهید ڕێبازو شەهید خاڵەمامەند مەنتك وصەلاح شینە وجەلال ئیلنجاغی )٠دیاربوو ئەوشوێنەی لێی پەڕینەوە صلاح شینە بانگی جاشەکانی سەرجادەی کردو گووتی( جاش، جاش ) ئاگاداربن ئێمە پێشمەرگەین ( دیاربووجاشەکان جوابیان دایەوە گووتیان فەرموو ڕەت بن ئێمە بەبن ڕەبیەکانیان دا پەڕینەوەو بەسەر کەوتین بەرەو هەلاج ودابان لەوێش بەرەو سەرگەڵو و بەرگەڵوو لەوێش هێزەکانمان دابەش کران بەم شێوەیە ( من ومام ڕۆستەم ) لەگەڵ( مامۆستا بەکروشەهید محمد شینەو مەولود مام قلینجی و ئاشتی سابیرو مجید میرخان ) تیپی ٩٣ بەگشتی بەسەرپەرشتی بەڕێز ملازم عمر ئەوکاتە بەرپرسی مەکتبی عەسکەری (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان)بوو خۆی لەگەڵ ئێمە لەدەستەی هجوم بوو بۆسەرچیای گۆجاڕ کەدواتر دەستمان بەسەردا گرت ،تاشۆڕ دەبێتەوە نزیك گەڕەدێ ومالومە بەشێکی تیپی ٨٣ ی هەورێ ( سمایل ومرتی ) دلێرکانی ڕەشی ، ٢٠ کەس لەکەرتەکەی من لەگەڵ جەلال ئیلنجاغی کە ئەوکاتە جێگر کەرتی من بوو ،مام عەلی شۆڕش گێڕان لەگەڵ کاك نادرو پێشەوای عەلی مەولود ،ئەوان بەهاوکاری بەشێکی تیپی ٨٥ ی بەڕانەتی کەئەوانیش بۆخواروی گوندی مالومە داندرابوون کەچەند ڕەبیەو مەقەڕی سریەی عەسکەری لێ بوو دەستیان بەسەردا گرتن و پاکیان

کردنەوە، بەگشتی جەبهەکەمان سەرکەوتوو بوو ئەوشوێنانەی کاتی خۆی سوپای عێراق داگیری کردبوو لەماوەی یەك کاتژمێر هەرهەمووی پاك کرایەوەو ئازادکران، خەسارەی حوکمەت بەژماردن نەدەهات لەخواروی گوندی گەرەدێ یەکترمان گرتەوە، کاك جەلال ولەتیفەسور ونادرئیمام لەتیپەکەی ئێمە برینداربوون، لەتیپی کاك سمایل پێشمەرگەیەك شەهید بوو کاك دلێرکانی رەشیش زۆربەسەختی برینداربوو (کاك دلێر پێشمەرگەیەکی لەگەڵ دەبێ بەناوی برایم دەچێت وولاغ بۆکاك دلێر بێنێ بۆئەوەی بیگەیەنێتە نەخۆشخانە) کاتێك مـــن توشی کاك دلێر بووم وەزعی زۆر خراپ بوو بە پێشمەرگەکانی خۆم لەکۆڵمان کرد تاکو نزیکی نەخۆشخانەکە لەوێش برایم هاتەوە ولاخێکی هێنابوو کاك دلێرمان گەیاندە نەخۆشخانەکەو ئەمان هێشت شەهید ببێت ،دواتر بۆماوەی چەند رۆژێك کاك نادرو کاك جەلالم ئیزندا کەبگەرێنەوە بۆدەشتی هەولێر، ئەوکاتە بەرێز کاك کۆسرەت بەرپرسی مەڵبەندی ۳ بوو بەشێك لەهێزەکانی کۆکردەوەو بۆخۆی هاتە گوندی گەرەدێ سەرپەرشتی ئەو جەبهانەی دەکرد کەناوچەیەکی زۆر فراوان بوو، شەرەکە زۆری خایاند هێواش هێواش پێشمەرگەی تیپ و کەرتەکان کەم دەبوونەوە پێشمەرگە شەهید دەبوون وبریندارەدەبوون وزۆریش ماندودەبوون بەئاخیری من تەنیا ۲۰ پێشمەرگەم لەگەڵ مابوو ئێمە هەمـــوومان چووینە گوندی گەرەدێ گوندێکی گەورەبوو خانوەکانی بەخشت دروست کرابوو بەلام زۆربەی خانوەکان دووقات بوون، ئەوسیل سیلەی پشتی گوندی گەرەدێ لەگەڵ بەرزایی گۆجار درابوو بەتیپی ۸۵ ی بەرانەتی کاك عەلی مەسیفی وەك جێگرتیپ سەرپەرشتی دەکردن (کاك عەلی بەداخەوە لەنزیك بەرزایی گۆجار شەهید کرا)،رۆژێکیان بینیم دوو پێشمەرگەی کاك کۆسرەت لەناو دێ یەکە دەگەران تاقیبی منیان دەکرد هاتنە لام وگووتیان کاك کۆسرەت تۆی دەوێ منیش چووم بۆلای

بەرێزکاك کۆسرەت پێ ی گووتم کوردەگیان کاك عەلی مەسیفی شەهید بووە هێزەکەشیان زۆر هیلاکن تۆدەبێت ئەوشوێنانەی ئەوان پڕبکەیتەوە کە پێشمەرگەی کەم لێ مابوو گووتیشی ئێوە نابێت گۆجار چۆل بکەن ،هەرچۆنێك بێت ،دەبێت چەند ڕۆژێکی تر خۆمان ڕابگرین چونکە دوژمن لەشکانە هەمیشە لەشەڕەکان کاك کۆسرەت دوژمنی بەشکاو دادەنا هەرچەندە دوژمن بەهێزیش بوو بەلام خۆیان لەبەردەم هێزی پێشمەرگە ڕانەدەگرت ودەشکان گۆجار شاخێکی زۆر بەرز بوو شوێنێکی ستراتیژی بوو بۆیەکەدەچویتە سەر شاخ کلۆپی شارەکانی عێراق ونێرانی زۆر لێوە دیار بوو بەرووی ڕۆژئاوای شاخی گۆجار گوندێك هەبوویەناوی گەورەدێ ،گەورەدێ ئەوکاتە بارەگای حزبی دیموکراتی کوردستانی ئێرانی لێ بوو لەگەل ئەخۆشخانەکەیان،بەرووی ڕۆژهەلاتیشەوە گوندی وولاغ لوی لێوە دیارە کەبەدەست ڕژێمەوە بوو ئێمە بەسەرکەوتیین بۆسەر قۆپکی سەرەوە کەهەمووی کۆنە ڕەبیەی عەسکەری لێ بوو کە چووینە سەر چیا تەماشای جوگورافیای گردەکەم کرد ،سەرگردەکە شاخێکی ڕووت وقوت بووهیچ دارو شینایییەکی لێ نەبوو لایەکی گردەکەش بەفر بەری نەدابوو هیچ کەس نەیدەتوانی بەسەر بەفرەکەدا سەربکەوێ ، پێشمەرگەکانی کەرتەکەم کۆکردەوە گووتم :براینە ئێرە کۆنە ڕەبیەی عەسکەریە پاچ وخاکەناسی لێ یە هەریەکەو قۆلتێکی مەتر قول لێ بدات هەرکەس بەگوێرەی قەدو بالای خۆی ،دابەشم کردن لەڕیزی پێشەوە واتا نزیك بەدوژمن هەر ئەوشەوە قولتەکانمان تەواو کردلە پێش چاوی ئێمە دوژمن خۆی ئامادە دەکرد بۆهێرش کردن بۆ بەرزایی گۆجار کەئێمەی لێ بوو، دوژمنیش پێ ی وابوو کەئەو شوێنەی ئێمە کلیلی ناوچەکەیە و ستراتیژە بۆیە زۆر هەولی گرتنی دەدا، بەیانیەکەی سەعات نۆ دووکۆپتەرو تەیارەیەکی پیلا تۆز هاتنە سەر ئاسمانی ناوچەی شەڕەکە دوو جار بەئاسمانی گۆجاردا سوڕانەوە منیش بەبرادەرانم

گووت کورینە هەرکەس بچێتە ناوئەو قۆڵتەی کە لێمان دابـوو چـونکە ئێـستا دەبێ بەتۆپ بـاران کەسیش لەقۆڵتەکەی خۆی سەر دەر نەهێنێ تـاکو تۆپ بـاران تەواو دەبێ ،لەسەر بـازگەی نزیك قەلاچۆلان کەسەربـازگەیەکی گـەورەی رژێـم بوو تۆپێکی هاویشت لەسەرگردەکەی ئێمەی دا بەلآم ئەوتۆپە تەنویرو تەرکیز بوو بۆرەسەدی تەیارەو هەلی کۆپتەرەکان دوای ئەوتۆپە مـاوەی یـەك چـارەگە سەعات تۆپ بارانێکی قورس کراین لەلایـەن پیلاتۆزەکـەو کۆپتـەرەکان بـەو نوێژی نیوەرۆیە لەسەر بەرزایی ئەم گردە لەبەر دووکەڵ وبوخاری سارۆخ و تۆپ بارانەکە کەس کەسی نەدەبینی ( رێژەی بینین ببوو بەنیوەمەتر ).کەمێك لەدوای تۆپ بـارانەکە قواتـی خاسە هێرشیان کرد بۆسەرمان بەلآم سەرکەوتنیان بۆلای ئێمە ئـاسان نەبوو چونکە وەك بـاسم کرد شـاخەکە زۆر سەخت ودژوار بوو ئێمەش سەنگەری چاکمان هەبوو پێشمەرگەش بیرو بـاوەری لەهەموو ئەوتۆپوتەیارانە بـەهێزتر بـوو ،چـەند جـارێك هێرشـەکانیا نمان تێـك دەشکاند.برادەرانی خوارەوەو بەرێز کاك کۆسرەت وبرادەرانی گەرەدێ هەموویان کشابوونەوە بۆدواوە ئێمە لەوان دابرابـووین پـاتری جیهازەکـەشمان مردبـوو ،بەرێز کاك کۆسرەت چووبووە لای بەرێز مـام جەلال،بـارەگاکـەی بـەرێز مـام جەلال لەئێمەوە دووربوو بەلآم شەرەکانی ئێمەیان بەوردی بەدوربین بینی بوو ، بەرێز مام جەلال پرسی بووی کێ یە ئـەم شـەرە دەکـات ؟؟ کـاك کۆسـرەتیش گووتبووی ئەوە ئەحمەد کوردەیە لەگەڵ کەرتە قـارەمانەکەی لەسەری گۆجـارن بەتەنها هەرنەولەوێ ماوە،گـووتبووشی پەیوەندیمان پچراوە وەلآمـی جیهازیش نـادەنەوە ،ئێمە بەونـانو خواردنە کەمەی کە پێمان بوو سێ شەووسـێ رۆژ لەسەر چیای گۆجارِ ماینەوەو بەرگریمان کردو چەندین جار یـان بـاشترە بلێم لەماوەی ئەم سێ شەو ورۆژە زیـاتر لەشەش جار هێرشی قواتـی خاسەمان بۆهات بەلآم ئێمە لوتمان دەشکاندن چەندین لاشەیان لەمەیدانی شەر بـەجێ مـابوو

بەلام دوای سێ شەو ورۆژ شەرکردن بێ هیچ پشتیوانیەك، فیشەك وگوللە ئاربیجیمان کۆتایی هات کەسیش دەستی نەدەگەیی بەئێمە کەبۆمان بهێنێ بۆیە بریارمدا شەوی چوارەم بەلای حیزبی دیموکرات دا بچینە خوارەوە سەرگردەکەمان چۆڵ کرد،سەعات ونیوێك دوای رۆیشتنی ئێمە دوژمن هێرشیان بۆ شوێنەکەی ئێمە کردو لەشوێنی ئێمە فیشەکی گرداریان دەهاویشت گوایە بەسەرکەوتن ، ئەوشەوە تاگەیشتینە ناو حیزبی دیموکرات سەعات بوو بەنۆی شەو بەلام ئەوەی لەبیرم ناچێت دەستەیەك لە فەرماندەکانی حیزبی دیموکرات راوەستابوون بۆ پێشوازی کردنمان زۆر بەرێزەوە ئێمەیان ماچ کردو زۆر رێزیان لێ گرتین بەخێریان هێناین ،خواردنێکی باشیان داینێ ،ئەو پێشمەرگەی پێلاوو گۆرەوی دڕابوو ئی نوێ یان دا پێیان ،ئێمەتەنها یەك پێشمەرگەمان بەسوکی بریندارببوو بەناوی (ئەحمەد حاجی سەعید) تەداویان بۆ کرد ،دووجار تا سێجار یەك لەبەرپرسەکانی حیزبی دیموکرات دووبارەو سێ بارەی دەکردەوە دەی گووت قوربانتان بم کورد پێشمەرگەی وەك ئێوەی هەبێ هەرگیز نابەزێ هەرسەر دەکەوێ چونکە ئەوبەرپرسە بەرێزە ئەوشەرەی ئێمە کردبوومان بەچاوی خۆی بەگشتی هەر سێ شەوو رۆژی بینی بوو، ئەوبەرپرسە بەرێزە لەگەڵ ئێمەنانی خوارد گووتی ئەم چەند رۆژەی ئێوە واشەر دەکەن من بەدیارتانەوە دانیشتوم و نانم نەخواردوە، بەراستی هەڵوێستێکی جوامێرانەبوو ،دواتر تەکلیفیان کردم گووتیان ئەگەر بەعسیەکان بزانن تۆ هاتوویتە ئێرەو یارمەتی تۆمانداوە لێمان قبوڵ ناکەن ،منیش تێگەیشتم و سوپاسی یەکەبەیەکەیانم کرد بۆ ئەم هەموو هاوکاری و ماندوو بوونەی بۆئێمەیان کرد ،بریاری بەرێکەوتنم دا بەرەو بارەگای سەرکردایەتی خۆمان ،دوعابوو نمان لەبرایانی دیموکرات خواست ،دوو دوو وەك دەستوری پێشمەرگایەتی خۆمان بەرێ کەوتین چەند سەد مەترێك لەبارەگاکەی حیزبی

دیموکرات دوورکەوتینەوە سەیارەیەکی بێلایەنمان بینی ڕووبەڕووی ئێمە بۆ لای بارەگای حیزبی دیموکرات دەچوو کە گەیشتە لامان ڕامان گرت سایەقەکە گووتی ئێوەکێن ؟ منیش گووتم من ئەحمەد کوردەم ئەی تۆکێی ؟ ئەویش گووتی ماڵت بەقوڕ ئەگیرێ هەموو مەکتەبی سیاسی خەریکی ئەوەن تۆ بدۆزنەوە کاك کۆسرەت والەداخی تۆ خەریکە شێت بێ ،یەکترمان ماچ کردو من و چەند پێشمەرگەیەك لەسەیارەکە کەلەجۆری لاندگرۆزەر بوو سواربووین بەبرادەرانی تریشم گووت ئەوانەی جێگایان نەبۆوە لەسەیارەکە گووتم هێواش هێواش وەرن بەرەو بارەگای کاك ئەوشێروان لەبەرگەڵو بەلاّم زۆر وورپای خۆتان بن، من بەسەیارەکە ڕۆیشتم چووم بەرەولای بەڕێز کاك کۆسرەت کەبەڕێز مام جەلال و کاك فەرەیدون و کاك ئەرسەلان بایز( لەڕاگەیاندن بوو دەوری باشی هەبوو لەجۆشدانی هێزی پێشمەرگە ) و بەرپرسی تری زۆری لێ بوو هەموویان یەکە بەیەکە لەدڵەوە ماچیان کردم و ئافەرینیان دامێ و دەست خۆشی گەرمیان لێ کردم و پارەی دووحەیوانیان بۆسەرف کردم لەگەڵ چەند قەمسەڵەیەك بۆپێشمەرگە قارەمانەکانی کەرتەکەم ، کاك کۆسرەت بەدەنگی بلند گووتی :کوردەگیان چەند شەهیدت هەیە منیش وەلاّمم دایەوە گووتم کاك کۆسرەت تەنها یەك بریندااری سوکمان هەیە باقی برادەرانم سەلامەتن ،هەموو ئەوبەڕێزانەی کەلەمەجلیسەکەدابوون سەریان سوڕما لەوەی لەم شاخە ڕوتەو لەناو ئەوشەڕو پێکدادان وتۆپ بارانە شەهیدمان نەبوو ، دوای حەسانەوە من ڕۆیشتمەوە بەرەو بەرگەڵوو .بەڕێکەوتم بۆناو پێشمەرگە قارەمانەکانی کەرتەکەم لەوێ یەکترمان گرتەوە ٠

ئەو پێشمەرگەقارەمان وچاو ئەترسانەی لەم شەڕە بێ وێنەیە لەکەرتەکەی من بوون بریتین لەمانە :

١. ئەحمەد کوردە

٢. عەول

٣ بارزان مراد

٤. ئەحمەد حاجی سەعید شاخە پیسکەیی

٥. لەتیف شوڕتە

٦ میقداد ونکە

٧. قاسم بانی مارانی ( قاسمە کۆر )

٨. ئامانج تاهیر

٩. شەهید گەیلان سابیر

١٠. موحسین حەمشین

١١. فتح الله داربەسەری

١٢. پیشتیوان بانی مارانی

١٣. مامۆستا فارس بنەسلاوەیی ( هێرش )

١٤. مام عەلی( عبدالخالق )

١٥. ئیحسان مورتکەیی

١٦. یداللەڕەئوف گۆمەشینی

١٧. تەحسین قەراجی

١٨ هیدایەت حەمەد

١٩ غفور حەمەد

٢٠. چوارپێشمەرگەی قارەمانی تر زۆر بەداخەوە ناوەکانم لەیاد نەماوە داوای لێبوردنیان لێدەکەم ٠

ـ کاك عبدالله بۆرو سەعیدی حەمەزیاد لەسەر شاخی خەجە لەرزۆك بوون کەشاخێکی بەرزو عاسێیە بەڕێزمام جەلال بروسکەیەکی لێ دابوو بۆ کاك عبدالله بۆر دەڵێ هیممەت بکەن نەهێڵن شاخی خەجە لەرزۆك بگیرێ

چونـــــــــــــــکە ستراتیژە ٠ ئەوانیش وەك پێشمەرگە وبەرپرسیاریەتی بەرامبەر پێشمەرگایەتی هەوڵ وتوانی خۆیان خستە کار بۆ بەرگری کردن لەشوێنەکەی خۆیان، جێی شانازیە ئەو دووتیپە ئەیان هێشت شاخەکە بۆماوەی پازدە ڕۆژ بگیرێ ٠

ـ گرد بەرانان کەدەکەوێتە نێوان گوندی بالغو وولاغ لو دانرا بۆئەم فەرماندەو پێشمەرگە قارەمانانە

١. کاك سابیر ڕەسوڵ مەسئول عەسکەری
٢ شەهید ڕێباز فەرماندەی تیپی ٨٦
٣. (شەهید ئازاد داربەسەری ف.ك ٤ )لەتیپی ٨٦
٤. صلاح شینە (جیگرتیپی ٨٦ )
٥. لەتیفە سور (کەرتی تیپ لەتیپی ٨٦ ) برینداریش بوو
٦ عەلی پونگینە (ف.ك.٣ )لەتیپی ٨٦
٧. مامۆستا خالید (ف.م )
٨. حوسێن کورداوە (ف.م )
٩. شوان باغەمرە (شوانە شەل)، (ف.م )
١٠. فەتاح ڕەحمان تاڵەبانی ڕابەری سیاسی تیپ
١١. ئەحمەد عەودول ئیلنجاغی
١٢ جەوهەر کەرکوکی
١٣ کامەران
١٤ مەغدید ئامۆزای صلاح شینە
١٥ مەلا برای صلاح شینە
١٦. ئیسماعیل دووگرتکانی
١٧. سابیر هەژار

١٨. وەستا مەعروف باخچەیی

١٩ عومەر ڕەسوڵ

٢٠ کۆمەڵێك پێشمەرگەی قارەمانی تر کەزۆر بەداخەوە ناویانم لەیاد نەماوە.

## گرتنی قاطعی جەیشی شەعبی ابو جعفر منصور

لەمێژ بوو نیازمان وابوو کەوا ئەم قاتعە بگرین هەم زەرەرێکی گەورە بەدوژمن بگەینین هەم ڕێگای خۆمان خۆش بکەین بۆ هاتوو چۆی قەراج، لە (٢/١) ی مانگی ٦ـ ١٩٨٧ (من و شەهید ڕێبازو مام غفورو سەعیدی حەمە زیاد و چەند فەرماندەیەکی کەرتەکان چووین بۆ سەیرکردنی قاتعەکە بەلاّم لەسەر چۆنیەتی گرتنەکە ڕێك نەکەوتین گەڕاینەوە لای بەڕێز کاك کۆسرەت) ،لەبیرمە شەهید عمر عەوێنە هاتە پێش کاك کۆسرەت و وەستاو گووتی من و نورە ئەو قاتعە دەگرین، قاتعەکە دانرا بۆ ئەو دوو کەرتە قارەمانە ،دواتر نەخشە دانراو لە (٤ـ٦ـ١٩٨٧) من و کاك دەشتی هەمان ڕەبیەی شێراوەمان گرتەوە کە جارێکی تریش گرتبوومان بەلاّم کاك دەشتی هیچ پێشمەرگەی لەگەڵ نەبوو، من ئەم دەزانی کاك کۆسرەت مەبەستی بەرزکردنەوەی کاك دەشتی یەوخۆشی دەوێ بۆیە لەشەرەکان لەگەل ئێمە بەشداری پێ دەکرد ،دوو جار ئەو ڕەبیەمان گرت هەردوو جار قەناسی تێدابوو هەر جارەی بۆ یەکێکمان بوو، من و کاك دەشتی بووین بەخاوەن قەناس ئەو شەوە سێ جەیشی شەعبیمان بەدیل گرت ، شەهید ڕەوەند لەڕەبیەکی تر شەهید ببوو جەنازەکەی بەجێ مابوو، بۆ بەیانی لەڕێگای مەلا عزیزی کەردزەوە ئەو سێ دیلەمان بەتەرمی پیرۆزی شەهید ڕەوەند گۆڕیەوە، ئەوەی جێگای داخەو دەمەوێت باسی بکەم

لەرەبیەی تەك ئێمە فەرماندەی بچکۆلەو روح سوك و خۆشەویستی هەردوو تیپ (کاکە فوئاد محمەد گۆمەشینی شەهید بوو) کە لەگەڵ کاك ئازاد داربەسەری چووبوونە سەر ئەو رەبیەی تەنیشت گوندی شێراوە ، لەکەرتەکەی من ئەحمەد کانی لەلەیی بریندار بوو کە لەلای سەیارەکان بەجێم هێشتبوو گوللەیەکی دوور بەدووری بەرکەوتبوو، بەگشتی (١٦) رەبیەو قاتعەکە بەتەواوی گیرا، چەند سەیارەو زیاتر لە (٢٥٠) کلاشینکۆف و فیشەك و تەقەمەنیەکی زۆرو چەندین چەکی هەمەجۆر دەست کەوت بوو، بەدەیان جەیشی شەعبی و فەرماندەکانیان کوژران و بەدەیانی تریان بە دیل گیران هەر لەدوای ئەم شەرە کاك کۆسرەت شەهید دەشتی کرد بە جێگری تیپ بەلام زۆر بەداخەوە تەمەنی درێژ نەبوو لە شەری نا بەرامبەری سماقولی شەهید بوو، هەزاران سلاو لەگیانی پاکیان (شەهید دەشتی و شەهید رەوەند و شەهید فوئادو سەرجەم شەهیدان) ، کاك عمر عەوێنەو نوری قادر دەورێکی کاریگەریان گێرا لەم شەرە قاتعەکەیان گرت و قسەکەی خۆیان بە جێ گەیاند.

## *داستانی تەق تەق*

ماوەیەك بوو دوژمن هێرشەکانی خۆی بۆ سەر سەرکردایەتی (یەکێتی نیشتیمانی کوردستان) چڕ کردبۆوە ، دەبووایە هێزەکانی یەکێتی بەزۆری پاسەوانی لە سەرکردایەتی بکەن بۆیە ئێمە لە دەشتی کۆیە کۆبووینەوە بە مەبەستی گرتنی شارۆچکەی تەق تەق، لە سێ قۆڵەوە هێرش بۆ تەق تەق کرا ،کەنزیك بوینەوە هەر قۆڵێکیش بوو بەچەند بەشێك ، قۆڵەکەی ئێمە چەند سەرتیپێك لەگەڵ ئێمە بەژدار بوون، تیپی (٩٢) ی کۆیە و(٨٥) بەرانەتی و دەستەکەی بەرێز مامۆستا چەتۆو کەرتی رێکخستنی کۆمەڵەو

ناوچەی شۆڕش گێڕان و تیپی (١٢) ی سۆران و بەشێکی تیپی (٨٦) ی دەشتی هەولێر بە سەرپەرشتی کاك فارۆقی علی مەولود ،

پێش ئەوەی بگەینە ناو شار ( نیازی کاکە ڕەش لەگەڵ سەربازی بەکر شەریف ) هاتنە پێشمان و ئەوان لە ناو شارەوە هاتبوون وە دەلیلی گرتنی تەق تەق لەلای ئەوانەوە دەکرا بە سەرپەرشتی نەوزادی کاکەڕەش ،ئینجا بەم شێوەیە دابەش بووین.

کەرتەکەی من لەگەڵ کەرتەکەی ئازاد داربەسەری خۆم سەرپەرشتیم دەکردن ،سەرباز پێشمان کەوت بەدەم زێ و دەم زێ و بن شاخی قەلان، دوو ڕەبیەو دوونوقتەی جاشەکان کە ئەوانیش مقەڕ بوون گرتنیان بوو بە عایدی ئێمە،گرتنی گردی کە ڕەبیەکی گەورەی لە سەربوو کە دەکەوێتە پشتی کارەباکەی تەق تەق ئەو بوو بە عایدی کاك فارۆق و سەعیدی حەمەزیاد وعوزێر فەقێیانی •

بەشی سێ یەم بەتێکەلاوی تیپی (٨٥) ی بەڕانەتی لەگەڵ مەفرەزەکەی مامۆستا چەتۆ و لەگەڵ بەشێکی تیپی (٩٣) ی کۆیە کە شێخ فەتاحیان لەگەڵ بوو ،مەشروعی ئاوەکەو ڕەبیەی پشتی مەشروعەکەیان پێ سپێردرا ،دوو ڕەبیەی تر هەبوو هەر لەپشت ئەوانە لە سەر جادەکە ئەوانیش بەتیپی (٩٣) و بەشێکی (٨٥) ی بەڕانەتی سپێردرا ،

بەتێکڕا فەرماندەکان ئەوانە بوون :

( فارۆقی علی مەولود ، تەحسین کاوانی ، سەعیدی حەمەزیاد ، ئەحمەد کوردە ، عوزێر فەقێیانی ، ئازاد داربەسەری،حاجی مەسیفی ،شێخ فەتاح ،مەولود مام قلینجی ، مام سیامەند ، محەمەد شینە ) ، لەکەرتەکەی من عەول بریندار بوو ،لەدوای گرتنی ڕەبیەکەی خۆیان فارۆقی علی مەولود و سەعیدی حەمەزیاد

هاتن بۆ هاوکاری ئێمە ،چونکە کــاك ئــازاد داربەســەری و حوسـێن کــورداوەو مامۆستا خالید بریندار بوون ، دواتر ئازاد داربەسەری شەهید بوو ،

شەڕی نـاو شار تۆزێك زەحمەتە ئەوەی نەی دیبیٚ نـازانیٚ چـۆنە ،هـەر لـەو شوێنەی کاك ئازادی لیٚ بریندار بــوو کــاك فــارۆقیش ئاربیجیــەکی خــستبووە سەرشانی بۆ ئەوەی بیتەقێنیٚ گوللەیەکی ئاربیجی لــە بــەردەمی کــاك فــارۆق کەوتەوە ، بەداخەوە کاك فارۆقیش بەسەختی بریندار بوو ، ئــەو قۆڵــەی لای ئێمە بەگــشتی ســەرکەوتنی باشمــان بەدەســت هێنــا بــەلاّم بەداخــەوە چــوار شەهیدمان هەبوو لەگەلٚ چەند برینداریٚك، بەلاّم دەبیٚ ئەوە باش بــزانین کــە گرتنی شاریٚکی وەك تەق تەق ئاسان نەبوو

بەشێکی رەتلی مام غەفور پێك هاتبوو لەمانە :

( مام غەفور ، نوری قــادر، فاقــە مــەخموری ، عــــــــــومەر عەوێنــە ، مەنـاف عبدالوهاب )، ئەمانە دانــدرابوون بــۆ ســەر بینــای زراعەکــەو ســەری جسرەکە کە رەبیەی جەیشی شەعبی لیٚ بوو ،

بەشەکەیتر لەرەتلەکەی مام غەفور پێك هاتبوو لەمانە :

( دەشــتی موهەنــدس ، عمــر ئاســر ، جــەلال ئیلنجــاغی )، ئــەو بەشــە بەسەرپەرشتی دەشتی موهەندس بوو چونکە ئەو جێگر تیپ بــوو ، ئەمانــە بــۆ سەر ماڵە ئەمنەکان و ئەخۆشخانەکە و مقەریٚکی پۆلیس داندرابوون ٠٠

عەلی پونگینە فەرماندەی کەرتی ( ٤ ) وجێگرەکەی کە شــەفیق چاوشــین بــوو رەبیەی سەرگردی ( گەرمك ) یان بۆ دانرابوو ،

فواد گۆمەشینی رەبیەکانی ناو دەواجنەکانی بۆ داندرابوو ،بۆناو شاری تــەق تــەق قــوەتێکی ( ٥٠ ) کەســی بەسەرپەرشــتی کــاك ئاســۆ ئــەڵمانی و چــەند فەرمانــدەی کــەرتی تــر بــۆ ســەرماڵی ئەحمــەد ئاغــا و دائــیرەی ئەمنەکــە

داندرابوون، شایەنی باسە ڕاستەو خۆ بەڕێز کاك کۆسرەت بەجیهاز سەرپەرشتی شەڕەکەی دەکرد ۰

گرتنی شارۆچکەی تەق تەق بۆخۆی سەرکەوتنێکی مەزن و لوت شکانێکی گەورەبوو بۆ ڕژێمی بەعس ، کاك کۆسرەت بڕیاری دا سەعات (٥) ی بەیانی هەموو هێزەکان لە شار بچینە دەرەوە چونکە گومان دەکرا ڕژێمی بەعس بە چەکی کیمیاوی لێمان بدات ۰

دیلی عەسکەرو جاش زۆر زۆر بوو دەسکەوت یەك جار زۆر بوو بەژمارە نەدەهات ، چەندین سەیارەو چەك و تەقەمەنی جۆراو جۆر وەهەروەها بارکردنی ئەخۆشخانەی تەق تەق وجیهازەکانی بەدالەی تەق تەق دەسکەوتی هێزی پێشمەرگە بوو ۰

بەری قەلاتە دانرابوو بۆ تیپەکانی مەڵبەندی (٢) و تیپی (٢٥) خالخالان و تیپی(٢١) کەرکوك و مەفرەزەیەکی مەکتەبی عەسکەری کە دەستەی کاك عبدالرحیم بوون ، شەڕی قەلاتە بەسەرپەرشتی کاك عبدالرحیم و سیروانی کوێخا نجیم بوو ۰

لەگەڵ تەواو بوونی گیرانی تەق تەق مەعەسکەری قەلاتەش بەتەواوی دەستی بەسەر داگیرا ،کە عقید محەمەد ئامری ئەو معسکەرە بوو ، ئەو شەوە لەوێ نەبوو ئیجازە بوو ئەگەر نا ئەویش بەدیل دەگیرا ۰

شایەنی باسە لە گرتنی تەق تەق کاك ئەوزاد خۆی و براو خزمەکانی دەوری کاریگەریان هەبوو وە هەر لەو شەڕەوە هاتنە ناو هێزی پێشمەرگەی (ی.ن.ك) وەتاك و ئێستاش لەخەبات بەردەوامن ۰

ئەم شەڕە وگرتنی شاری تەق تەق بەیەکێك لە داستانە گرنگەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان دادەنرێت لەبەر ئەوەی لەم شارەدا چەندین سەربازگەو فەوجی خفیفەو مقەڕی پۆلیس و ڕەبایەی عەسکەری هەبوون کە گرتنیان هەروا

ئاسان نەبوو ، بەگرتنی ئەم شارە ورەو توانایەکی گەورە درایەوە بەهێزی پێشمەرگە هەم لە رووی معنویەوە هەم لەرووی چەکو تەقەمەنی یەوە، لەهەمان کاتدا ترس و دڵەڕاوکێ یەکی گەورەی لەناو هێزی دوژمن دروستکرد ،

ئەوەی گرنگ بوو لەم سەردەمە بەشداری کردنی فەرماندە کانی وەك کاك کۆسرەت وشەهید عبدالرحیمومامۆستا چەتۆو چەندین فەرماندەی تری هێزی پێشمەرگە بوون کە دەتوانم بڵێم بەکۆڵەگەی سەرکەوتنی ئەم شەڕە گەورەیە دادەنرێت.

## شەری کۆپتەر

مام غەفور لەگەڵ کاك شاخەوان چەند سەیارەیەك پێشمەرگەیان لەگەڵ دەبێت و یەك دۆشکایان پێ دەبێ لە کەلی قەشکە بەسەر دەکەون بچنە خوارێ بۆلای گوندەکانی گەردزونەم ناوچانە ، کاتی عەسر دەبێت لەنزیك گوندی ئازیانە چوار پێنج کۆپتەریان لێ پەیدا دەبێ کۆپتەرەکان تەقە لەمام غەفورو کاك شاخەوان وجەماعەتەکەی دەکەن وئەوانیش بەناچاری سەیارەکان دەخەنەبن جسری بەستی ( شاقاز ) ی، خۆشیان دابەش دەبن شەڕلەگەڵ کۆپتەر دادەمەزرێنن، عەدەد دۆشکەکەیان ناوی ( فواد ) بوو پێشمەرگەیەکی زۆر قارەمانو چاونەترس بوو خەڵکی ناوچەی کەرکوك بوو ، تائەو کاتەی کۆپتەر بەصاروخی ئا پالم لە دۆشکەکە دەدات و فواد شەهید دەکات وەزعی پێشمەرگەکان باش دەبێت سەیارەکان گڕیان تێ بەردەبێتو وەزعی پێشمەرگەکان بەرەو خراپی دەچێت لەبەر ئەوەی کۆپتەرەکان بۆردومانێکی سەختیان دەکات ، ئینجا خەبەریان دابەمن کەلەلای ئازیانە شەڕە ، منیش بە خۆموکەرتەکەم لەگوندی ( سارتك ) بووم بەسەیارەکانمان بەرێ کەوتینوهاتینە ناو حاویەکانی گوندی ( قەشکە ) لەوێ سەیارەکانمان شاردەوەو پێشمەرگەکانم دابەش کرد چونکە لەو شوێنە پەناگەی زۆر باش

هەبوو ( کەونە بیر ، کەندو دۆڵی باشی لیٚ بوو ) ، بە ڕادیـۆی ( ئیٚف ئیٚم ) گوێمان لە سایەق کۆپتەرەکان گرتبوو لەگەڵ یەکتری قسەیان دەکـردو دەیـان گووت ( موخەریب ) ەکان تەقەیان زۆر کەم بووە پاش کەمێکی تر ئینزالیان بـۆ دەکەین ، پاش بیستنی ئەم قسانە منو پیٚشمەرگەکان کەوتینـە گفتوگـۆ بـۆ دانـانی پلانیٚـکو ڕوویەڕبوونـەوەی کۆپتـەرەکانو بـە دەنگـەوە چـوونی بـرا پیٚشمەرگەکانمان وکەم کردنەوەی مەترسی لەسەریان ، پیٚشمەرگەیەك بەناوی ( لەتیف شوڕتە ) گووتی با ئاویٚنە بەکاربیٚنین بۆ ئەوەی سەرنجی کۆپتەرەکان بۆ لای خۆمان ڕابکیٚشین ، ئینجا من ئیشارەتم بە ئاویٚنە بۆ کۆپتەرەکان لـیٚ دا چونکە کۆپتەرەکان زۆر بەنزمی جەولەیان بەسـەر ناوچـەکەدا دەکـرد ، ئیٚمـە نەمان دەتوانی بەسەرکەوین بۆ کەلی قەشکە وبچین بۆ یارمەتی دانیان چـونکە شویٚنەکە تەختایی یەو وەکو مام غەفورو برادەرانمان لیٚ دەهات.

بە ڕادیۆکە دیسان گوێمان ڕاگرتەوە لە سایەقی کۆپتەرەکان یەك لەسایەقی کۆپتەرەکان بە ئامرەکەی دەگووت سەیدی لە ناو ئەو شینایی یانـە ئیـشارەتم دەدەنـیٚ، ئیٚمـەش دڵمـان خـۆش بـوو گووتمـان شـەڕەکە لەسـەر کـاك شاخەوانوبرادەران لا دەبەین وکارەکەمان سـەری گـرت ، کۆپتـەرەکان بـۆ لای ئیٚمە هاتنو جەولەیان بەسەر ئیٚمەدا لیٚ دەدا ، بە پیٚشمەرگەکانم گووت کـەس تەقە نەکات تا نزم دەبنەوە ، کۆپتەرێکیان زۆر نزم بـۆوە لەگـەڵ پەروانـەی کۆپتەرەکە تۆزی لە ناوچەکە هەستاند بەتەواوی سایەقەکەمان لیٚ دیـار بـوو جەولەی دووەم پیٚم گووتن ئەگەر ئەم جـارە هاتـەوە لیٚ ی دەدەیـن ، جەولـەی دووەم کۆپتەرەکە زۆر نزم بۆوە دەی گووت چەند کەسیٚكو چەند سەیارەیەکی لیٚ یە ئیستا دەیانکوژم ، ئیٚمـەش هـەر بـەڕادیۆ گوێمـان لـە قـسەکانیان بـوو ، قسەکانیان تەواو نەکرد ئیٚمە بـە ( بیکەیـسیو ئـاربی جیوکلاشـنکۆف ) لـە کۆپتەرەکەمان داو ئاگری تیٚبەربووو بەرزبۆوە بەخیٚرایی بەرەو کەرکوك بـەڕیٚ

کەوت ،بە پێی قسەی ئەو کەسانەی کە بینیبوویان کە دواتر بۆ ئێمەیان گێرایەوە کۆپتەرەکە نەگەیشتبووە کەرکوك لە گوندی حەسار نیشتبووەوە سوتابوو .

کاك شاخەوان و برادەرانیش چاویان لە کۆپتەرەکە دەبێت کە دوکەڵی لێ بەرزدەبێتەوە و گڕی گرتووە کەیف خۆش دەبن دەڵێن هێزمان گەیشتێ ، کۆپتەرەکانی تر هێرش کەم دەکەنەوە لەسەر ئەوان و شەڕەکە کەوتە لای ئێمە و کۆپتەرەکان بەرزبوونەوەو بەربوونە صارۆخ باران کردنی ئەو ناوچەیەی کە ئێمەی لێ بوو بۆ ماوەی نیو کاتژمێر ، دواتر کۆپتەرەکان رۆیشتن و لای ئێمە ولای برادەرانی تریان بەجێ هێشت ، ئینجا ئێمە سواری سەیارەکانمان بووین و بەرەو لای کاك شاخەوان و مام غەفور بەڕێ کەوتین وکاتێك گەیشتینە لایان وەزعیان باش بوو بەڵام مام غەفور عدد دۆشکاکەی شەهید ببوو کوڕی گچکەی مام غەفور بریندار دەبێت و پێشمەرگەیەك بە ناوی مامۆستا نەورۆز فیشەکێکی دۆشکای بەرقاچی دەکەوێت و قاچی دەشکێت .

چاویان بەئێمە کەوت زۆر دڵخۆش وشادمان بوون وگووتیان ئێوە بوون ئەو شەڕەتان کرد لەگەڵ کۆپتەرەکان، گووتم بەڵێ ئەوانیش دەست خۆشیان لێ کردین و پێم گووتن لە تۆڵەی ئێوە کۆپتەرێکمان خستۆتە خوارەوە ، ئینجا بریندارەکان و شەهیدەکەمان بارکردو گەڕاینەوە گوندی سێگردکان کە نەخۆشخانەیەك لەوێ هەبوو.

## بوونم بەجێگری تیپ وگرتنی دێگەلە

ناوە ناوە گۆڕانکاری لەبەرپرسەکانی کەرت و تیپـەکان دەکـرا ئـەو جارەیـان منیشی گرتەوە کرام بە جێگری تیپی ( ٩١ ) ی سەفین ، کە کاک سەفین مەلاقەرە فەرماندەی تیپ بوو ، لەسەرەتاوە کەمن پەیوەندیم کرد بە تیپەکە کاک سەفین بۆ خۆی لەوێ نەبوو، ئەقڵەکەی منی لاخۆش نەبوو، ئەو کاتە کاک بەکرە سـور ڕابەری سیاسی تیپ بوو، من پەیوەندیم کرد بەبارەگای تیپ وکاک بەکرە سـوور و بەشێك لە فەرمانـدەی کەرتـەکان ومـەفرەزەکان لـەوێ بـوون، کـاك بـەکر کۆبوونەوەی پێ کردن و منی بەوان ناسـاند هەرچـەندە زۆریـشیانم دەناسـی ئەوانیش خۆشحاڵ بوون ،من لەدەشتی هەولێر ماڵەکەم بارکرد بۆ نازەنین کـاك بەکریش ماڵی لەوێ بوو لەنزیك بارەگای تیپ بوو منیش خـەڵکی نـازەنینم زۆر دەناسی،خاڵەکاکە پێشمەرگەیەکی دێرینـی یـەکێتی بووپارچـە ڕەزێکـی بـۆ وەرگرتم ماڵەکەم وبارەگای دەستەکەی خۆمم لەناودانا ، بروسکەیەکم بۆبەرێز کاك کۆسرەت کرد کەئەوکاتە ئەویش لەلای سەرکردایەتی بـوو، کـاك سـەفین وبەشێکی تیپەکەیـــــــان لەگەڵ ئەوان بوون وە هەروەها بروسکەیەکیشم بۆکاك سەفین کرد کەمن لەتیپەکە دەست بەکاربوویم بەلام کـاك سـەفین هـیچ وەلامی نەدامەوە، بروسکەی بۆکاك بەکرەسورو فەرماندەی کەرتـەکان کردبـوو ئەوانەی لەنازەنین مابوون کەواهیچ ئیلتیزامێك بەئەحمەدکوردەوە مەکەن تاکو خۆم دەگەڕێمەوە چونکە من قبوڵم نی یە، بەلام کاك کۆسرەت هەرموسیر بوو من لەوتیپـە بمێنمـەوە ، فەرمانـدەی کەرتـەکان ئەمانـەبوون ( کـاك صـباح پونگینەیی ناسراو بە کـاروان، لادێ شـەقلاوەیی ،کـارزان شـەقلاوەیی، خالید حاجی،ئەحمەدجەمیل ) کەزۆر بەیان برادەرم بوون ، تاکو کاك سەفین گەڕایەوە

من سەرپەرشتی برادەرانم دەکرد ئەوانیش زۆربەڕێکی گوێ یان بۆ ڕەنیەکانی من ڕادەگرتن کاك سەفین گەڕایەوە ئازەنین ئەمن چووم پێی بڵێم بەخێربێییەوە ئە ئەویش هات بڵێ بەخێربێی، تاکو ئەو ڕۆژەی کۆبونەوە لەماڵی بەڕێزکاك کۆسرەت لەسماقوڵی بۆدانانی ئەخشە بۆگرتنی دیگەڵە دەستی پێکرد ، لە١٩٨٧/٨/٢٥ برادەرانی دەشتی هەولێرو بەڕانەتی هەموو تیپەکانی مەڵبەندی (٢ ) هەموو فەرماندەی کەرت وجێگرتیپ و سەرتیپ وڕابەر سیاسیەکان ئامادەبوون دەعوەت کرابوون لەماڵی کاك کۆسرەت، بەڵام کاك سەفین بەمنی ئەگووتبوو بۆ خۆی چووبوو لەگەڵ کاك بەکرو فەرماندەی کەرتەکان ، وەختێك کاك کۆسرەت بروسکەیەکی بۆمن لێ دا دەڵێت بە پەلە وەرە بۆسماقوڵی بۆماڵی ئێمە، منیش ئەوکاتە گەنج بووم بەسەعاتێك چوومە ناو ماڵی کاك کۆسرەت ، پێش ئەوەی بچمە ژوورەوە ئەوان دوو ژووریان هەبوو ژوورێکیان بۆ میوان بوو ئەوەی تریان هی ئەمیرە خان ومنداڵەکان بوو ئەوان هەموویان نانیان خواردبوو ئەمیرەخانی خێزانی کاك کۆسرەت ودایکی شەهیدان بانگی کردم گووتی" وەرە بۆ ئێرە مەچووە ژوورەوە ئەوان نانیان خواردوە چاك وچۆنیمان کرد وگووتی" نانت خواردووە ؟ گووتم" ئەخێر گووتی" گۆشت قەلیشمان هەیە تورشیاتی فەخری بەگیشمان بۆ هاتووە دەزانم تۆش حەزت لە تورشیاتە، من نانم دەخواردو دایکە ئەمیرەش لەولاتر دانیشتبوو گووتی سەعاتێك دەبێ باوکی ڕێباز باسی ڕەبایەك دەکاو هەرمناقەشەیانە کەسیان ناچن بۆسەر ئەوڕەبایە بەلام تۆش ئەچی ئەوە پێت دەڵێم چونکە شەهید دەبی منیش گووتم بەقسەت دەکەم " خواحافیزیم لەوکردو چوومە ئەودیو لای جەماعەت هەر لەدەرگا چوومە ژوورەوە کاك کۆسرەت گووتی ئەوا ئەحمەد کوردە هات دەینێرم بۆسەر ئەوڕەبایە ئێوە حەقتان ئەبێت شوێنەکانی خۆتان جێ بەجێ بکەن ،کاك کۆسرەت تەعریفی ڕەبایەکەی بۆکردم وگووتی " کوردە گیان

تۆ دەبێ ئەم ڕەبایە بگری چونکە کلیلی شارەکەیە" منیش گووتم کاک کۆسرەت ئەوڕەبایە ناگیرێ زۆری پێناخۆش بوو ، ماوەیەك بەر لەئێستا شوعی یەکان تەقەیان لەڕەبایەکە کردووە پێ یان نەگیراوە حوکمەتیش ئێستا ئەم ڕەبایەی بەهێزکردوە، کاک کۆسرەتیش بەمنی گووت " ئەمرمو بمرە دەبێ جێ بەجێ ی بکەی " لەسەر خۆ کاك سەفین دەیگووت با ئەحمەد کوردە نەچێت بۆ ئەوڕەبایە چونکە بۆیان ناگیرێ وخۆشی شەهید دەبێ منیش جوابم دایەومو گووتم " ئەوەی ناودڵت بۆمن بێ "بڕیارم داو گووتم" کاك کۆسرەت باشە دەچم بۆسەرئەو ڕەبایە بەلاّم من بەئارەزووی خۆم پێشمەرگەکان هەڵدەبژێرم ئەگەر شەهید بووم یان خەڵك شەهید بوو سەرکۆنەم نەکەن چونکە بەخوێن دەگیرێت، گووتیان باشە ،جا من ئەم فەرماندە وپێشمەرگە بەڕێزانەم هەڵبژارد لەدەستەکەی خۆشم چەند کەسێکم هەڵبژارد (شەهید کارزان شەقلاّوەیی لەگەڵ کەرتەکەی خۆی دامان نا لەلایەك بەبیکیسی وئارپیجی لەڕەبایەکە بدەن، بەڕێز خالید حاجی فەرماندەی کەرت، ئیسماعیل ونکە ناسراو بەئیسۆ فیتەر فەرماندەی کەرت ، میقداد برای ئیسماعیل، ئەحمەد جەمیل فەرماندەی کەرت، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی قارەمان ،خۆشم چوارپێشمەرگەی دەستەکەی خۆم برد بوو بەو ناوانە (عبدلخالق ناسراو بەعەول ، بارزان مراد ، ئامانج تاهیر، صباح شاخە پێسکەیی ) ، ئێمە زۆر بەرێکی لەڕەبایەکە نزیك بووینەوە لەشەوی ٢٧-١٩٨٧/٨/٢٨ سەعاتی سفر یەکی شەو بوو، ئێمە خۆمان گەیاندە گابەردەکانی بەردەمی ڕەبایەکە کاك خالیدو کاك ئیسماعیل و کاك ئەحمەد جەمیل ومیقداد وچەند پێشمەرگەیەکی تر دەستەی هجووم بوون ، بەڕێز مام جەلال فەرمانێکی دەرکرد بوو فەرماندەی تیپ وجێگری تیپ نە دەبوایە لەدەستەی هجوم بن ، چونکە ئەوانە ئامر بوون ، جیهازی بچوکمان پێ بوو جفرەشمان لەگەڵ هەموو جیهازەکان دانابوو بەتایبەتی بەڕێزکاك کۆسرەت

چـونکە خـۆی سەرپەرشـتی راسـتەوخۆی شـەرەکەی دەکـــــــرد، لەبەربرپیارەکەی بـەرێزمام جـەلال مـن لەدەسـتەی هجـومی یەکـەم نـەبووم، سەعاتی سفر نزیك بۆوە دوو دەقەی مابوو ئێمە کەشـف بـووین ناچـار بـووین تەقەبکەین و شەرەدەستی پێکرد، بەلام ئێمە هیچمان شارەزا یمان بەرەبایەکـە نەبوو، رەبایەکە بەنەوعێك دروست کرابوو دووساتری بـەردی هەبـــــوو هەریەکەی سێ مەتر ئەستوریان بوو لەهجومی یەکەم چوارپێنج دەقیقـەی پـێ چوو منیش هەر لەدواوەی ئەوان بووم کاك خالید بریندار بوو کـاك ئیـسماعیل شەهید بوو دوو پێشمەرگەی تریشمان برینداربوون ،میقداد برای شەهید ئیـسۆ فیتەر هاتەلام گووتی "خاڵە کوردە ئیسۆ شەهید بوو رەبایەکەش ناگیرێ لاشەی پیرۆزی بەجێ دەمێنێ منیش هەرچـۆنێك بێـت بەپەلـە لەجیهازەکـەم عـەولم تۆزێك فێرکردو دامە دەستی گووتم هەرشتێك رویدا بەجفرە قسە لەگەڵ کـاك کۆسرەت وهەموولایەك بکە، ناچار من و بـارزان ومیقداد و ئامانج هێرشمان برد بۆ سەر رەبایەکە لەبەختی ئێمە مـانگیش هـەلاتبوو وردە وردە روونـاك دەبـوو ئەوانم لەشوێنێکەوە داناو گووتم ئێـوە ئـەلێرەوە تەقەبکـەن وسـەبر سـەبر برۆنە پێش بەلام ئاگاتـان لەمن هەبێ وا دەسورێمەوە کەفیشەکی گرداڕم هەڵدا بۆ ئاسمان ئێوە تەقەراگرن عەولیش هەر لەدوای ئێمە بوو، خۆم گەیانـدە بـن دیواری رەبایەکە کونـە مەتـەرێزێکی لێ بـوو لولـەی چـەکەکەم خـستە ژورێ وپەنجەم پێداهێنا لەژورەوە تەقەبرا، مەخزەنێکم پـێ بـوو تـەنیا بۆکـاری پێویست فیشەکی گرداری لەسەر بوو دەرم هێناو خـستمە سـەر کلاشـینکۆفەکەم بەسەر ئاسمانی دیگەڵە رستێکم تەقاند بەمانای ئەوەبوو ئێمـە رەبایەکـەمان گرتووە، پێشمەرگەکانیش گەیشتنە لام لەشوێنی خۆم دانـان و بۆخـۆم چـوومە ژوورەوە، دنیای ژوورەوە زۆر تاریك و سامناك بوو پێم لەلاشەی سـەربازێك نـا بەلام من زۆر ترسام و راچلەکیم، گەرامەوە دواوە و گووتم کورینە لایـت بهێـنن

ژوورەوە زۆر تاریکە، ئەوانیش بەپەلە لایتیان هێنا ، بەڕێز کاک کۆسرەت جیهازی بۆ کردم و گووتی کوردە گیان نائیب زابتێکی لێ یە ئەکوژرێ لەگەڵ جیهازە تۆمسۆنەکەی لەناو ڕەبایەکە هەیە زۆر گرینگە لەگەڵ خۆتانی بهێنن، من گەڕام هیچ نائیب زابتی لێ نەبوو بەڵام تەماشام کرد دەمانچە و جلەکانی لەژوورەکە هەڵواسرابوون لەناو لاشەکانیش گەڕام لاشەی ئەوی تیانەبوو ،دواتر بەسەر کەوتم بۆ سەربانی ڕەبایەکە تەماشام کرد بە کراس و بێجامە لە سەربان درێژ بووە و خۆی مات داوە قاچیم گرتوو ڕام کێشا خوارەوە گووتی " خاتر الله خاتر محمد انی صاحب جهال تو وجیت وانی فقیر انی عدد جیهاز "منیش گووتم "هم فقیر هم پێشمەرگە " گووتی"حکیت ویا بالعربی "،لەبەر ئەوەی من عەرەبیم باش دەزانی ئینجا بە عەرەبی لەگەڵی دوام زۆر کەیف خۆش بوو پێم گووت "نات کوژین مەترسە " دواتر کەلوپەلی ڕەبایەکەمان کۆکردەوە بەجیهازو برینــدار و شەهید و دەسکەوتەکانمان عەولیش برینــدار ببوو، بەکارزان شەقلاوەیی هەموو ئەو شتانەم ڕەوان کـردەوە بـۆ مەڵبەنـد بـۆ خـۆم هاتمە خوارەوە لە سەر سوچی ئەو جسرە ئاسنینەی کە تەنها ڕێی پیادەی لـێ بوو لەوێ توشی بەڕێز کاک کۆسرەت بووم، بەڵام تا ئـەو ماوەیـە تەقـە هـەر بەردەوامە لەهەندێك شوێن مقاوەمە هەبوو گوللە وەك باران دەبـاری مـن خـۆم لەکاک کۆسرەت تووڕە کردو گووتم کاکە تۆ لەچی دەگـەڕێی بـۆ ئێـستا هـاتی، گووتی کوردە گیان منیش پێشمەرگەیەکم وەکو ئێـوە، ئینجـا مـن پێـشکەوتم بەرەو مەخفەری شوڕتەی دیگەڵە کە هێشتا نەگیرابوو بۆ بـەیانیش نەفـەرێکی هەر تێدا مابوو گووتی دوژمندارم بەتەنها لەژوورێك بـوو گـووتی دوژمنەکـەم لەلای ئێوەیە تکا دەکەم بەکاک کۆسرەت بڵێ وازم لێ بهێنن وە پیاوێکی زۆر ئازا بوو ئێستا لەژیان ماوەو بە پشتیوانی خودا ئەو نووسینەی من دەبینێـت، منـیش بە بەڕێز کاک کۆسرەتم گووت ئەوە فلانەو ئاوا دەڵێت کاک کۆسرەتیش گـووتی

باشە تێگەیشتم وازی لێ بهێنن ، دواتر کابرا سەردانی کاک کۆسرەتی کردو لە سماقوڵی دیاریشی وەرگرت • رەبایەی بەرزایی پشتی دێگەڵەش بەلای رۆژئاوا دانرابوو بۆ کاک سفین مەلاقەرە وکاک لادێ و کاک کاروان وباقی تیپەکەی خۆمان بەسەر پەرشتی کاک سفین ،ئەوانیش بە سەر کەوتویی رەبایەکەی خۆیان گرت •

ـ تیپی ۹۳ی کۆیە بەسەر پەرشتی مامۆستا بەکر بە بەشداری بەشێك لە هەموو کەرتەکانی رەبایەکانی سەر جادەی داخڵ بونی دێگەڵە لە لای کۆیەوە بۆیان دانرابوو ئەوانیش بەسەر کەوتویی کارەکەیان ئە نجـــــام دا •

ـ تیپی ۸٦ی دەشتی هەولێر فەرماندەی تیپ شەهید رێباز ،کاک مەلا سلێمان جێگری فەرماندەی تیپ ، فەرماندەی کەرتەکان جەلال ئیلنجاغی ،عەلی پونگینە،لەتیفە سوور فەرماندەی کەرت ،خاڵە مامەند مەنتك ئەوانیش ناو مەکتەبەکەیان بۆ دانرابوو لەگەڵ رەبایەك و ناقیلەیەکی زرێ پۆش ، لەگرتنی ئەو مەکتەبە کاک حەسەن بانی مارانی فەرماندەی مەفرەزە بوو لەگەڵ هێرش بردن بۆ سەرناقیلەکە شەهید کرا ، تیپی ۸٦ لەو قۆڵە کارەکانی خۆیان بەسەرکەوتویی ئە نجامدا•

ـ تیپی ۸۷ ی قەرەچوخ بەفەرماندەیی مام غەفور ،جێگری فەرماندەی تیپ شەهید دەشتی موهەندیس ، فەرماندەی کەرتەکان ( کەریمە رەش ، عومەر ناسر ، هاشیم شەمـــامکی ،عوسمان جەمیل ،مەناف عەبدالوهاب ،نوری قادر دۆڵە بەکرە ،دکتۆر رەشید ،فاقە مەخموری ،مامۆستا ئەحمەد رابەری سیاسی تیپ ) ئەوانیش بارەگای زراعەکەیان بۆ دانرابوو بەسەر کەوتوویی کارەکانی خۆیان ئە نجامدا•

ـ تیپی ۸٥ ی بەرانەتی بەسەر پەرشتی کاک ئاسۆ ئەڵمانی بە بەژداری ئەم فەرماندەو پێشمەرگانە (کاک عوسمان بانی مارانی فەرماندەی کەرت ، کاک

بورهانی سەعید سۆفی فەرماندەی کەرت ، ئەکرەم یۆخسری فەرماندەی کەرت ،حاجی مەسیفی فەرماندەی کەرت، فوئادە ڕەش فەرماندەی کەرت ) ئەوانیش مەرکەزەکەیان لەگەڵ ناو شارۆچکەی دێگەڵە بۆ دانرا بوو ،حەسەن دێگەڵە لەم قۆڵە دەورێکی باشی هەبوو لەگەڵ هەموو خزمەکانی ، گرتنی مەرکەزەکە لەبەر چوونە ناو شارەکە کەمێك دواکەوت دواتر دەستی بەسەر داگیرا.

ـ تیپی ٩٠ ی باواجی بەسەر پەرشتی کاك جەنگی فەقێیانی و قاسم عبداللە فەرماندەی کەرت و حەمە ڕەشید فەرماندەی کەرت و ئازاد باوەقوبی فەرماندەی کەرت لەگەڵ فەرماندەی مەفرەزەکانیان ڕەبایەی سوچی جسری دێگەڵەیان بۆ داندرا بوو بەلای ڕۆژ ئاوادا، ئەوانیش بە سەرکەوتویی کارەکەیان ئە نجام دا.

ـ تیپی مەڵبەند کاك عەریف عەلی سەرتیپ بوو کاك مجید میرخان جێگری بوو کاك سەلاح حەوێز فەرماندەی کەرت بوو ،ئەوانیش لەسەر جادەی کۆیە-هەولێر داندران بەکەمین .

شایانی باسە ڕێکخراوەکانی کۆمەڵەو شۆڕشگێران بێ بەش نەبوون لەم ئەبەردیە بەسەرپەرشتی کاك شاخەوان و کاك شێخ محمد سەرگەڵویی .

ئەم ئەبەردیە بەخوێنی گەشی ئەم قارەمانانە تۆمار کرا ( شەهید ئیسۆ فیتەر فەرماندەی کەرت، شەهید حەسەن بانی مارانی فەرماندەی مەفرەزە، شەهید مام ڕەش پێشمەرگە ).

هەموو فەرماندەکان گەڕاینەوە بۆ سماقولی ماڵی بەڕێز کاك کۆسرەت چونکە دوای هەموو شەڕێك کۆبونەوەیەکمان دەکرد ،سەرکەوتن و چۆنیەتی شەڕەکان تاوتوێ دەکرا، کاك کۆسرەت لە ناو فەرماندەکان دەستی لەمل کردم و گووتی دێگەڵە ئەحمەد کوردە گرتی دووجار ئەمەی دووبارە کردەوە، برادەرانیش بەگشتی گووتیان باشە کاکە تێگەیشتین .

گرتنی شارۆچکەی تەق تەق لوت شکانێك بوو بۆ بەعس گرتنی شارۆچکەی دیگەلەش هەرەشەیەکی گەورە بوو بۆسەر پیاوانی بەعس لەهەولێر ،گرتنی ناحیەی هیران کلیلی ناوچەی خۆشناوەتی بوو بۆ هێزی پێشمەرگە ، ئەوانە هەموویان دەسکەوتی گەورە بوون ،دوژمن وەك مشك ئاوی لەکونەکەی کرابێ ئەوهای لێ هات ، بۆیە شەرێکی گەورەی لێ کەوتەوە بە پشتیوانی تانك و تۆپ وتەیارە و سەربازێکی زۆری فەیلەقی( ٥ ) هێرشی کردە سەر مەلبەندی ( ٣ ) لەسماقولی.

*بۆسەنانەوە*

ـ لە٢٥ /١ /١٩٨٧ کەرتەکەی من لەگەڵ کەرتەکەی ئازاد داربەسەری چووینە سەرجادەی کۆیە - هەولێر لەشیوی مەلاریە لەنزیك گوندی پیرمر کۆنترۆڵی جادەکەمان کرد بۆماوەی نیو سەعات بۆگرتنی پیاو خراپان ،لەلای کۆیەوە سەیارەکی بەرازیلی هات چوار جاشی تێدابوو یەك لەجاشەکان ویستی لێمان بداو بمان کوژێت بەلام پێشمەرگەکان ئاگایان لەوە نەبوو سەرقاڵی خەلکی تربوون، من تۆزێك لەدوورەوە وەستا بووم چاوم لەسەیارەکە بوو کەوا جاشەکان دەیان ویست تەقە لەئێمە بکەن، من میلی چەکەکەم هێنایەوە ورام کردە سەر سەیارەکە پێم گووتن خێراکەن ئەو چەکانە دانێن مەجالم پێنەدان کەواهیچ بکەن، هەرچواریانمان چەك کرد، یەك سەیارەی بەرازیلی دەست کەوت بوو لەگەڵ چوار کلاشینکۆف ،دوای بەرێ کردنی خەلکەکە جاشەکانمان رەوانی مەلبند کرد سەیارەکەم بۆخۆم گێراوە ، چەکەکانم دا بە کاك ئازادو گەراینەوە بۆ دەشتی هەولێر لەوچالاکیە هەموو سەلامەت بووین.

ــ لەزستانی ساڵی ( ١٩٨٧ ) بۆسەیەکمان دانایەوە لەنزیك گوندی گۆمەتاڵ لەسەر جادەی کۆیە ـ هەولێر بۆ پشکنینی سەیارەکانی خەت بۆ دەست گیرکردنی بەعسی و خۆ فرۆشەکـــــان ،دوای وەرگرتنی ناسنامە گومانیان لەگە نجێك کرد

لەناو سەیارەکی خەت بوو برادەران دایان بەزاند هێنایانە لام منیش گووتم :تۆجاشی گووتی :نەخێر گووتم :هەویەکەت گووتی :پێم نـــــــی یە ،دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆرهەرحاشای کرد کەجاش بێ منیش زللەیەکم لێ دا بایەکی گەورەی لێ بەربوو، یەکسەر گووتی:جاش وەرەقەم، وەرەقەکەشی لەناو سەیارەکە شاردبۆوە منیش هەرلەوێ ئیزنم دا گووتم :مادەم تۆ ئاوا ترسنۆک بی بەزللەیەك ئەوکارەساتەت کرد برۆ ئازادبە لەلای منەوە کێ دەکوژی بیکوژە، دوای ئەوە سەیارەیەکی تویتا کرۆنە هات برادەران ئەفەندیەکیان تێدا گرتبوو لەناوسەیارەکە گومانیان لێکردبوو پاش لێکۆڵینەوە گووتبووی من بورهانی مدیرنفوسم کاتی خۆی مدیرنفوسی کۆیە بووم بەلام ئێستا ئەندامی تەنفیزی و تەشریعیم وەخەلکی کوردستان من باش دەناسن بەتاییەتی کاك کۆسرەت ئینجا هێنایانە لای من بەلام من کاك بورهانم باش دەناسی یەکترمان ماچ کردو لەلای خۆمم دانا بەلام ئەو لەرژێم زۆردەترسا،کاك بورهان لەسنووری کۆیە زۆر خۆشەویستی خەلك بوو بۆ تەنفیزی و تەشریعی خۆی هەلبژاردبوو خەلکی وەك ئێمە دەنگی پێدابوو نەك بەعسی یەکان .بۆیە من لەسەر کەفالەتی خۆم کاك بورهانم ئازادکرد بۆئەوەی زۆر تاخیر نەبێ ورژێم زۆر عەزابی نەدات، دوایی زانیمەوە کەلێکۆڵینەوەیان لەگەڵ کرد بوو بەلام ئەو گووتبووی پێشمەرگەکان منیان نەناسیووە .دوای ئەویش لۆریەك ئاردمان گرت ومنیش لامدا بۆگوندەکانی بەستی شەرغە بەلام خەلکی کوردستان ئەوندە دڵ ساف وبەرەحمن لەگوندەکان کەس ئاردەکەی وەرنەدەگرت، هەرچەندە ئاردیش زۆر گران بوو منیش وەکو خەلکەکە بێ تەماح بووم تەنیا دەفەردە ئاردم لێ داگرت بۆئەوپیشمەرگانەی کەژن ومنداڵیان هەبوو،دواترئاردەکەو لۆریەکەمان ئیزندا بەئاردەوە لەبەرخاتری خاوەن لۆریەکە چونکە مەدەنی بوو،نەوەك بەیانی کۆپتەر لۆریەکە بسوتێنێت بۆماوەیەك دوای ئەم بۆسەدانا ئەوە من لەمەڵبەند

بانگ کرام ڕا پۆرتیان لەسەر نووسی بووم کەگوایە خەڵکی جاش و پیاو خراپم بەرداوە، چووم بۆلای کاک کۆسرەت وبرادەران لەمەڵبەند لێکۆڵینەوەم لەگەڵ کرا مەوزوعی کاک بورهانم بۆکاک کۆسرەت باس کرد کاک کۆسرەت گووتی کارێکی باشت کردوە کە بورهانت بەرداوە مەوزوعی باڵێ بەربوونەکەشم بۆ باس کرد بوویە پێکەنین، هاتینە سەر لۆریە ئاردەکە کاک کۆسرەت گووتی دەبووایە دەست بەسەرلۆریە ئاردەکە دابگری چونکە ئاردەکەی عەسکەری بوو تەنیا لۆریەکە مەدەنی بوویەلام کاک کۆسرەتیان باش تێ نەگەیاندبوو، ئەوەی ڕا پۆرتەکەی لەسەر نووسی بووم خێ و ترشی بۆ پێداکردبووم بۆئەوەی تاوان بارم بکات ، من لەسەر ئەو مەسەلەیە تورە بووم چومەوە بۆماڵی خۆمان ماڵمان لەگوندی شاخە پێسکە بوو ڕا پۆرتێکم بۆ کاک کۆسرەت نووسی بیکێسی وناربیجی وهەموو پێشمەرگەکانم کۆکردەوە هەمووم ڕەوانی لای بەرێز کاک کۆسرەت کرد لەڕا پۆرتەکەش نووسی بووم تاشۆڕشێکی ترخوا حافیزی تان لێدەکەم من لەماڵی خۆم ئێوەش بەسەلامەت ، کاک کۆسرەتیش بروسکەی بۆشەهید ڕێباز کردبوو چونکە دەیزانی من وشەهید ڕێباز زۆر برادەرین لەساڵی١٩٧٧ وە لەدەشتی هەولێر پێکەوە پێشمەرگە بووینە، شەهید ڕێباز بەزۆر بردمی بۆلای کاک کۆسرەت ،لەوێ کاک شەهید عبدالرەزاق وشەهید حەسەن کوێستانی لەوێ بوون، کوێستانی زۆری من خۆش دەویست هەموو جاران بانگی دەکردم ( دەبڵ کورد ) چۆنی ئەوانیش زۆر هەوڵیان لەگەڵدام گووتیان ناکرێ ونابێ تۆ دابنیشی ،ناخێر جارمن بیانووم گرت گووتم من چوار پێنج ساڵە فەرماندەی کەرتم چیتر توانام نەماوە هەرئەوکاتە فەرمانیان دەرکرد بووم بەجێگری فەرماندەی تیپ لەتیپی ٩١ ی سەفین کاک سەفین مەلاقەرە فەرماندەی تیپ بوو ٠

## سوتاندنی کۆمەڵێك گوند

ئێمە داوا کرابووین بۆ سەرکردایەتی ، من لەگەڵ کاك رێبازو هەندێك لە کەرتەکان چووین بۆ سەرکردایەتی صلاح شینە لە خواریێ مابوو سەرپەرشتی باقی هێزەکانی دەکرد ، جەماعەتی مالی( رائد کاکل ) کە فەوجی خەفیفەیان هەبوو لەگەڵ جەیشێکی زۆر هێرشی بناری قەرەچوغیان کرد نزیکەی ( ٧ تا ٨ ) گوندیان سوتاند ، خەڵکیان زۆر گرت و ئەوەی لەوێش بوو دەیان گرت بەلام بە پێچەوانەی هەموو شەڕەکان و جارەکانی تر خەڵکی ئەو گوندانەی هەڵوێستیان وەرگرت و هاتن بوون بە پێشمەرگە لە تیپی ( ٨٦ ) ی دەشتی هەولێر ، دوای ماوەیەك هەندێکیان نەقڵ بوون بۆ تیپی ( ٨٧ ) ی قەرەچوغ • صلاح شینە بروسکەی بۆ کاك رێباز کرد گووتی ئەگەر بێنەوە زۆر باشە چونکە هێزێك هاتووە بۆ ئەوەی بین بە پێشمەرگە ، گووتی وەکو تەیری ( بن زگ زەرد ) هەرچی کارکە قەیسی و شتی خەڵکی گوندەکان هەیە هەموویان خوارد و گوندەکان زۆر لێمان بێزارن و لەو رۆژەوە بەقسەی صلاح شینە ئەو برادەرانە ناویان لێنرا بن زگ زەرد ، دوایی زۆریان پێشمەرگەی باشیان لێ هەڵکەوت و هەندێکیان بوون بە مەسئول •

## *شەری گەورەی مەلبەندی ( ٣ ) لە سماقولی*

لەگەڵ گەشەکردنی هێزی پێشمەرگە ئێمەش جۆرو سیاسەتی شەڕکردنمان گۆڕی ناحیەو قەزاکانی دەوروبەری هەولێرمان کۆنترۆل دەکرد و دیل و دەست کەوتەکانمان دەبردو بەجێمان دەهێشت , رژێم بەگرتنی ناحیەی تەق تەق و دێگەڵەو هیران زۆر پەست ببوو، رژێم لە دوای گرتنی ئەم ناحیانە هێزێکی زۆری

کۆکردەوە لەدەربەندی گۆمەسپان,مەعەسکەری هیزۆپ, سەرمەیدانی شـەقلاوە ,
بە پاڵپشتی بیست کۆپتەر چوار تەیارەی پیلاتـۆز دەیـان دەبابـەو تـۆپی دوور
هاویژ لەڕۆژی ٤ /٩ /١٩٨٧ ڕژێمی بەعس بەهێزێکی زەبەلاح لەچەند لایەکـەوە
هێرشی کرد بۆ سەر مقەڕەکانی مەلبەندی ٣ و ڕێکخراوی کۆمەڵـەو لقـی شـۆڕش
گێڕان، زۆربەی تیپەکانیش لەو ناوچەیە مقەڕیان هەبوو تیپـی ٩١ لـەنازەنین
بوو، لەقۆڵی ئێمە تیپی ٩١ ی سەفین ,دوژمن لەسەر جادەی شـەقلاوە، هـیران،
گردی جاسوسان، کەپکی شیلانە، گەرۆتە، گردی گەورە و دارەبەن، تیپی ئێمـە
٩١ ی سەفین ئەو فەرماندانە بەشداربوون (کاك سەفین مـەلا قـەرە فەرمانـدەی
تیپ ، ئەحمەد کوردە جێگری فەرماندەی تیپ ,کاك بەکرە سور ڕابەری سیاسـی
تیپ بوو، شەهید کارزان شەقلاوەیی فەرماندەی کەرت ,کاك صـباح ناسـراوبە
(کاروان ) فەرماندەی کەرت ، شەهید ئەحمەد جەمیل فەرماندەی کـەرت ,کـاك
خالید حاجی بریندار بوو ,وەستا عەلی سەرپەرشتی کەرتەکەی دەکرد ، کـاك
لادێ شەقلاوەیی فەرماندەی کەرت ,کاك سامان گەرمیانیش لەجەبهەکە دوو سێ
ڕۆژ لامان بوو بەلاّم هێزی لەگەڵ نەبوو گەڕایەوە لای کاك کۆسـرەت ,مامۆسـتا
سەیفەدینیش لەخەلفی جەبهەکەی ئێمە تـۆپێکی ١٢٠ ملیمـی لابـوو دەورێکـی
زۆرباشی هـەبوو لەلێـدانی دوژمـن کـاك شۆڕشـی بـرای وخالیـد و کۆمـەڵێك
پێشمەرگەی باشی لەگەڵ دابوو،نەعمان مەلا قەرە،فاتیح مـەلا قـەرە) ,شـەڕ
لەهەموو لایەکەوە دەستی پێکرد نیو مانگی خایاند دوژمـن نـەیتوانی قۆپکـە
چیایەك لەهێزی پێشمەرگە داگیر بکـات کەرتـەکان هەرکـەس جێگـای خـۆی
بۆدانرا , من لەگەڵ کاك سەفین تۆزێك ڕێك نەبووین پێشتریش باسـم کـردووە
بەلاّم شەڕێکی دوورو درێـژو قارەمانانـەمان کـرد شـەڕەکان جەبهـەیی بـوو ,
چەندین جار هێرشی یەك لەدوای یەکی دوژمنمان تێـك دەشـکاند شـەوێك مـن
دەچوومە پێشەوە بۆلای فەرماندەی کەرتەکان و پێـشمەرگەکان، شـەوێکی تـر

کاك سەفین دەچوو لەهەشتەمین شەوی شەڕەکە کە سێ فەرماندەی کەرتمان لە پێشەوە بوون ئەو شەوە من دەچووم بۆلایان لە ڕێگا تووشی پێشمەرگەیەك بووم بەرەو لای ئێمە دەهاتەوە ناوی عارف بوو خەڵکی مەخمور بوو بە( عارفە شێت ) ناسرابوو گووتم ها عارف بۆ کوێ؟ گووتی کاك ئەحمەد کوردە فەرماندەی کەرتەکان دەڵێن شەڕمان بۆ ناکرێ هەموویان خۆیان حازر کردوە واچۆڵی دەکەن، چونکە ئێمە ماوەیەکی زۆربوو لەسەر ئەوشاخە بووین بێ ئەوەی کەس بەدلمان بکات لەڕاستی دا من ماوەیەکی کەم بوو چووبوومە ئەم تیپە شارەزایم لەسەر برادەران کەمتر بوو عارفم گێڕایەوەو چووینە لای برادەران بەفەرماندەی کەرتەکانم گووت بۆچی شەڕناکەن گووتیان هەموومان هیلاکین منیش گووتم ئەوەی پێشمەرگەی یەکێتی یە بابێتەلای من ئەوانەی لەگەڵ ئامر کەرتانن بابچێنەلای وان ئەم شەوە دابەش بووم لەگەڵیان لەسەنگەرەکانی پێشەوە نزیك سەعات چواری بەیانی قوات خاصەکانی عێراق هێواش هێواش لێمان نزیك دەبوونەوە، بەختی ئێمە ئەم شەوە مانگەشەو بوو دونیا ڕووناك بوو فەرماندەی کەرتەکانیش هاتنەوە لام و داوای لێ بوردنیان کرد گووتیان بەکاك سەفین مەڵێ گووتم باشە من پێی ناڵێم بەڵام چەند ڕۆژێك دواتر سەفین هەمووی زانیبۆوە وادیاربوو عارف بۆی گێڕابۆوە، هەموو شەوی مانگە شەوەکان دوژمن هجومی دەکرد ئەوشەوە هجومێکی یەکجار گەورەیان هێنا لوتکە شاخێك کەمێك لە پێشەوە تری سەنگەرەکان بوو خۆم لەوێ دانیشتم بەهەموو برادەرانم گووت کەس تەقەنەکات تاکو من تەقە دەکەم با دوژمن بێتە پێشەوە قوات خاصەکان زۆر بەهێواشی شۆڕبوونەوە دەبوایە دووبارە بۆمان سەرکەونەوە شوێنەکە ئەوها بوو گوێم لێ بوو بەجیهاز قسەی لەگەڵ ئامرەکەی دەکرد دەی گووت سەیدی ئێستا خەبەری سەرکەوتنت پێ ئەدەم، پاش کەمێکی تر دەیگووت چیایەکە چۆڵ کراوەو ڕایان کردووە ئەی دەزانی ئێمە گوێمان لەقسەکانی

ئەوانە ئەو لەقسەکان بۆوەو ئێمە دەست رێژمان لێ کـردن، مـاوەی دە دەقیقـە تەقەبەس هاشەی دەهات تەقەمان راگرت و ئەوان رەدیان زۆر کەم بوو چـونکە زۆریان کوژرابوون، ئەم شەوە تەنها لەجەبهەکەی ئێمە هجـووم هـەبوو چـونکە ئەگەر جەبهەکەی ئێمە بگیرابا پشتی کاک کۆسـرەت وبـرادەران دەگـیرا، بۆیـە دوژمن زۆر مەبەستی بوو لای ئێمە بگرێت لەهەموو جەبهەکان جیهازیان بۆ ئێمە دەکرد بەرێز کاک کۆسرەت خۆی بەجیهاز سەرپەرشتی هەموو جەبهەکانی دەکرد شەوێ تاکو بەیانی نەدەخەوت دیاربوو بانگی جیهازەکەی کاک سـامانی دەکـرد بەلام من جوابم دایەوەو گووتم بەلێ فەرموو کاک کۆسرەت من ئەحمەد کـوردەم کاک کۆسرەت جوابی دامەوەو گووتی ها پەنجاو پێنج وەزعتان چـۆنە؟ گـووتم ئێمە زۆر باشین لە پەنجاو پێنج گەرێ بەئەحمەد کـوردە بـانگم بکـە گـووتی زۆرباشە کوردەگیان چیتان کردووە ئەم شەو؟ گووتم بەرێز کاک کۆسرەت بۆ خۆم لە پێشەوەی جەبهەکەم لەگەڵ برادەران بەقەد دارو بەردو شاخەکانی سەر چـیا قوات خاصەمان کوشتووە ,لەهەموو لایەکەوە جیهـازم بـۆ دەکـرا نـەم دەزانـی جوابی کام برادەر بدەمەوە , شەرەکە گەورەبوو دەست کەوتمان یـەکجار زۆربـوو لەچەکی هەمە جۆر کەل و پەلی سەربازی، پێشمەرگەو فەرماندەکان وەرەیان سەد لەسەد بەرز بۆوە ،کـاک کۆسـرەتیش زۆر کـەیفی پێهـات وگـووتی کوردەگیـان چاوتـان ماچ دەکەم دوژمن زۆر شپرزەیە خۆراگرن منیش بـەم شـەوە بـۆ هـەموو جیهازەکان سوپاس نامەم ئاراستەکردن ،بۆبەیانی کەلوپەلەکانمان کۆکردەوە تەورداسێکمان هێنا دارەکانی پێش خۆمانمان هەموو بڕی لەشـوێنێکی تەسـکی ناو رەبیکە دارەکانمان رایەڵ کردو بەردەکانی رەبیەکەمان لەسەردارەکان دانا، دوو کونی مەتەرێزمان لێ هێشتەوە یەك کونی گەورەش بۆ هاتووچۆی خۆمـان( چوونە ژوورەوەو هاتنەدەر)، واجباتمان لەوشوێنە دەگرت باقی هێزەکـەشمان بەرووی لای خۆمان ئەشکەوتێکی لێ بوو لەوێ ئیسراحەتمان دەکرد دوژمن بەلای

ئێمەوە هەرهێرشێکی دەکرد دەشکا ,لەتۆڵەی ئەوە لەرێگای شەقڵاوە هیران بەجادەی قیر دوودەبابەی رەوان کرد بۆ ئەوەی لە پشتەوەرا بسورێنەوە لەهێزەکەی ئێمە بدەن، لەوکاتە هێزێکی تیپی کارۆخ هاتبوون بۆیارمەتی دانی ئێمە بەداخەوە هەر ئەو رۆژە سەرتیپەکەیان بەناوی حوسێن بندایزانی( لەشۆرشی ئەیلول باوکیشی هەرلەو شوێنە شەهیدببوو ) لەگەڵ پێشمەرگەیەك شەهید بوون کورەکەشی بریندارببوو هێزەکەشیان هەر لەگەڵ شەهیدەکان چوونە خوارەوە، من و کاك سەفین بەرۆژ لەخەلفی دەبووین ,کاك سەفین بەدوو سێ کەسی گووت کەبچن تەقە لەدەبابەکان بکەن بەلام دیاربوو حەزیان لێ نەبوو من گووتم قەیناکە کاك سەفین من بۆخۆم دەچم، دەستەکەی خۆم لەگەڵ خۆم بردو چوومە خوارەوە نزیك دەبابەکان بووینەوە لە پشت دەبابەکان بەریز جوندی دەرۆیشتن هێواش هێواش لێیان نزیك بووینەوە ئاربیجی یەکەمان لەلای پێشمەرگە یەك بوو بەناوی بەرزان مراد زۆری گوللە ئاربیجی لەدەبابەکان گرت سەری دەکرد یان کورتی دەکرد لێ ی نەدان ,بەلام ئێمە بەقەناس وبیکێسی پێنج جوندیمان لێ کوشتن دەبابەکانیش بەرەو لای گوندی پونگینەی نزیك شەقلاوە گەرانەوەو لەئێمە دورکەوتنەوە من عەدەد ئاربیجیکەم بریندار بوو بەناوی عەول، ئەگەر ئەومان لەگەڵ بووایە بەمسۆگەری دەبابەکمان دەشکاند، گەراینەوە لای کاك سەفین دوو شەو نەیهێشت من بچم بۆپێشەوەی جەبهەکە گووتی : بۆخۆم دەچم تۆ هیلاکی ئیسراحەت بکە نازایەتی کاك سەفین ئینکاری لەگەڵ ناکرێ بەلام لەئیش کردن تۆزێك رەقە تاکو ئەو پازدە رۆژە شەر کۆتایی هات لەلای ئێمە دوژمن نەیتوانی لوتکە شاخێك بگرێت

## قۆناغی دووەم وتیپی بەرانەتی

تیپی بەرانەتی بەم شێوەیە دابەش بوون لەشانی ئێمەوە بۆ پشتی ناودارۆکان و بیرۆکان تاکو قەدی تەلان تادەگاتە قەدی چیای سوسێ فەرماندەکانی تیپی بەرانەتی ئەمانەبوون( شەهید تەحسین کاوانی فەرماندەی تیپ ،ئاسۆ ئەڵمانی جێگری فەرماندەی تیپ ،بورهانی سەعید سۆفی فەرماندەی کەرت ،کاك عوسمان بانی مارانی فەرماندەی کەرت ،حاجی مەسیفی فەرماندەی کەرت ،ئەکرم یوخسری فەرماندەی کەرت ،فوئادە ڕەش فەرماندەی کەرت ،سەنگەر فەرماندەی کەرت، شێخ خالید ڕابەری سیاسی تیپ ) ،ئەوانیش ئەوچەند ڕۆژەی هێرش و پەلاماری دوژمنیان لەسەر بوو بەلام دوژمن نەیتوانی هەنگاوێك بێتە پێشەوە، جەبهەی سوسێ بۆسەر ڕێی سماقوڵی - ئیشکۆر بۆتیپی ٩٣ ی کۆیە لەگەڵ کاك شاخەوان کەبەرپرسی ڕێکخراوی کۆمەڵە بوو مقەڕەکەشی هەر لەسوسێ بوو بەوان سپێردرابوو فەرماندەی تیپ مامۆستا بەکر، ڕابەری سیاسی دکتۆر ئازاد ،فەرماندەی کەرتەکان فەخرەدین ( ناسراو بە بەرخە )، جعفرحەمە دەروێش، فریاد قەسرۆکی، ئەوانیش وەك تیپی ٩٣ شەڕێکی قارەمانانەیان کرد، دوژمن نەیتوانی لوتکە شاخێکیان لێ بگرێت ،تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر لەسەر ئیشکۆر تاکو بەرزایی چیای بەنەباوی کەچەندین کیلۆمەتر درێژایی شاخەکەیە، تیپی ٨٦ ی دەشتی هەولێر لەگەڵ تیپی ٨٧ی قەرەچوغ تاکو شۆڕ دەبیەوە گوندی کرۆژ بەم دوو تیپە سپێردرابوو،ئەوفەرماندانەی لەوتیپانە بەشداریان کرد ئەوانە بوون ( مام غەفور فەرماندەی تیپی قەرەچوغ ،مامۆستا ئەحمەد ڕابەری سیاسی ،شەهید دەشتی موهەندیس جێگری فەرماندەی تیپ ،فەرماندەی کەرتەکان: عومەر

ناسر ، هاشم شـەمامکی ، کەریمـەرەش ،دکتـۆر رەشـید ،نـوری قـادر ،فاقـە مەخموری ،عوسمان جەمیل ، فازیل خوارزی مام غەفور) ،تیپـی ۸٦ ی دەشـتی هەولێر (فەرماندەی تیپ شەهید رێیـــــاز ،جێگر تیپ شـەهید مەلاسـلێمان ،مامۆستا تەحسین.رابەری سیاسی ،فەرماندەی کەرتـەکان :شـەفیق چاوشـین ،جەلال ئیلنجاغی ،سـوارە بێستانە ،صـباح مـەنتك ،خاڵەمامەنـد مـەنتك ،شەهید عەلی پونگینە ،لەتیفە سور ،منـاف عبـدالوهاب،جێگر کەرتـەکان ؛رەئوف نێرەگینی ،ئەبوزێد،شێرۆ )ئەوسیل سیلە چیایە بەودوو تیپە قارەمانە سپێردرابوون قورسایی شەڕی سماقولی لەسەر قـۆپی قەسـریٚ بـوو کەدەکاتـە بـــەرزایی چیای بەنەباوی، شەهید دەشتی موهەند پـس لـەویٚ شـەهید بـوو کەهەژدە رۆژ بوو ژنی هێنابوو.

تیپی ۹۰ ی باواجی بە فەرماندەی کاك جەنگی فـەقێیانی ،تیپـی مەڵبەنـد بەفەرماندەی کاك مەجید میرخان لەگەڵ لقی شۆڕش گێڕان کـاك شـێخ محمـەد لەگەڵ هێزێکی حیزبی شوعی ئـەوانیش لە پـشتی گونـدی کـرۆژەوە تـا دۆڵـی ئەسحابـان بەوان سپێر درابوو ،رۆژی ئاخیری شەڕەکە دەستێکی کاریگـەریان لـە دووژمن وەشاند ،چەند سەیارەك وچەك و ئەسلەحەیان دەست کەوت بوو دوژمـن لەلای ئەوانیش ئەی توانی مەرامەکانی خۆی ئەنجام بدات تووشـی خەسـارەش بوو

تیپی (۹۹) بیتوێن بەسەر پەرشتی شەهید کاکە جوان گونـدی جەلیوچـیای ئاوە گردیان پیٚ سپێردرابوو، دوژمن لەلای ئەوان پێشڕەوی نـەکرد تـەنیا بـە تۆپ و تەیارە تۆپ باران دەکران.

مەفرەزەکانی بەرێز کاك کۆسرەت لەهەر کـویٚ یـەك پێویـست بـا یارمـەتی تیپەکانیان دەدا ، کـاك یاسـین شیواشـۆکی لـــــــــــە دەسـتەکەی کـاك کۆسرەت شەهید بوو ، بەگشتی ئەو پانزە رۆژە ئەو فەرمانـدەو پێـشمەرگانەی

مەڵبەندی (٣) بە سەر کەوتویی کارەکانی خۆیان ئەنجام داو دوژمنیش بە سەر شۆڕی گەڕایەوە مۆڵگەکانی خۆیان.

## شەهیدەکانی داستانی سماقوڵـــی

- حوسێن بندایزانی فەرماندەی تیپی کارۆخ
- شەهید دەشتی موهەندیس
- ئەوزاد یوسف کاوانی
- ڕەئوف نێرەگینی
- جەرگۆ پیرداود
- کاکە شوان
- یاسین شیواشۆکی

داوای لێبوردن لەو پێشمەرگە قارەمانانەو ئەو ماڵە شەهیدانە دەکەم کەناویانم لە یاد نەماوە ٠

هەزاران سڵاو لەگیانی پاکی ئەو پۆلە شەهیدەو گشت شەهیدانی ڕێگای ڕزگاری کوردو کوردستان ٠

## *لەڕۆژێکی زۆردژوار ،دژوار لەدایک بوو*

لەتیپی ٩١ ی سەفین کەنقڵ بووم بۆ تیپی ٩٣ ی کۆیە ماڵەکەشم لەگەڵ خۆم برد بۆ ڕۆژهەلاتی کۆیە گوندی کانی بی ،مامۆستا بەکر فەرماندەی تیپ بوو منیش هەربەجێگری فەرماندەی تیپی ٩٣ کۆیە نەقڵ بووم لەگەڵ دەستەکەی

خۆم لەمانگی ١١ ، بەڕێز مامۆستا بەکر لەگەڵ بەشێك لەتیپەکەمان بانگ کرابوو بۆ مەڵبەندی ٣ لەبەر ئەوەی هێزەکانی مەڵبەندیش چووبوونە سەرکردایەتی، بەشێکی تیپی ٩٣ کە پێك هاتبوو لەمانە ( من ودەستەکەی خۆم لەگەڵ ئەو کەرتانە، فریاد قەسرۆکی فەرماندەی کەرت ،کاك صادق فەرماندەی کەرت ) ئێمە لەسنورەکەی خۆمان مابووینەوە ڕۆژی ٢٢ /١١ /١٩٨٧ هێزێکی گەورەی تیپەکانی ٨٦ ی دەشتی هەولێر و ٨٧ ی قەرەچوغ لەدەشتی هەولێرەوە ئاگادار کرابوونەوە کە بچن بۆ سەرکردایەتی،مام غەفورو فاقە مەخموری و چەندان فەرماندەی تریان لەگەڵدابوو بەلای منداتێ پەڕبوون بەگوندی کانی بی، منیش ماڵەکەم لەوێ بوو لەگەڵ بارەگای تیپ و جیهازەکەشمان هەر لەوێ بوو. هێزەکە پەڕینەوە بۆ گۆپتە پە لەوێشەوە بۆ سەرکردایەتی،بەلام دوژمن لەکەلکە سماقەوە هێزەکەیان بینی بوو،بۆ ڕۆژی ٢٣ ی مانگ تۆپبارانی دەشتی کۆیەیان کرد بەتاییەتی گوندی کانی بی ئەوکاتە ماڵی کاك جەوهەرعمرعەلی گۆج لەناو گوندی کانی بی بوو لەولای ماڵی ئێمەوە، تۆپبارانەکە بەیانی زوو بوو خەڵکەکە ڕایان کردبووە مەلجأ وکونە تەیارە ماڵی کاك جەوهەر سفرەی نان خواردن لەحەوشیان بەجێ مابوو گوللە تۆپیك بەناوەندی سفرەکەیان کەوتبوو ئەوان تۆزێك زووتر سفرەکەیان بەجێ هێشتبوو،مامە قالەش ماڵی لەوێ بوو ئەوکاتە مامەقالە بەئیش وکار ڕۆیشتبوو،گوللە تۆپێك بەدیواری حەوشەیان کەوت بوو دیوارەکە ڕووخابوو منداڵەکانی لەحەوشە لەناو مەرجەنەکە بوون دیوارە ڕووخاوەکە کونی مەرجەنەکەی لێگرتبوون، من وخاڵە شەریف بەغار گەیشتینە لایان ودارو بەردەکەمان لادا ئەگەرنا هەمووی دەخنکان، دایکی دژوار حەملی بەدژوار هەبوو ماڵی کاك نادری براشی هەرلە نزیك ماڵی ئێمە بوو، لەوکاتە لەناو مەرجەنی ( کونە تەیارە ) دژوار لە دایك بوو،نەجاتی خێزانی کاك نادر زۆر یارمەتی داین

وبەهانامان هات، لەوڕۆژە تەنگە دژوار سێ خاڵی لەوێ پێشمەرگەبوون بەناوی مامەقالە ،نادر، حوسێن ،خاڵی گەورەی گووتی ئەو ڕۆژە زۆر دژوارە بۆیــە نــاو لەوکورە دەنێم (دژوار) من ودایکی ڕازی بووین بۆیە دەڵێم دژوار لــەڕۆژێکی دژوار لەدایك بوو،ئێستا دژوار کوڕێکی گە نجی ژیرو زیرەکە، تۆپێك لــەنزیك کــانی ژنان کەوتەوە کەنزیك بــوو لــەماڵی ئێمــە پیــاوێکی ئیفلــیج بــەناوی حــاجۆ کەبەتەنها دەژیا و زۆرحەزی لەنزیك کانی ژنــان بــوو نیگبەتــەی لەوکاتــەدا چــووبووە نزیــك کــانی ژنــان پارچــە تــۆپێکی بەرکــەوتبوو لــەوێ شــەهید بوو،ئێوارەی پێشتر کوڕێکی ئامۆزام بەناوی ئامــانج کە پێــشمەرگەبوو لەگــەڵم ئاوی گەرم کردبوو لەڕاهی خــودا حــاجۆی جــوان شوشــتبوو،خێزانەکەی مکیش قاتێ جلــی منــی بۆنــاردبوو ڕۆژانــە لــەماڵی ئێمــەوە خواردنیــان بــۆ حــاجۆ دەبرد( حــاجۆ خۆشەویــستی هەموو پێــشمەرگەکان بوو،قــسەی زۆرخــۆش بــوو بەداخەوە بەم پارچەی تۆپە شەهیدکرا ) ،بەژمار ژماردمــان ڕژێــم (١٩) تــۆپی لەناو گوند و دەوروبەری گوندی دا ،تۆپەکان تۆپی قــورس بــون هەرلەهــەمان کاتدا بەڕێز کاك کۆسرەت لەسەرکردایەتیەوە جیهــازی بــۆدەکردم دەیگــووت دەبێ بەزووترین کات بگەیتە سەرکردایەتی ،چەند پێشمەرگەشت بۆپەیدا دەبی لەگەڵ خۆت بیان هێنە

منیش زۆر سەرم هێناو برد ویژدانم قبوڵی نەدەکرد هاوسەرەکەم بەجێ بهێڵم بــەم وەزعــەوە لەبەرئــەوەی گوندەکــە چــۆلیان کردبــوو ٠ ناچــار چــوومەلای خێزانەکەم پێم گووت : بروسکەم بۆ کراوە بڕۆم بۆ ســەرکردایەتی بــەلام ئــەم جارەیان ناچم ئەگەر سزاش بدرێم ویژدانم قبوڵ ناکات بــەم شــێوەیە بــەجێت بهێڵم بەلام ئەو زۆر شێرانە وەلامی دامەوەو گووتی زۆر عەیبــە بــۆ تــۆ ئەگــەر نەچیولەبەرمنت نەبێتوقبوڵیش ناکەم ئەگەر نەچــیوخۆت کۆبکــەوەو بــەڕێ بکــەوە، دواتــــر خــــۆم و شەســــت پێــــشمەرگە کــــەهی دوو کــــەرت بــــوو

کۆبووینەوەورۆیشتین بەرەو سەرکردایەتی ، کەرتەکان کاک صادق کۆمەڵێک براو برازای خۆی لەگەڵ بوو، کاک فریاد قەسرۆکیش کۆمەڵێک پێشمەرگەی لەگەڵ دابوو ، لەگەڵ مەفرەزەیەکی بارەگای تیپ ، ( قاسم حمە گچکەل ) و دەستەکەی خۆشم بەرێکەوتین ( لە دوای من کە ناو دێ بەتەواوی چۆڵ دەبێ کاک ئازادی ڕابەر سیاسی و خێزانەکەی بەناوی مهاباد لە خانوێکی بچکۆلە بوون لەبارەگای تیپ و منداڵەکانی ئێمەش چووبوونە کە پرێکی نزیك ئەوان ) ، ئێمە نزیکەی ( ٣ ) مانگمان پێ چوو لەسەرکردایەتی ،خێزانەکەم لەگەڵ دایکم و حوسێنی برای لەو کە پرە دەمێننەوە ، زۆر لەمێژ نەبوو ئێمە نەقڵی دەشتی کۆیە ببووین زۆر شارەزا نەبوون لە دەشتی کۆیە ،ڕۆژێك کاك مەجید میرخان لەگەڵ محمود مراد بەوێ دادێن وخێزانەکەم کاك مەجیدی دەناسی بەرێکەوت خێزانەکەم دەچێتە پێشیان و بەکاك مجید دەڵێ کاکە مجید ئەحمەد زۆر لە مێژە رۆیشتووە بۆ سەرکردایەتی و دونیاش بەرەو ساردی دەڕوات و ئێمەش هەر لە ناو ئەو کە پرەین وەزعمان زۆر خراپە ، کاك مجیدیش کە چاوی پێ یان دەکەوێ زۆر نیگەران دەبێت وبەسەیارەکەی خۆی دەیان گوازێتەوە بۆ ماڵی کاك جەوهەری ناسکە لەگوندی قزلو ، سەوزەی خێزانی کاك جەوهەر ناسکە زۆر ڕێزیان لێ دەگرێ وخانووەکیان بۆ پەیدا دەکات ولەگوندی قزلو جێگیر دەبن و خۆیان هەندێك ماڵیان پێ دەبێت و مامۆستا بەکریش لە مەڵبەند دەگەڕێتەوە وئاگادارە کە من لە سەر کردایەتیم و دەچێتە سەردانیان و سۆبەیەك و بڕێك ئازوقەو کەلوپەلیان بۆ دەنێرێت، ئەوە بۆ خۆی چیرۆکێکی زۆر خۆشە بۆ مرۆڤ بۆیە مرۆڤ ناتوانێ هەمووی بەنوسین دەربڕێ.

ئێمەش لەسەر کردایەتی بارەگامان دانابوو لەگوندی ( سێکانیان ) واجبا تمان لەسەری هەلاج و دابان بوو کە ئێزن دراین و گەڕاینەوە ، گەڕامەوە بۆ ئەو گوندەی کە منداڵەکانم لێ بەجێ هێشتبوو کە گوندی کانی بی بوو تەنیا

دووسێ ماڵ هاتبوونەوە ناو دێ پرسیارم کرد گووتم ئەی ماڵەکەی من گووتیان وابزانین چووینە بۆ گوندی قزلو ، منیش لە گوندی قزلو کەسی وام نەدەناسی ، نێوان گوندی قزلو و کانی بی نزیکەی بیست دەقیقەیەك دەبێت ، بەڕێ کەوتم وگەیشتمە گوندی قزلو لام دا دوکانێك پیاوێکی تەمەن (٤٠) ساڵی دەبوو لەسەر دوکانەکە بوو تۆزێك لای دانیشتمو هەندێك پرسیارم لێ کرد کە ئەو گوندە ماڵی کێ ی لێ یەو ماڵی پێشمەرگەکان کێن ، ئەویش گووتی کاکە گیان من هیچ نازانم یەکەم جار هیچی پێ نەگووتم تا خۆم گووتم من ئەحمەد کوردەم کردی بەسوعبەتو گووتی مریشکێکم بۆ بکڕە ماڵەکەی خۆت نیشان دەدەم ، دواتر تعریفی بۆ کردمو گووتی ئەو ماڵەی لەسەر ئەو گردەن ئەوە ماڵی نێوەیە بەدەستیش ئاماژەی بۆ ماڵەکە کرد ،منیش ڕۆیشتم بۆ ئەوماڵەی کە کابرا ئاماژەی پێ کردبوو ، ماڵەکە دەرگایەکی گەورەی تەنەکەی هەبوو دایکم لە دیوی ژوورەوە دارێکی گەورەی بە دەرگاکەوە نابوو، لە دەرگام داو دایکم هێواش هێواش دەهات بۆ لای دەرگاو بەدەنگێکی بەرز گووتی کێ یە؟ منیش گووتم دایەگیان منم دیار بوو دایکم قوڕگی پڕ گریان بوو دەرگای لێ کردمەوەو باوەشی لێ دام وچووینە ژوورەوە منداڵەکانم هەموویان لە ژوورەوە بوون ، چاكوچۆنیم لەگەڵ نەجیبەی خێزانم کردو لە تەندروستیم پرسی ، پاوانو ئاریوسەردانیشم ماچ کرد کاکە دژواریش گەورە ببووگەمە خۆشە ببوو .من دەڵێم ئاخۆ هیچ مرۆڤ و زیندەوەرێك توانای ئەوەی هەیە بۆ ماوەی سێ مانگ کۆرپەساواکەی جێ بهێڵێو بڕوا بەرەوە مەرگ جگە لە بیروباوەڕی کوردایەتیو گیان بازی پێشمەرگە نەبێت

ئەو پێشمەرگانەی لە دەستەکەی خۆم بوون :

- شەهید ئامانج تاهر ( پێشمەرگەیەکی تابلێی ئازاو بروسك ئاسا بوو زۆربەی جارەکان کە هێرشمان بۆ سەر ڕەبی یەك دەکرد یەکەم جار بەئاربیجی

لێمان دەدا بەڵام ئەوەی سەیر بوو تۆزی ئاربیجی یەکە هەر دەما لە ناو ڕەبیەکە ئامانج دەگەیشتە ناو ڕەبیەکە ) .

ـ شەهید مەهدی بایز / شەهید گەیلان/ مام شەریف / مامە قالە / ڕزگار شاخە پێسکەیی/ نادر ئیمام / صباح شاخە پێسکەیی/ محمد سلێمان شاخە پێسکەیی / عەول/ حسێن ئیمام / بارزان مراد / هیدایەت حمد ئیلنجاغی.

شتێکی خۆش ( لە سێکانیان هەر دەپازدە ڕۆژ جارێك کۆبوونەوەم بەکەرتەکان دەکرد چونکە زۆر بێزار دەبوون ، زۆربەی هێزەکەی ئێمەش کۆمەڵە بوون ، منیش زۆر قسەم لە بارەی کۆمەڵەوە بۆ کەرتەکەی کاك صادق دەکرد بەڵام کاك صادق خۆی نوێژی دەکرد تاکو من دەڕۆیشتم یان لە پێش چاوی من بە پێشمەرگەکانی دەگووت ئەم قسانەی کاك ئەحمەد گشتی ڕاستن دواتر لە دوای من بە پێشمەرگەکانی دەگووتەوە هەرکەسێك بەقسەی بکات هەردوو چاوی دەردەهێنم ، بەڵام کاك صادق پیاوێکی زۆر ڕوح سوكو گوێ ڕایەڵ بوو

## *وەرگەڕانم لەسەیارە*

مامۆستا بەکر لەگەڵ هێزێکی تیپەکەمان ( ٩٣ ) داوا کرابوو بۆ بەرگریی کردن لەمەڵبەند لەبەر ئەوەی ئەنفالەکانی مەڵبەندی ( ١و٢ ) ڕوویدا بوو ئەگەری ئەوەش هەبوو هێرش بکرێتە سەر مەڵبەندی سێش. پاش ماوەیەك منیش بە هەمان شێوە بروسکەم بۆ کرا کە بڕۆم بۆلای مامۆستا بەکر وبرادەران. بەڵام لەنێوان گوندەکانی باغەزنێر و کونەگورگ سەیارەکەی من وەرگەڕاو من بریندار بووم بۆیە خەڵکی باغەزنێر سەیارەکەیان بەتراکتۆری خۆیان بۆ ڕاکێشام بۆیان هێنامە گوندی گۆمەشین ،نیازی کاکە ڕەش لەگەڵ گرتنی شاری تەق تەق ماڵی

لەگوندی گۆمەشین دانابوو هەندێك کەرستەی لـەحیمی هـەبوو لـەوێ سـەری سەیارە لاندکرۆزەکەی بۆ بڕیمەوە ،من ماوەیەك لە ماڵەوە بـووم تـاکو چـاك بوومەوە ، ئەنفالەکانیش هێواش هێواش لە ئێمە نزیك دەبوونـەوە .مامۆسـتا بەکر بروسکەیەکی بۆ کردم دەڵێت کوردەگیـان تـۆ لـەوێ بمێنـەوە هێزەکـانی خۆمان کۆبکەوە .کاك مجید میرخان بەرپرسی کۆمەڵایەتی بوو ، هێزەکا نمـان کۆکردەوەو بەلام پێشمەرگەیەك لای مامۆستا بەکر ڕای کردبوو، مامۆستا بـەکر بروسکەی بۆ کردم دەڵێت ئەو پێشمەرگەیە لای خۆت بەند بکە چونکە لای ئێمـە ڕای کردووە، منیش ژوورێکی بەتـاڵم هەبوو لای بارەگای دەستەکەی خۆم لـەدێی قزلو لەوێ بەندم کردبوو ،ئەو کاتە عەول لەگەڵ پێشمەرگەکان لەبارەگا بوو بەلام شەو بەزەییان پێدا دێتەوە کە گوایە پێشمەرگەی خۆمانە دەریان هێناوە بەبێ پرسی من لای خۆیان خەواندوویانە ،بـەری بـەیانی دەسـت دەگەیەنێتـە کلاشینکۆفی یەکێك لە پێشمەرگەکان و حەرەسـیان نـابێ ولـەو کاتـە عـەول بەئاگا دێ و ئەڵێت کوڕە چی ئەکەی ،بەلام ئەو زۆر بـێ ویژدانانـە تەقـە لـە بـرادەران دەکـات پێـشمەرگەیەك شـەهید دەکـات بـەناوی ( مهـدی بـایز شاخە پێسکەیی ،عەولیش بە سەختی بریندار دەکات ) مەفرەزەکـەی مـن ئـەو کاتە زۆربەیان لە پشوودا بوون لەوێ نەبوون منیش ماڵەکەم لەبارەگاکە نزیـك بوو لەماڵەوە دەرچووم و نەختێکم تەقەکرد بـەلام مـن کەسـم نـەبینی ئیـدی چەکدار لەگوندی زۆر بوو ،هێزی پـشتگیریمان هـەبوو، جمالی بـرای حمەسـور کانی کوردەیی ماڵی لەوێ بوو ، جەوهەری ناسکە مـاڵی لـەوێ بـوو ، زۆربـەی چەکدارەکانی ناو دێ هاتن بۆلای مـاڵی ئێمـە و بارەگاکـە. بـەلام عـەول زۆر بەسەختی بریندار بوو لەو کاتە دکتۆر هیمداد و دکتـۆر هاوتـا و دکتـۆر ئـازاد هەرسێکیان لەوێ بوون،دوایی ناردم دکتۆر هادیش هات لەبـەری گونـدی کـانی هە نجیر پیاوێکی زۆر بەتەجروبە بوو بەهەر چوار دکتۆر وایان کرد گیانی عەول

لە مردن رزگار بکەن ، بەلام من هەر چەك بەدەستێك دەهات رەوانم دەکرد بەدوای تاوان بارەکە، بەلام دکتۆرەکان یەکێکیان پێویست بوو یارمەتیان بدات تەنیا ئەو خوێنەی کە لەبەر عەول دەرۆیشت بیرێژێت و پاکی بکاتەوە چونکە توشی خوێن پرژان ببوو ( خوێن بەربوون ) ، تاکو بەری بەیانی من و خێزانەکەم لەگەڵ دکتۆرەکان ماینەوە شەهیدەکەشمان لابوو عەولیش هەر بەشەهید حساب بوو ، ئەو شەوە هیچ کەسێکمان تەنیا بۆ یەك خولەکیش نەحەساینەوە،ئەو کەسەی تاوانەکەی کرد بزر بوو،دواتر مەفرەزەیەکی سەرکردایەتی بەدوای دا دەگەڕان ، مەیتێکیش لە زێی تەق تەق ماسی گر لە زێ یەکە گرتبوویانەوە کە چەکێکی لە ملی بووە دەیان گووت گوایە ئەوە تاوانبارەکەیە خۆی بەزێ داداوە و ناو بردویەتی بەلام بۆ کەس روون نەبۆوە هەوە یان نا

## *جاش و فەوجی خەفیفە*

جاشەکان ئەوانەن کەلەسەرەتای دروست بوونی شۆرشی نوێی گەلەکەمان لەسالانی ١٩٧٦ /١٩٧٧ کەمەفاریزی خاسیان دروست کرد،رۆژانە لەگەڵ جەیش وجاش سواری کۆپتەر دەبوون راوی ئەو چەند پێشمەرگەیان دەکرد کە تازە لەشاخەکانی کوردستان پەیدا ببوون،ئەو جاشانە بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن ،لەدوای راپەرینی خەڵکی کوردستان هەندێکیان لەناو چوون و ئەوانی تریش بەر لێبووردنی بەرەی کوردستانی کەوتن،لەدوای هەشتاکان ئەوعێکی تر دروست بوون ئەوانیش ناویان فەوجی خەفیفە بوو ،ئەو فەوجانە دوولایەن بوون زۆربەی هەرە زۆری فەرماندەی فەوجەکان پەیوەندی باشیان لەگەڵ شۆرشی کوردستان هەبوو ،لەدووسێ لاوە ئێمە وەك هێزی پێشمەرگە ئیستیفادەمان دەکرد لە فەوجە خەفیفەکان ٠

ـ لەڕووی دەنگ و باسەوە ،زۆر جار ئاگاداریان دەکردینەوە کەوا ڕژێم تەحەشود دەکات بۆ فلان شوێن یان ناوچە بۆ ئەوەی هێزی پێشمەرگە وریا بێت و توشی گوند سوتان و شەهیدو زیان نەبێ •

ـ ئێمە ئیعتیمادی هەرە گەورەمان لەسەر قاچاغ چیەکانی کوردستان بوو بۆکڕینی چەك و تەقەمەنی جگە لەوەی کەخۆمان لەشەڕو بۆسەکان دەسکەوتمان دەبوو ،تەقەمەنیەکی زۆریشمان لەو فەوجانەوە وەردەگرت کە پەیوەندیان هەبوو لەگەڵ هێزی پێشمەرگە•

ـ ئێمە زۆربەی هەرە زۆری مقەڕی فەوجە خەفیفەکان یان ڕەبیەکانیانمان بەئاسانی دەست بەسەر دادەگرت ،ئەمەش دەبووە هۆی چاوشکانی بەعس و دەسکەوتێکی باش.

ـ لەڕاپەڕینەکەی ٩١ زۆربەیان دەوری باشیان هەبوو ولە ڕژێم هەڵگەڕانەوە • بۆیە دەتوانم بڵێم لایەنی باش و خراپیان هەبوو.

## باسێك لە زیرەکی کاك مەلا بەختیار

چەند ساڵێك بوو لەگەڵ کاك مەلا بەختیار یەکتریمان نەدیبوو ، ساڵی ١٩٨٨ من جێگر تیپی تیپی

( ٩٣ ) ی کۆیە بوومماڵم لەگوندی کانی بی بوو لەدەشتی کۆیە ، لە پاییزی ساڵی ١٩٨٨ ڕۆژێك کاك هاشیمی مام علی فەرماندەی دەستەی بەڕێز مام جەلال لەگەڵ ( ١٠ ) پێشمەرگەیەك پەیدا بوون پیاوێکیان لەگەڵ بوو سەروریشی هاتبوو، کەنزیك بوونەوە تەماشام کرد کاك مەلا بەختیار بوو هێنابوویان بۆ لای ئێمە تا ڕەوانەی لای بەڕێز کاك کۆسرەتی بکەین چونکە وەزعی سەرکردایەتی زۆر خراپ بوو ، بۆیە دەبووایە بەند کراو بگوازنەوە بۆلای

مەڵبەندی سێ لە سماقوڵی ، من و مامۆستا بەکر زۆر رێزمان لەکاك مەلا گرت ، ئێوارەیەك من لەگەڵ سەید حیکمەت ودەستەکەی خۆم بەرێ کەوتین بۆ ئەوەی کاك مەلا بەرین بۆ لای کاك کۆسرەت ، گەیشتینە گوندی هەواوان لەنزیك بناری هەیبەت سوڵتان ،بەلام مامۆستا بەکر نامەیەکی بە پەلەی بۆمن نووسیبوو بەمامە قالە رەوانی کردبوو کە دەڵێ " کوردە گیان بگەرێنەوە ئەمشەو مە پەرنەوە چونکە کەمینی دوژمن هەیە " منیش بەکاك بەختیارم گووت دەبێت بگەرێینەوە چونکە مامۆستا بەکر دەڵێ کەمین هەیەو بۆ تۆش خراپە ،یەکسەر کاك مەلا جوابی منی دایەوەوگووتی نەخێر کوردە گیان کەمین نی یە بەڵکو کاك کۆسرەتە بروسکەی بۆ مامۆستا بەکر کردووەو پێی گووتوە " ئەحمەد کوردەو مەلا بەختیار برادەرن ئەمشەو دەربازی دەکات " منیش گووتم جەنابت دووجار التباست کردووە ئەگەر دەیکەی بە سێ من ئامادەم یارمەتیت بدەم بەلام ئەو قبوڵی نەکرد جا نازانم ئەو لەمن دڵنیا نەبوو یان نەیدەویست ئەو کارە بکات، بەهەرحاڵ گووتم با بگەرێینەوە، بەڵێ ئێمە گەراینەوە مامۆستا بەکر هەمان قسەی بۆمن گێرایەوە کە مەلا بەختیار باسی کرد دواتر مامۆستا بەکر خۆی بردی بۆ مەڵبەندی سێ ، بۆیە دەڵێم مەلا بەختیار پیاوێکی زیرەکە.

## ***داستانی سەری رەش***

هێزی پێشمەرگە لە سنوری مەڵبەندی ٣ وەها بەهێز ببوو هێندەی نەمابوو وەك و ساڵی ( ١٩٧٥ ) صەدام و دارو دەستەکەی هانا بۆ وولاتانی دەورو بەر ببەن بۆ پیلانی نێودەوڵەتی لەدژی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان دا برێژێ ،دەرهێنانی بەعسی یەکان لەناو جەرگەی هەولێرو لێدانی پارێزگاو کوشتنی چەندین ئەفسەری فەیلەق و ئەفسەری طیار ،وای لێ هاتبوو کە دەیان گووت

ئەم شەو ناحیەك یان قەزایەك دەگرین پێشمەرگە دوو سەعات هەڵپەرکێ یـان دەکرد لەخۆشیان ،چونکە گرتنی ناحیەو قـەزاو مەعەسـکەر وزنجـیرە ڕەبیـەو دەبابەو زرێ پۆش وخستنەخوارەوەی کۆپتەر وەك ناوخواردنەوەی لێ هاتبوو بۆ هێزی لەبن نەهاتووی پێشمەرگەییەکێتی نیشتیمانی کوردسـتان، بەشـاهیدی هەموو خەڵکی کوردستان پیلانی ئەوشەڕە گەورانە زۆربەی لەسماقوڵی لـەماڵی هەڤاڵی تێکۆشەر کاك کۆسرەت دادەڕێژرا وە زۆربەی پیلانەکان خۆی دایدەڕێشت وەڕاستەوخۆش خۆی سەرپەرشتی دەکرد،بۆیە جـار لـەجار زیـاتر سـەرکەوتن وەدەست دەهات هەروەك هەمووجارەکانی تر لەرۆژی ١٩٨٨/١/٢٠ هێزەکـان وەك وهەموو جاران لەدۆڵی سماقوڵی وزیارەت ، لەوناوچـەیە کۆبووینـەوە وەلـەم چەند ڕۆژە چەند کۆبوونەوەیەك لەسەرگرتنی کۆشکی هاوینە هـەواری صـەدام لەسەری ڕەش نە نجام درا ـ ئێمە تیپی ٩٣ لەسماقوڵی گرتك بووین مـن لەگـەڵ چەند فەرماندەیەك ئەم چەند شەوە لەماڵی ڕەشیدی کوێخا ئەحمەد بووین کـە بەعائیلە لەهەموو شۆڕشەکان پیاوی تێکۆشەرو نان دەری هێزی پێشمەرگەبوون ،لە ٢٦/ ١٩٨٨/١ هێزەکان دابەش کران بەسەر چـەند قۆڵێـك ، قـۆڵی ئێمـە( تیپی ٩٠ ی باواجی بەسەرپەرشتی کاك جەنگی فـەقێیانی ) لەگـەڵ ( بەشـێکی تیپـی ٩٣کۆیـە بەسەرپەرشـتی ئەحمـەد کـوردە )، ئێمـە مدەرەعەیـەك و دوو ڕەبایەی جەیشی شەعبی و مقەڕ فەوجێکیمان بۆ دانرابـوو، فـەخرەدین لەگـەڵ جەعفەری حەمەدەروێش کەفەرماندەی کەرت بوون،مام سیامەند جێگری کـەرت بوو لەتیپی ٩٣ ئەم دوو کەرتە بۆسەر مقەڕ فەوجی جاشەکان دانرابوون،بـەلاَم ئێمە شارەزا نەبووین لەتەنیشتی ئەوانەوە ڕەبیەکی تری سەربازی لێ بوو ئـەم ڕەبیە حسابی بۆ نەکرابوو،ئەم ڕەبیە تەقەی لە فەخرەدین و مـام سـیامەند و برادەران کردبوو ٢ پێشمەرگەی ئێمەیان شەهید کرد ، یەکی تریان بە سـەختی بریندار کرد، شەهیدەکان ( فەخرەدین.فەرماندەی کەرت،نەعمان حاجی قـەلا

فەرماندەی مەفرەزە،هێرش مام سوارە شەوگێری . پێشمەرگە هێرش بەبریندارى شەهیدبوو )، پێشمەرگەیەکى ترمان بەناوی سۆران ئیسماعیل ئەویش لەناو بەفر شەهید بوو ناقیلەکە لەگەڵ رەبیەی جەیشی شەعبیەکانیش بۆ من وکاك جەنگی ،لەماوەی ( ٥ ) خولەك مدمرەعەو جوندی یەکانمان بەساغی گرت • لەکاتی گرتنی ئەو خانوە سیاحیانە زۆربەی ئاگریان تێبەر بوو لەهەموو سەری رەش وەك و باران گولله دەباری چونکە ئێمە هیچمان شوێن ورەبایەکانمان بەچاوی خۆمان نەبینی بوو هەموی لەسەر نەخشەو بەقەڵەم پێمان نیشاندرا بوو، لەم کاتانەشدا ئێمەش مەژغولیەتێکمان بۆ دروست بوو چونکە هەندێك رەبیەو خانوی سیاحی کە جەیش و جاشی تێدابوو کەلەبنەرەتدا حسابیان بۆنەکرابوو بۆلێدانیان ئێمە ناچاربووین لەگەڵ کاك جەنگی هەندێکمان پێشمەرگە لەلای دیلەکان وناقیلەکەبەجێ هێشت بۆ خۆمان ناچار روومان کردە ئەم شوێنانەی کەنەگیرابوون بووە هۆی بریندار بوونی من وپێشمەرگەیەك بەناوی مەهدی بایزشاخە پێسکەیی هەر لەدەستەکەی خۆم بوو ،دوای شەرێکی کەم ئەوانیشمان پاککردەوە بەلام دەسکەوتەکان لای ئێمە هێندە زۆر بوون نەماندەزانی چۆن بیان گوازینەوە من سێ شەهیدم هەبوو ، بەگشتی شەهید کەم بوو بەنیسبەت گرتنی قەسری صەدام ، ئێمە لەگەڵ کاك جەنگی دوو وولاغی ئێسترمان لەگەڵ خۆمان بردبوو دوو وولاغی فەوجەکەشمان دەسکەوت بوو بوو بەچوار وولاغ، وولاغی فەوجەکە کاك جەنگی گووتی بابۆ ئێوەبێ چونکە ئێوە شەهیدتان هەیەو پێیان بگوازنەوە ئێمەوەك باسم کرد دەسکەوتێکی یەکجار زۆر لەبەردەستمان بوو شەهید وبریندارەکانمان لەدوو وولاغ بارکردولەگەڵ هەندێك کەلوپەل ،بارێکیشمان ئاربیجی وکلانشکۆف رێکخستن ، ئێمە سەعات پێنج ونیوی بەیانی خۆمان ئامادەکرد کەبێینە خوارێ هەر بەو شوێنەی کەبەسەر کەوتبووین چووینەوە لای گوندی هەنارەو بەسەرکەوتینەوە بۆ

ناوچەی سارتکەو قۆلی قیرژە، ئەوەی جێگای ووتنە ئەو شەوە بەفرو زریانێکی زۆر هەبوو هەم لەچوونمان بۆ ئەم داستانە هەم لەگەڕانەوەمان ئەزیەت و عەزابێکی زۆرمان دی کەلەسەر کاغەز دەرنابڕدرێ ،بەلام بەداخەوە دوژمن ئەوەندەی زیان لێنەداین ئەوەندەی بەفر زیانی لێداین،زیاتر لەحەوت پێشمەرگەی قارەمانمان لەناو بەفر رەق بوونەوە، پێشمەرگەیەکی گەنج بەناوی سیروان بەجێ مابوو کەناسراو بوو بەسیروانە شێت کەلەتیپەکەی ئێمە نەبوو،بەلام هەندەی نەمابوو ئەویش بەبەفر شەهید بێ دەست و پەنجەی رەق ببوو من بەگەیلان ورزگارم گووت کەلەدەستەی خۆم بوون بەجێ ی مەهێلن وبیهێنن ، ئەوانیش هێنایان لەگەڵ خۆمان ومنێستا خۆش بەختانە فەرماندەیەکی چالاکی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە

قۆلی تیپی ۸۷ و ۹۳ ی کۆیە

بەڕێز مام غەفور لەگەڵ بەشێکی تیپەکەی لەگەڵ بەشێکی تیپی۹۳ ی کۆیە،بەشەکەی تیپی۹۳ ی کۆیە فەرماندەی کەرت شەهید فریاد قەسرۆکیان لەگەڵ بوو،جادەی نێوان مەسیف و سەری ڕەشیان بۆ دانرا وەك کەمین لەگەڵ چەند ڕەبیەك ئەوانیش لەقافلەیەکی سەربازیان داو دەستیان بەسەر ڕەبیەکان داگرت و بەدەستکەوتێکی زۆر بەسەلامەتی گەڕانەوە شوێنی پێشوی خۆیان

مهمەی گرتنی قەسرەکەی صەدام

پیاوێك هەبوو بە ناوی ئەیوب سەربەڕێکخستنەکانی کۆمەڵەبوو ڕاستەو خۆ سەر بەکاك کۆسرەت بوو، ئەو پیاوە خۆی لەناو ڕژێم بوو دەستێکی بالای هەبوو لەگرتنی سەری ڕەش خەلکی ناوچەی مەصیف بوو، من ئەوکاتە ئەو پیاوەم زۆربەچاکی نەدەناسی بەلام شەوی پێشتر هێندێك کەسوکاری لەڕەبیەی

جاشەکان هەبوو کۆمەڵێك پێشمەرگەی ئێمەی بردبووە ناو ڕەبیەکە لـە شـوێنی جاشەکانی خزمی ،بۆ یە دەڵـێم هـەموو جاشـێك جـاش نـەبوو ،ئـەو شـەوەی کەدەستمان بەگرتنی قەسرەکەی صەدام کرد ئـەو پێـشمەرگانە وەك چاوسـاغ بوونە دەلیل بۆ شەهید مەلا سلێمان وجەلال و شەفیق چاوشین کەئەوان لایەکی دیواری خانوەکەیان بۆ دانرابوو،لایەکەی تر بۆ کاك سەفین مەلاقەرە و مەولود مام قلینجی جێگری بوو لەگەڵ بەشێکی تیپی ٨٥ ی بەڕانـەتی بەسەرپەرشـتی کاك سەفین دانرابوو لەگەڵ مەشجەب وگازینۆکان .مقەڕسریەك و چەند خانوێك بۆ کاك حاجی مەسیفی و ئەکرەم یۆخسری دانرابوو.

تیپی ٨٥ ی بەڕانەتی لەگەڵ کەرتێکی ٩٣ ی کۆیە بە فەرماندەی کاك صـادق بەسەرپەرشتی شەهید تەحسین کاوانی ئەویش سەیتەرەی داخیل بوونی قەسری صەدامیان بۆدانرابوو ،٥٠ پێشمەرگە ئەوانیش دانرابوون بـۆ مجموعـە خـانوی مێوا نخانەی کۆشکی صەدام، بەشێکی بەڕانەتی بەسەرپەرشتی ئاسۆ ئەڵمانی کە جێگربوو ئەویش چەند ڕەبیەو مقەڕسریەکی بـۆ دانرابـوو ،کـاك ڕێبـازو کـاك عبدالله تۆفیق و کاك شاخەوان ومامۆستا چەتۆ و مامۆستا بەکرو کاك کۆسرەت ئەوانیش نزیکەی ٧٠ پێشمەرگەیان لەگەڵ بوو دووخانویان بۆ دانرابوو لەگـەڵ یەك مقەڕسریە کەشوێنی حەرەسیاتی ڕۆژهـەلاتی خـانوی صـەدام بـوو ،بـەم شێوەیە بەگشتی هەموو ئەو تیپ وکەرت و پێشمەرگە قارەمانانە شوێنەکانی کە بۆیان دانرابوو بەسەرکەوتویی پاك کردەوە،لەبەرەبەیاندا بەڕێز کاك کۆسرەت بڕیاریـدا بەکـشانەوەی هێـزی پێـشمەرگە لـەناو شارۆچـکەی سـەری ڕەش وگەڕانەوەمان بۆ سماقولی ،ئەوەی هەرگیز لـەیادم ناچـێ لـە گونـدی قـیرژە تادەگاتە گوندی سارتکەو حاجی ئەحمـەد پێـشمەرگەکان زۆربـەیان پـەکیان کەوتبوو فەرماندەکانیش زۆربەیان لەوێ نـەمابوون بـەلام مـن بەچـاوی خـۆم بینیم کەزیاتر لە ٧ پێشمەرگە لەناو بەفر گیانیان لەدەست دابوو، چوومە سـەر

دووانیان بەڵام بەداخەوە من خۆم لەگەڵ کەرتەکەی کاک جەعفەر سێ شەهیدو برینداریکی شرمان پیبوو من خۆشم بریندار بووم هەرچۆنیک بی هیرشمان بەبرینداری گەیاندە نەخۆشخانەی سماقولی کە د.زریان ود.حوسین تالەبانی وچەند دکتۆریکی تر زۆر بەجدی کاریان دەکرد بۆئەوەی نەهیلن بریندارەکان شەهید بن، ئیمە قادر شەوگیریمان لەلای کاک هیرش دانابوو لەنەخۆشخانە دواتر پاش چەند رۆژیک ئەویش گیانی بەخاک وگەلەکەی سپارد هەزاران سلاو لەگیانی پاکی ئەم شەهیدانەو گشت شەهیدانی ریگای رزگاری کوردوکوردستان، دەست خۆشیش بۆدکتۆر زریان ودکتۆر حوسین تالەبانی وگشت ئەو دکتۆرانەی کەلەبەرەکانی جەنگ بەدانیم لەگەڵ هیزی پیشمەرگەدابوون

ناوی ئەو فەرماندەو پیشمەرگە قارەمانانەی لەم ئەبەردیە بەژداربوون ئەوەی لەیادم ماوە وە داوای زۆر لی بووردن دەکەم لەوەی ناویم لەیاد نەماوە ،

| بەڕێز کاک کۆسرەت | شێخ محمد | شاخەوان عباس | سەفین مەلا قەرە |
|---|---|---|---|
| خالە عومەرو عزیزی برای | عبداللە تۆفیق | بەکرە سور | خەسرۆ شێرە |
| مامۆستا چەتۆ | تەحسین کاوانی | مام غەفور | شەهید ڕێباز |
| مامۆستا بەکر | ئاسۆ ئەلمانی | ئەحمەد کوردە | جەنگی فەقێیانی |
| فاڕوق عەلی مەولود | مەولود مام قلینجی | مەلا سلێمان | قارەمان شینە |
| عوسمان | بورهان سەعید سۆفی | حاجی مەسیفی | ئەکرەم یۆخسری |

| بانی مارانی | | | |
|---|---|---|---|
| ئەحمەد جەمیل | خالید حاجی | کاروان (صەباح) | ئازاد ڕابەر سیاسی |
| ئەحسین ڕابەر سیاسی | مەجید مخۆرسی | ئەحمەدە | جەلال ئیلنجاخی |
| لادێ شەقلاوەیی | مامۆستا سەیفەدین | فەخردین (بەرخە) | مام سیامەند تیمارۆکی |
| سەفین عومەر | جەعفەر حەمە دەروێش | فریادقەسرۆکی | گوروك قەیسەری |
| تالیب مخۆرسی | صادق محمەد | مەجید میرخان | صەلاحی مام حەوێز |
| فاقە مەخموری | هاشم شەمامکی | هاشم جیهاز | یوسف بەحرکەیی |
| قورشید گەڕاوی | سوارە بێستانە | کارزان شەقلاوەیی | سەعید مەسیفی |
| شەهید کارزان شەقلاوەیی | کەریمە ڕەش | لەتیفە سور | مامۆستا یاسین |
| نوری قادر | دکتۆر ڕەشید | عومەر عەوێنە | عومەر ناسر |
| میکائیل شیواشۆکی | عبداللە ئاسراغا | ئەعمان حاجی قەلایی | سمایل وەرتی |
| ئامیق سمایل وەرتی | هێرش مام سوارە | شێروان حوسێن تەقتەقی | شەفیق چاوشین |

| | | | |
|---|---|---|---|
| فازیل خوارزای مام غفور | موحسین حەمشین | مامۆستا خالید | عەلی پونگینە |
| ئازاد مام غەفور | فەرەیدون مام غەفور | هێمن مام غەفور | ئامیق مام غەفور |
| جەمال مام غەفور | دلشاد مام غەفور | شێرۆ مام غەفور | شەهید وشیار |
| فەتح اللە داربەسەری | نصراللە ئیلنجاغی | کاوەنەنومر( هاو ڕێ کاوە ) | خارە جاسم |
| بابەشێخ | جاسم دەربەندی | ئەحمەدسماقە | حمید سماقە |
| مامە قالە | بارزان مراد | عەول | مام شەریف |
| نادرئیمام | ئامانج تاهیر | حسین ئیمام | گەیلان صابر |
| ڕزگار مامە | شکراللە حمەدمین | محمەد سلێمان | مەهدی بایز |
| صباح حمەمەردان | هیدایەت ئیلنجاغی | عومەر ئیلنجاغی | ڕەسول ئیلنجاغی |
| شێرۆ سایەق | پشتیوان بانی مارانی | فەتح اللەبانی مارانی | صباح ڕەحمان |
| فەتاح ڕەحمان | ڕەفیق چاوشین | شێرزاد صالح | محمود مراد( خولە ) |
| بێستون کەریم کەویاز | خەلیل حەمداین | جەمیل حمداین | مۆفەق رمزا |
| شەعبان کێلە | صالح محمەد | قاسمە سور | نیاز مەحمود |

| خوارە | | | |
|---|---|---|---|
| دەستەکەی بەڕێز کاک کۆسرەت | ڕەشیدلەتیپی٩٠باوەج ی | میقداد ونکە | ئەحمەد عبدالوهاب |
| محمەد عبدالوهاب | غەفور ئیلنجاخی | ڕائید جەلال | شەهید عبدالرمزاق |
| قاسم بانی مارانی | سابیر هەژار | مام ئارازی دکتۆر ڕەشید | عومەر ژێرسە |
| فارس ( هێرش ) | شۆڕش کاکە | مام عەلی ( شۆڕشگێران ) | یدالله گۆمەشینی |
| حەکیم گۆمەشینی | ئەسوەدی کۆرومزیر | وشیار حاجی قەلایی | جەوهەر ناسکە |
| شێرکۆی مام صالح | مام هەژار | دلێرکانی لەلە | شێرزاد کاوانی |
| یاسن کاوانی | عبداللەچاوشین کاوانی | ستار حمە شەریف | قاسم حمە گچکەل |
| خالید شاخە پیسکە یی | حەمید شاخە پیسکەیی | فەلاح شاخە پیسکەیی | عوزێرشاخە پیسکەیی |
| ئەمیر بایزاغەیی | حەوێز شاخە پیسکەیی | محێدین شاخە پیسکەیی | زراربایزاغەیی |
| ئەبەز فارس | شەهید مامەند مەنتك | صەباح عەلی مەولود | صەباح مەنتك |

| | | | |
|---|---|---|---|
| شێخ خالید هیرانی | هەمزە کانی سلێمانەیی | ئاسۆ مەجید | سیروانە شێت |
| محمەد بەحرکە | ئیسماعیل چەڵتوکی | فەقێ سەلام | سەید حیکمەت |
| عبداللە خەرابەیی | حەتەم تیمارۆکی | شەهید جەنگی داوداوەیی | حەیدەر تیمارۆکی |
| جەمال بۆگدی | سۆران حەسۆ | ئازادچاوشین کۆیی | صەباح بەکر مەلا |
| بادینان حەسۆ | ئەردەلان حەسۆ | حەمیدی قالەدزەیی | کەیوان گۆمەشینی |
| شەهید فاروق جەبار | ئەمجەتە شەل | عوبێد میرزا (دلێر) | جەوادە شێت |
| شێخ جەواد | عوسمان جەمیل | دکتۆر مەزن | دکتۆر ڕەفعەت |
| دکتۆر هیمداد | دکتۆر زریان | دکتۆر ئەبەز | دکتۆر هونەر |
| دکتۆر هاوتا | دکتۆر ئامانج | دکتۆر حسێن تاڵەبانی | دکتۆر جەرجیس |
| دکتۆر کاوە | سالاری معاون طبی | حاجی حەوێز پێبازۆکی | حەتەم پەلکانە |
| فارس برای شەهید فاقە | سەلام قادر | سۆران ئیسماعیل | ئاراز غەریب |
| کامەران صاڵح | محمەدی برای ئازاد چاوشین | مامۆستا تاهیر کەرتی ڕێکخستن | خلیل خالید |
| موحسین برای | | مامۆستا | ئەیوب دەستەی |

| ئەحسین کادیری کۆمەڵە | مستەفالالە حەمەمەرزانی | ئەحمەد (ڕابەر سیاسی) | بەڕێز کاک کۆسرەت |
|---|---|---|---|
| عەول کەرتی ڕێکخستن | ئازاد چاوشین باوەقوبی | حوسێن بانە قەڵاتی | کەمال سورە قەڵایی |
| شەریف شێخ مەمووندی (ئاری) | عومەر ڕیشە | واحید میرزا (ڕەمز) | سەفین نافیع اغا |
| بورهان شەوگێڕی | خولەی برای شەهید عبدالرزاق | دلێرکانی ڕەشی | لەتیف شورتە |
| کازم پێبازۆکی | کەمال کوێخا صاڵح | عبید ناسراغەیی | خەلیل چاوڕەش |
| مۆفەقی حاجی ڕەفیق | قادر شەوگێڕی | بەهمەن عەلی نەجار | خەلیل عبید |
| ئەسوەدی حاجی مەلا | سەیفەدین صابیر | ئازاد صاڵح | دلزار تۆفیق |
| محمەد کوێخا صاڵح | کامەران ئەحمەد | مەلا صاڵح | ئامانج قادر |
| سەعدی محمەد هەولێری | پێشەوا عەلی مەولود | عەدنانە سور | حەسەنە خوار |
| خاڵە سێوە( صەباح | خالید قادر | ڕەفیقی حاجی مەلا | فەتاح باغەجنێری |

| ) | | | |
|---|---|---|---|
| ئـازاد عـەلی حەمشین | ئەوزاد مستەفا | وشیار زاهیر | صالح قۆڕپیتانی |
| ســـەرهەد كانی ڕەشی | فوئاد قادر | فوئادە ڕەش | شێخ فەتاح |
| جـــەمال عەودارانی | گۆران بەكرە جۆیی | خەسرەو صاڵح | مامۆستا محمد |
| سەفین خەڵكی گوندی مەلاعومەر | | كەیوان صاڵح | هاوڕێ عوسمان |
| عومــەر بـــالا بەرز | سیروان تۆفیق | ئەكرەم صاڵح | ئەزمیر گەرمكی |
| مامۆســـــتا عومەر | جبار خالید | ســابیری پــورە تەمە | كاكە سور |
| عومەرپیرداودی سایەقی مامۆستا بەكر | | | |

## *لێدانی ڕەبیەكانی گردی چادر*

پاشی گەڕانەوەمان لەشەڕەكەی سەری ڕەش چـەند ڕۆژێـك ماینــەوە لــە دۆڵــی سماقوڵی ، كاك كۆسرەت بانگی من وكاك جەنگی فەقێیانی كرد گـووتی ئێـوە هەریەكێتان بەشێكی تیپەكەتان لەگەڵ خۆتان ببەن و ئەبێت ئەو دوو ڕەبیەی سەرگردی چادربگرن چونكە جیهازی مەجەزی كۆپتەری تێدایە ).( مەجەز مانای ئەوەیە قسەلەگەڵ كۆپتەر دەكات ) گووتیشی خۆم هێزەكانی قەرەچوغ ودەشتی هەولێریش لەگەڵ خۆم دەبەم بۆگرتنی ئەو زنجیرە ڕەبیەی سەر ڕێگـای كۆیـە هەولێر، لەناویاندا ڕەبیەیەك هەبوو لەسەر گردی گورزەیی ئەویش بەهـەمان

شێوە جیهازی مەجەزی تێدابوو وەهیچ جارێکیش ئەورەبیانە لەلایەن هێزی پێشمەرگە نەگیرابوون، ئێمە تازە لەسەری رەش گەرابووینەوە منیش بریندارببووم هێشتا تەواو چاك نەببووم، بەرێز کاك کۆسرەت ئەو ئەمرەی کرد هەرچەندە من وکاك جەنگی دمانزانی ئەورەبیانە ناگیرێن چونکە شوێنەکەیان زۆرعاسێ بوو بەلام وەك وعاداتی پێشمەرگایەتی خۆمان ناچاربووین بەبەلێ وەلام بدەینەوە، کاك کۆسرەت بەمن وبەکاك جەنگی گووت ئەگەر ئەو رەبیانەتان نەگرت نێنەوە بۆلام ،واتا دەبێ هەربگیرێ شەو سەعات یەك بوو لەگەڵ کاك جەنگی چووین بۆ باواجی ئاودیو بووین بەرەو شوێنی مەبەست، من دەستەکەی خۆم لەگەڵ کەرتەکەی شەهید فریاد قەسرۆکی کە پیاوێکی زۆر قارەمان وکوڵنەدەر بوو، کەرتەکەی کاك جەعفەر حمەدەروێش ئەوا نمان دانا بۆ کەمین لەجادەی کۆیە ،لەتیپەکەی کاك جەنگی کەمینێکمان لای جادەی هەولێر دانا ئینجا بەم شێوەیە دابەش بووین ،بۆ دەستەی هجووم فریاد قەسرۆکی لەگەڵ مەفرەزەیەکی کاك جەنگی کە خۆی سەرپەرشتی دەکردن ئەویش مەفرەزەکی لەگەڵ بوو بۆ حالەتی پێویست، من لەگەڵ دەستەکەی خۆم و چەندپێشمەرگەیەك لەکەرتەکەی کاك فریاد لەلوتکەی گردی چادر لە پشتی رەبیەکان بەبیکێسی وئاربیجی لەهەردوو رەبیەکان بدەین ،سەعات یەکی شەو زۆر بەرێك و پێکی چووینە نزیك رەبی یەکان ودوو سەگی رەشیان هەبوو ماوەیەك ئێمەیان تأخیر کرد جاشەکانیش بەخەبەر هاتن، بەلام ئێمە خۆمان تأخیر کرد تاکو سەگەکان بێدەنگ بوون، لەسەعات یەك وچارەگی شەو پێشمەرگەونەستێرە تەماشای یەکتریان دەکرد ، دەستڕێژمان لەرەبیەکان کرد بەبیکێسی وئاربیجی دەستەکانی هجوومیش لەساتری رەبیکە نزیك ببوونەوە بەلام وادیاربوو جوندی و جاشەکان هەموویان بائاگا هاتبوون وخۆیان لەبۆسە نابوو کەدەستمان بەشەڕکرد ئەوانیش رەدێکی وەك ئێمەیان

هەبوو، بەڵام ئێمە پێشمەرگەکانمان زۆر ئازابوون نەگەڕانەوە تاکو نێوقەدی ڕەبیەکە لەوێ دوو پێشمەرگەی قارەمانمان ئەڵغام لەبن پێیان دەتەقێتەوە، هاوڕێ غەفور تەمەر هەر لەوێ شەهید دەبێ ،قادر ناسراو بەمامە قالە ماڵیان لەهەولێر بوو ئەویش زۆر بەسەختی بریندار بوو منیش کەشەڕەکە زۆری خایاند سوڕامەوە بۆلای ئەوان،بەڵام پێشمەرگەکان کەزانیبوویان لوغمیان لە پێشە ئیدی زیاتر نەچووبوونە پێش ،کەمن گەیشتمە لایان و شەهید هاوڕێ لەناو سیم بەجێ مابوو کاکە قادریش دیاربوو بریندارربوو وەزعی لەڕادەبەدەر خراپ بوو، جاشەکانیش کەزانییان شەهیدو برینداارمان هەیە زیاتر ورەیان بەرزبۆوەو تەقەش بەردەوام بوو ،من بانگی عەولم کرد کەلەدەستەکەی خۆم بوو گووتم مامەقالەم بەکۆڵدادە تۆزێك لەڕەبیەکە هاتینە خوارێ ئەویش لەسەر کۆڵی من ڕوحی پاکی سپارد . ئینجا پەڕاندمانەوە بۆ ئەوبەری لای دەواجنەکانی گردی چادر ،کاك جەنگی وبرادەرانی بەرەو سماقوڵی گەڕانەوە،ئێمەش لەگەڵ کاك فریادو کاك سیامەندو کاك جەعفەری حەمەدەروێش ومامە قالە، لەگەڵ برادەران هەموو بەیەکەوە شەهیدەکەمان برد لەگوندی شیواشۆکی گچکە بەخاکمان سپارد،ئێمە دوو مامە قالەمان هەبوو ئەوەی لای کاك جەنگی شەهید بوو بوو مەبەستم ئەوەیە بەخاکمان سپاردو جوابیشمان بۆ دایکی ڕەوان کرد، چونکە باوکی نەمابوو، ئینجا من بۆ ماوەیەکی باش خۆم پێشانی بەڕێز کاك کۆسرەت نەدایەوە.

## هۆیەکانی نەگیرانی ئەو ڕەبایانە:

هەبوونی دووسەگی ووریا ،شارەزایی جاشەکان کە پێشتر تەقەیان لێ کرابوو، هەبوونی لوغمێکی زۆر چونکە ئەوان دەیان زانی چوار دەورەیان

بەلوغم چێنراوە بۆیە شەڕیان کرد ماندویەتی هێزی پێشمەرگەش هۆیەکی تر بوو بۆ سەرنەکەوتنی ئەو چالاکی یە. هێشتا نەحەسابووینەوە لەداستانی سەری ڕەش تازەگەڕابووینەوە،شەهید بوونی ئەو دوو پێشمەرگەیە کەیەکێکیان شەهید هاوڕێ بوو هەرلەوێ بەجێ مابوو تاکو ماوم لەبیرم ناچێتەوە چونکە لەژیانی پێشمەرگایەتیم شەهیدو بریندارم جێ نەهێشتووە ،ئەو پێشمەرگانەی کە شەهید بوون لەو داستانە هەردووکیان لە تیپەکەی کاک جەنگی فەقێیانی بوون ،ئەو پێشمەرگەو فەرماندانەی لەو چالاکیە بەژدار بوون( جەنگی فەقێیانی ،ئەحمەد کوردە ،شەهید فریاد قەسرۆکی ، جەعفەری حەمە دەروێش ،مام سیامەند ،عەول ، بارزان موراد ،شەهید هاوڕێ ، شەهید مامە قالە ، کاک ڕەشید، شەهید گەیلان صابر ،شەهید ئامانج تاهیر ، ڕزگار شاخە پێسکەیی ،شەهید مەهدی بایز ،نادرا یمام ، "عبدالقادر أمام ،مامە قالە" ،ستار حمە شەریف ، هیدایەت حەمەد ئیلنجاغی ، مام شەریف تەتەراوەیی ،نیازمحمود ) ،بەگشتی ٥٠ پێشمەرگە زیاتر بووین بەلآم داوای لێبوردن دەکەم ناوی هەموویانم لەیاد نەماوە چونکە سالآنێکی زۆرە.

## شالآوی ئەنفال

لەمەڵبەندی یەك و دوو لە ناوچەی گەرمیان شالآوی ئەنفال ڕوویدابوو، تاوای لێهات کۆیە و دەوروبەری و دەشتی کۆیەی گرتەوە. ئێمە تیپی (٩٣) هێزێکمان لەگەڵ مامۆستا بەکر چوو بوونە دەوروبەری مەڵبەند بۆ واجبات گرتن لەدۆڵی بالیسان، کاك شێخ جەعفەر بەهێزێکەوە هاتنە دەشتی کۆیە ، من ئەو کاتە جێگری فەرماندەی تیپ بووم لەتیپی (٩٣ ) ی کۆیە کاك جەعفەرو ئەوان لەدەشتی کۆیە مانەوە تاکو دوژمن هێرشی هێنا بۆ ئەنفال کردنی دێهاتەکانی

رۆژهەلاتی کۆیە، ئێمە بارەگای تیپمان لەگوندی قزلو بوو کاک جەعفەر ئەو هێزانەی لەگەڵ بوو (تیپی (٥٥) بەسەرپەرشتی کاک جەمیل هەورامی زۆربەی تیپەکانی گەرمیان بەشێکیان لەوێ بوون تیپی (٥١) ی گەرمیان تیپی (١٧) ی زمناکۆ تیپی (٩٣) ی کۆیە هەندێك هێزی موتەفەریقە لەگەڵ مەفرەزەکەی کاك مەجید بەشی کۆمەلأیەتی)، هێندێك لەدەستەکەی مامۆستا بەکرو جیهازی تیپ و کەرتی رێکخستن و ناوچەی شۆرش گێران لەدەشتی کۆیە مابوون، لەبارەگای ئێمە کۆبووینەوە هێزەکانمان دابەش کرد بۆ ئەم شوێنانە (تیپی ٥١ ی گەرمیان لەگەڵ کاك حەمیدی قالەدزەیی و لەگەڵ حاکم سالار بۆگدی بۆ گوندەکانی کانی بی و بۆگد چونکە ئێمە لەو باوەڕەدا بووین دوژمن لەبەری گۆپتە پەشەوە هێرشمان بۆ دێنێت، تیپی(١٧) ی زمناکو کەکاك جەمیل هەورامی سەرپەرشتی دەکردن لەگەڵ هێزێکی لەشکری سەر بەمەجلیس ئەعلای ئیسلامی بوون لەگەڵ دوو مەفرەزەی هێزی پشتگیری لەگەڵ مەفرەزەکەی کۆمەلأیەتی ئەوانە لەگەڵ کاك مەجید میرخان بوون کەچاو ساغی ئەم هێزانەبوون ،لەسەر چیای تەکەڵتو تادەگاتە گوندی مخۆرس ئەوسیلسیلە شاخەیان پێ سپێردرابوو، ئەم هێزەی لەتەکەڵتو بوون کەکاك مەجید میرخان و کاك جەمیل هەورامیان لەگەڵ بوو،شەڕێکی زۆرباشیان کرد بۆماوەی بیست و چوار کات ژمێر، بەداخەوە شەهیدێکی زۆریاندا لەوانە یەکیانم دەناسی فەرمانەی کەرت بوو ناوی وەستا تاهیر بوو لەگەڵ هێندێکی لەشکری بەدر، پاش نیومرۆی ٣ /٥/ ١٩٨٨ لەلایەن فرۆکەکانی بەعسەوە گوندی گۆپتە پەو عەسکەر بۆمباباران کرا بەقومبەلەی کیمیاوی،ئێمە لەو بەری زێ بووین بەلأم جوگرافیای ناوچەکە وارێك کەوتووە کوگوندی گۆپتە پە بەرزترە لەگوندی قزلو ،بۆشەو وبۆ بەیانی ئێمە هەستمان بەبۆنی سیرو سێو دەکردو هێندێك مەڕومالأتمان دەبینی مردار دەبوونەوە بەوە زانیمان کەچەکی کیمیایی بەکار هاتووە، کاك جەعفەر لەمەڵبەندی یەك

تەجروبەی هەبوو بەمنی گووت کوردە گیان بەبرادەران بڵێ تابۆیان دەکرێ بابچنە سەربەرزایی یەکان جیهازەکەش بێتەوە لای خۆمان، بارەگا لەناو باخچەکانی خواریٚ بوو من ئاگاداری کاک کۆچەرم کرد کە ئەو بەرپرسی جیهاز بوو چونکە شوێنەکەی ئێمە لەناو دێ شوێنێکی بەرزتربوو، وورده وورده هێزی دوژمن دەیان ویست لەلای تەق تەقەوە بێنە قولایی دەشتی کۆیە بەلام ئەو هێزەی کە لەچیای تەکەلتو بوون شێرانە لێیان هاتنە دەست وشەڕێکی بیست وچوار کات ژمێریان لەگەڵ کردن نەیانهێشت دوژمن لەوەزیاتر بێتە پێشەوە کەهەر ئەو شەڕەش بوو بووە هۆی ئەوەی کەوا ئێمە دواتر دەربچین و لەدەشتی کۆیەوە بەرەو ناوچەی شیواشۆك ودارەبەسەر لەوێشەوە بۆ مەڵبەندی سێ ،دوژمن لە جادەی کۆیەوە هێرشی هێنابوو هەروەها لەجادەی کۆیەبەرەو حاجی قەلا، لەکۆیەوە بەرەو قۆڕیتان لەدۆڵی خەلەکانیشەوە بۆپشتی گوندی قازبەگیان وحاجی قەلا، ئەوان دەیانویست ئەم ناوچەیە ئابلۆقە بدەن بەجەیش و جاش ،لەبەرپرسەکان تەنها من ماڵ ومنداڵم لەگوندی قزلو مابوو من لەوڕۆژە بەبەردەوامی سەردانی هەموو جەبهەکانم دەکرد خواردن و فیشەك و گوللە ئاربیجیم بۆ دابین دەکردن چونکە من سەرپەرشتی جەبهەکەم دەکرد مامۆستابەکر سەرتیپمان بوو بەلام ئەو بەهێزێکەوە لەگەڵ فەرماندەی کەرتەکان واجبیان پێ سپێردرابوو لەمەڵبەندی سێ لەبەنی هەریر قۆپکی حەمەد ئاغا ،سەعات چواری ئێوارە چووم بەرەو ڕێگای حاجی قەلا کەسەردانی ئەو جەبهەی ئەوێ بکەم کەتەماشام کرد لەسەرجادەی قیر قەرەباڵغی یەکی زۆر لەبەردەم گوندی حاجی قەلا لەسەر جادە وەستاون،هێواش هێواش لێیان نزیك بوومەوە تەماشام کرد زیاتر لە پەنجا تراکتۆری مەدەنی کە پڕبوون لەژن و منداڵی ناوچەکە ڕوویان سوڕاندبۆوە بۆدەشتی کۆیە،نەیان هێشتبوو بڕۆن بۆناو کۆیە، کوڕێکم لەگەڵ بوو بەناوی هیدایەت خەڵکی گوندی ئیلنجاغ بوو،

ئێستاش لەژیان داماوە پێم گووت هیدایەت بزانە بۆ ئەم تراکتۆرانە ڕوویان سوڕاندۆتەوە بۆ لای دەشتی کۆیە ئەمە کێ وای کردووە؟ هیدایەت چووە ناو تراکتۆرەکان و گەڕایەوە لای من و گووتی کاك حەمەسورو چەند پێشمەرگەیەکن دەڵێن باخەڵك نەڕوا بۆ کۆیە لەبەر ئەوەی هێزی پێشمەرگە شەڕی بۆناکرێ و ورەی دادەبەزێ، بەلأم من لەلایەن بەڕێز کاك ئەوشیروانەوە بروسکەم بۆ کرابوو کەوا ڕێ لەخەڵك نەگرین خەڵك بۆخۆی ئازادە چارەنوسی خۆی دیاری بکات ،بۆیە من وەك بەرپرسی ناوچەکە دابەزیم وخۆم قسەم لەگەڵ حەمەسور کرد پێم گووت بۆچی ئەوخەلکەت ڕاگرتووە زەمیرت مورتاحە؟ ئەویش گووتی ئەگەر خەڵك بڕوات هێزی پێشمەرگە ورەی دادە بەزی وشەڕ ناکرێ ،منیش گووتم کاك حمە سور خەلکی مەلبەندی یەك ودوو زۆر بەردەستی حکومەتی بەعس کەوتوون با خەلکی ناوچەکەی ئێمەش وای بەسەر نێت،بۆیە پێم باشە ئەوڕێگایە بەربدەی خەلکەکە خۆی ئازادە لەڕۆیشتن حمە سوریش تۆزێکی لەدڵ ناخۆش بوو بەلأم هیدایەت بەهەموو سەیاق تراکتۆرەکانی گووت : تراکتۆرەکانتان هەلکەن وبسوڕێنەوە بۆ کوێ دەڕۆن بڕۆن، ئەگەر بۆتان دەکرێ کاروانی تریش بکەن و خەلکی تریش ڕزگار بکەن لەوێ خەلکەکەمان ئێزن داو کاك حمە سوریشمان لابرد لەسەر ڕێگاکەیان ،گەڕامەوە بۆ سەرجادەی خەرابە، لەوێ توشی پێشمەرگەیەك بووم لە پێشمەرگەکانی هێزی پیشتگیری بوو لەمەفرەزەکەی کاك ئەبوزێد ، ئەبوزێد بەرپرسی هێزی پشتگیری کانی ڕەش بوو ،ئەو پێشمەرگە پێی گووتم : مەفرەزەیەك پێشمەرگە لەلای مەلا زیاد سەیتەرەیان داناوە لەهێزەکانی پێشمەرگەی گەرمیانن ناهێلن خەڵك بڕوات بەهەمان شێوەی حاجی قەلاّ، من بامدایەوە بۆگوندی مەلازیاد شۆڕبوومەوە کەگەیشتمە لای مەفرەزەکە هیچیانم نەدەناسی لەلای ڕاستی گوندی مەلا زیاد بوون، قسەم لەگەڵ کردن کەئەوانیش خەلکیان زۆر ڕاگرتبوو بەلأم ئەو خەلکانەی لەوێ

بوون بەزۆری خە ڵکی بەری بیست وپێنجی خاڵخاڵان وناوچەکانی ئەوبەربوون بە پێ هاتبوونە ئەوبەرە، لەوەمەفرەزەیە کەلەسەرێگا کەبوون کەسیانم نەدەناسی بەلاَم خۆم پێ ناساندن و گووتم من ئەحمەد کوردەم جێگر تیپی ۹۳ ی کۆیەم بەرپرسی ئەو ناوچەیەم بۆیە داواتان لێ دەکەم ئەورێگایە چۆڵ بکەن با خەڵك ئازاد بێ ، پیاوێکیان لەگەڵ بوو ناوی عەلی بوو هەرچۆنێك بێت لە پێش خەڵکەکە لامان بردن دەیان گووت :ئەگەر ژن ومنداڵ بڕوات ئێمە شەرمان بۆناکرێت منیش لێیان توڕە بووم وپێم گووتن دیارە ئێوە بەس لەناو ژن ومنداڵ شەڕتان پێ دەکرێ ،گەڕامەوە بۆ لای کاك شێخ جەعفەر مەسەلەکەم بۆ گێڕایەوە، کۆچەری عدد جیهازیش لەلای وەستا بوو گوێ ی لەقسەکانمان بوون گووتم ئەوهام پێ گووتوون کاك جەعفەر گووتی نەدەبوو وایان پێ بڵێ ی من هەمان قسەم لای کاك جەعفەریش دووبارەکردەوە دیاربوو کۆچەریش زۆر کەیفی بەقسەکانی من هات،بەم شێوەیە ئەم رۆژەمان بەسەربرد ،لەشەڕەکەی سەری ڕەش سەد پارچە چەکی سوك و قورسم هێنابوو وەك دەسکەوتی شەڕ کەگەڕاینەوە دەشتی کۆیە لەگەڵ مامۆستا بەکر تەگبیرمان کرد کەئەوچەکانە چی لێ بکەین ؟ گووتمان واباشە بۆهەموو گوندەکان هێزی پشتگیری دروست بکەین لەزۆربەی ئەو گوندانەی نزیك بوون لەشارەکان کە جاش بێزاری کردبوون هێزی پشتگیریمان لێ دروست کردن، گوندی مخۆڕس گوندێکە نزیکە لەشارۆچکەی تەق تەق،جاشەکانی تەق تەق بێزاریان کردبوون شەوانە دەچوون پارەیان لێ دەستاندن یان فیرارەکانیان لێدەگرتن بە پارە بەکەس وکارەکانیان دەفرۆشتنەوە، کاك مەجید میرخان کوڕێکی بۆدەست نیشان کردم بەناوی محمد ڕەعنا خۆشم برادەرێکم هەبوو بەناوی حسێن ، دوو مەفرەزەمان بۆمحمەد وحوسێن دروست کرد بەلاَم زۆر بەغیرەت بوون،دوو مەفرەزی پیشتگیریمان ڕێکخست لەگوندی مخۆڕس، محمەد قەناسێك وحەوت کلاشنکۆفم دایێ ،کاك

حوسێن یەك بیکێسی ویەك ئاربیجی وحەوت کلاشنکۆفم دایێ ئەویش مەفرەزەیەکی باشی دروست کرد.هەر لەدوای دروست کردنی ئەم هێزە پشتگیریە لە مخۆرس جاشەکانی تەق تەق هەروەك وجاران هێرشیان کردبووە سەر گوندەکەو زۆر بێمنەتانە ،بەلام هەردوو مەفرەزەکە شەوان کۆدەبوونەوەو واجباتیان دەگرت شەوێك جاشەکان دێن بۆناو دێ هەردوو مەفرەزەکەش لێیان دەدەن ودوو جاشیان لێ دەکوژن کەبووە هۆی چاوشکاندنی زۆربەی ئەوجاشانەی کەشەوان بۆ گوندەکان دەردەچوون.لەو ڕۆژەوە گوندی مخۆرس حەسانەوە ،کاك حوسێن وکاك محمەد ڕەعنا هەقەشۆڕش مووچەی فەرماندەیان بۆسەرف بکات ،هەر لەو چەکانەی کەباسم کرد لەسەری ڕەش هێنابووم مەفرەزەیەکی ترم دروست کرد لەگوندی کانی ڕەش پێکهاتبوون لەدوازدە کەس بەسەرپەرشتی کاك ئەبوزێد کانی ڕەشی کە گەنجێکی چالاك بوو.لەگوندی حاجی قەلاش مەفرەزەیەکم دروست کرد پێکهاتبوون لەدەکەس بەسەر پەرشتی کاك ناودێر کە پێشمەرگەی خۆمان بوو لەدێی حاجی قەلا دانیشتبوو ماندووببوو.

لەگوندی شەوگێڕو کفرە دۆڵ وبامورتکان بەسەرپەرشتی سەعید و مەولود پێکهاتبوون، بیست کەس بیست کلاشینکۆف وئاربیجیەکم پێ دابوون ئەوان زۆربەی جارەکان کەهێزی پێشمەرگە لەناوچەکە نەدەبوو شوێنی ئەوانیان پڕ دەکردەوە ، خەڵکی گوندەکانیش بەئیسراحەت دەنوستن بۆیە دەڵێم حەق وایە خزمەتی هێزی پشتگیری بەخزمەتی هێزی پێشمەرگە حساب بکرێ دواتر هەموو هێزەکان کۆبووینەوە بۆ ئەوەی دەربچین لەناوچەکە. کاتژمێر چوارو نیوی ئێوارە هەموو لەباخچەکانی بانە گولان کۆبووینەوە کەنزیکەی هەزاروسەدو پەنجا کەس دەبووین، کە پێك هاتبووین لە پێشمەرگەو پشتگیری وفیرارو ژن ومنداڵ و گەنج ،لەبەر گوندی بانە گولان سێ گوێدرێژمان پێ بوو، یەکیان بۆ جیهازەکەو یەکیان بۆ پێشمەرگەیەکی بریندار بوو بەناوی عەول

ئەوی تریشیان لای پێشمەرگەیەك بوو کەل و پەلی لێ بـارکردبوو ،کـاك شـێخ جەعفەر هێندەی قسە بۆ کردین وباسی هیمەت و رۆژی رەشی کرد روویکردە کاك حمەسورو گووتی کاك حمە سور تـۆ مـاوەی چـەند سـاڵێکە لـەرژێم ولەئێمـە قاچاغی ئەم شەو هیمەت بکەو ئەم پێشمەرگەو خەڵکە رزگـار بکـە بـەرەو رۆژ ئاوای کۆیە . کاك حمە سور لەوەلأم دا گووتی کاکە شێخ ئەگەر بەرەو شـاخ بـێ من شارەزام بەلأم بەرەو دەشت هیچ نازانم . ئینجا کاکە شێخ رووی دەمی کردە من و گووتی کاك ئەحمەد کوردە جەنابت چیت پێدەکرێ؟ من گووتم پـێش دەکـەوم ورزگارتـان دەکەم بـەلأم بەمـەرجێك ئەگـەر هـات وئێمـە لە پێـشەوە تووشـی شەربووین کەس تەقە نەکات ،لەوکاتە دا جەوهەری ناسـك لەگـەڵ ئـەنوەری برای دەستی بلند کردو گووتی :کوردە گیان بابۆ خۆمـان پـێش کـەوین پیـاوی لێقەومان کەم بووە ،ناوی خوامان لێ هێنا بەرەو گوندی بانە گولأن بەرێکەوتین کەمێکیش تاریك داهاتبوو بەلأم جەیش وجـاش نەگەیـشتبوونە گونـدی بانـە گولأن ،گوندی بانەگولأن قەبرستانێکی کۆنی لێ یە کێلـەکانی بەقـەد بـالأی پیاو بەرزن،کەنزیك بووینەوە وامان زانی ئەو کێلانە هەمووی جـاش وجەیـشن تـابۆمان کەشف بوو کەکێلی قەبرستانەکەیە تۆزێکی تـاخیر کردین ،خۆمان کرد بەناو گوندی بانە گولأن وتوشی کاك مەلا تـایر بـووین کـە پیـاوێکی دیـاری ناوچـەکەیەو خـۆی و برایـەکی و برازێنکـی ومنـداڵێکی بـچووك، ئـەوانیش بەگەرمان کەوتن و بەرێ کەوتین گەیشتینە گوندی ناسراغا ،گونـدی ناسـراغا خانوەکانی دەسوتـان و جاش و جەیش دەنگیان دەهات کەمێك لـەوان لامـان داو بەتەنیشتیـان دا رۆیشتین و تەقەیان لێ کردین بەلأم گوێمان پێ نەدان، لەوان رەت بووین توشی پارچـە زەویـەك بـووین کـە نیـسکی لـێ چـاندرابوو لـەوێ هێزەکەمان کەمێك تـاخیر بوو،من گەرامەوە بۆ دواوە لە نـاوەنـدی رەتلەکـەمان یەك لەگوێ درێژەکان لەقور عاسێ ببوو بەلأم کەس تـاقەتـی نەبوو دەری بهێنێ

بەسەر پشتی گوێ درێژەکە هەموویان دەپەڕینەوە ببوو بە پرد تا وای لێ هـات لە قوڕەکە نقوم بوو دواتر گەڕامەوە پێشەوە، بەڕێکەوتینەوە گەیشتینە نێـوان گوندی پەلکانەو قۆڕیتان بینیمان کۆمەڵە جاشـێك ئاگریـان کردبـۆوە ،کـاك جەوهەر بەبانگی بەرز بانگی کردن هەر لەخۆیـەوە گـووتی جەماعـەتی کـێن ئەوان جوابیان دایەوەو گووتیان ئێمـە جاشـین ،کـاك جەوهـەر گـووتی ئێمـە پێشمەرگەین و هەزارو قسور کەسین تەقەنەکەن ئەگەرنا بەدەستی دەتـان گرین ئەوانیش گووتیان ئێمە تەقەلە پێشمەرگە ناکـەین بۆخۆتـان بـڕۆن لـەوان دەربـاز بووین گەیشتینە گوندی داربەڕووله کە دەکاتە نزیك جـادەی کۆیـە ـــ تەق تەق ،هێزەکەمان لە جادە پەڕاندەوە و بەرەو گوندی شیواشۆکی گەورە مـن بەکاك جەوهەرم گووت"تۆ لەگەڵ برادەران لە پێشی ڕەتلەکە برۆ من لەکۆتـایی ڕەتلەکە دێم ئەوەك پێشمەرگەیەك بەجێ بمێنێت لەسەر جادە قیرەکە،لەسـەر جادە قیرەکە شوێنی پێمان دیار بوو کە لە جادەکە پەڕیبووینـەوە جادەکـەمان پیس کردبوو ،بۆیە من بیرم کردەوە (گیڤارا ) لە شەڕی پارتی زانی لـە هـەموو شوێنەکان شوێن پێی خۆی بزر دەکرد منیش بـانگی صـباح و رزگـارو گـەیلان و مام شەریفم کرد کە لە دەستەکەی خۆم بوون گووتم "ئێرە تـانکی عەسکەری لێ یە وە گۆمیشی لێ بوو جادەکەمان جوان شوشت نەمان هێشت هیچ شـوێنەوارێکی پەڕینەوە بمێنێ عەولیش بە خۆی و گوێ درێژە سپیەکەی لە دیارمان وەستا بوو چونکە بریندار بوو ،کە بەڕێ کەوتین بۆ خۆی دابەزی گووتی من تۆزێـك بـە پێ دەڕۆم لەشم سڕ بووە تۆ سواری گوێ درێژەکە بە، منیش ماوەی ١٠ خولەك بە گوێ درێژ ڕۆیشتم، شوێنێك هەیە پێ ی دەڵێن شیوی سامالْ بەلام ڕەبیەکانی دوژمـن بە سەر ئەو شیوە قولەدا زاڵن لەم شیوە دانە دانە پێشمەرگەو خەڵك خـەویان لێ کەوتبۆوە لەبن شاخەکان ، دنیاش وردە وردە ڕووناك دەبوو هـەر چـۆنێك بێ هەمووم هەستاندن و گەیاندمنە گوندی شیواشۆکی گەورە (شیواشۆك هـەموو

ماڵەکان باریان کردبوو ،لەخانیەکەی مام هاوار کە خەڵکی گوندی مام قلینج بوو بەلام لەویّ مەڕدار بوو دوومەڕ لەناو خانوەکەی بەجیّ مابوون ) کاك جەعفەرو کاك کۆچەر بەرێکەوت چووبوونە ئەو خانووە منیش چوومە لای ئەوان . ئەو دوو مەڕەی لەویّ بەجیّ مابوون لەبەر چاومان دەهاتن و دەچوون بەلام کەس توانای ئەوەی نەبوو بچیّ سەریان برِیّ لەبەر هیلاکی و ماندویەتی کات ژمێر ۱۰ ی پێش نیوەڕۆ کاك جەعفەر بەکۆچەری گووت کۆچەر جیهازەکە دا بمەزرێنەو پەیوەندی بە مەڵبەندەوە بکە بزانین دەنگوباسی ئەوان چی یە؟ چونکە ئێمە ماوەی ٢٤ سەعاتە جیهازمان هەڵگرتووە پەیوەندیمان نەماوە،کۆچەریش لەگەڵ یەك دوو پێشمەرگە جیهازەکەیان دامەزراند و پەیوەندی کرد بە جیهازی مەڵبەند کە ئەو کات خەباتی مام شریف و جواد لەگەڵ جەنگی برای کاك کۆسرەت عدد جیهازی مەڵبەند بوون وەلامیان دایەوەو گووتیان ئێوە چیتان بە سەر هاتووە ماوەی ٢٤ سەعاتە ئێوە پەیوەندیتان نەکردووە،کۆچەریش ووتی ئێمە لە گوندی بەر پرسەکەتانین مەبەستی شیواشۆك بوو کە شوێنی ولادەی کاك کۆسرەتە ، دیار بوو کاك کۆسرەتیش لەنزیك جیهازە کە بوو یەکسەر جیهازەکەی وەرگرتوو بە کۆچەری گووت کۆچەر ڕاستە دەڵێن برادەری دووەمی مامۆستا بەکر تەسلیم بۆتەوە ئەگەر تەسلیمیش نەبوویتەوە ئاگاداربن تەسلیم دەبێتەوە منیش لەو کاتە لەنێوان کۆچەرو شێخ جەعفەر دانیشتبووم لاقیتەی جیهازەکەم لە کۆچەر وەرگرت و قسەم لەگەڵ کاك کۆسرەت کرد کاك کۆسرەتیش پێکەنی و گووتی کوردە وام زانی تەسلیم بویەوە پڕو پاگەندەت زۆر لە سەرە ئاگاداری خۆت بەلەناحەزانت من فەرماندەکی دێرینی یەکێتی بووم بۆیە ناحەزەکانم خەویان پێوە دەبینیم یان دەیانگووت تەسلیم بۆتەوە یان دەیان گووت کوژراوە .بەلام لە ڕاستیدا هیچیان ڕاست نەبوون،دیار بوو کاك مەجیدو کاك جەمیل هەورامی و هێزەکەیان دوای

شەڕێکی زۆر قارەمانانەو بێ وێنە لەگەڵ دوژمن لەقۆڵی چیای تەکەڵتو وشەهیدبوونی چەند پێشمەرگەیەکی قارەمان بۆ ئێوارە پەڕیوونەوە گوندی مەرزان ، بۆ پاش نیوەڕۆکەی یەکترمان گرتەوە لەگوندی شیواشۆك دواتر كاك شێخ جەعفەر هێزەکانی بەرێکرد بۆلای مەڵبەند (كاك کۆسرەت ) لە سماقوڵی ،من وشێخ و چەند پێشمەرگەیەك وەك پیشەی پێشمەرگایەتی خۆمان چووین بۆ لای كاك فارۆقی عەلی مەولود کەماڵی لەناو شاخەکانی کۆلکەبی بوو برینددار بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆمان بیبەین بەجێ نەمێنێ، پێش ئەوەی بگەینە ماڵی كاك فاروق لە پارچە زەویەك تەڕەپیازو پاقلە کرابوو ئێمەش خواردمان دیار بوو تە ندروستی زۆر بەمانی تێکدا بەلام کە گەیشتینە ماڵی كاك فاروق حەیوانێکیان بۆسەربڕین بەشلەساوار بۆیان لێ نان ،لەماڵی كاك فاروق پێش ئەوەی بەڕێ بکەوین صباح ورزگارو مام شەریف مساعدەیان لێ وەرگرتم کەبچن سەردانی گوندی شاخە پێسکە بکەن کە سوکارەکانیان لەوێ بوون بەلام هەرسێ کیان نەهاتنەوە لام و دوایی تەسلیم ببوونەوە بەچەکەوە، مامە قالە وعەول ئەوانیشم لەوناوچەیە بەجێ هێشت مامە قالە دەیزانی دەرزی لێ بدات عەولیش عیلاجی هەبوو گووتم سەردانی خزم و کەس وکاربکەن لەدەورو بەری کۆیە خۆتان پەنا بدەن تا عەول باشتر دەبێت، پاشی ماوەیەك هاتن بۆلام لە دۆڵی بالیسان ،ئێمەش بەڕێ کەوتین بۆ سەرجادەی کۆیە- هەولێر، نزیکی جادەبووینەوە توشی سوارێك بووین دەنگماندا دواتر ناسیان کە پێشمەرگەیەك بوو بەناوی کەریم عوسمان شیواشۆکی دیاربوو لەمەڵبەندەوە بە ئیش و کار ڕەوان کرابوو بۆ ناوچەی شیواشۆك و دەوروبەری ،دواتر بەڕێ کەوتین تاگەیشتینە نزیك گوندی کرۆژ لەوێ كاك شێخ جەعفەر و كاك فاروق لەمن دابڕان چوون بۆمەڵبەند ،منیش چوومە ناو دێ ی کرۆژ کە چۆڵ کرابوو بینیم دوو کەس بەناوەکانی شاخەوان و بارزان برابوون فێرار بوون بەتەنها لەوێ

دانیشتبوون ( زگورتی بوون ).ئەو دووانە تۆزێك دەبوونە خزمی من بۆیە ئانێکمان لاخواردن دوو کوڕی حاجی عبداللەی قزلوم لەگەڵ بوو کە لەگەڵ خۆم هێنابوون بەناوەکانی ( رزگارو وەلی ) هەردووکیانم لای کاك شاخەوان و کاك بەرزان بەجێهێشتن بەلآم بەداخەوە دواتر زانیم رزگارو وەلی چووبوونە ناو شاری کۆیە لای ماڵی مامەی مام یەحیا بەداخەوە بەر شالآوی ئەنفال کەوتبوون . پاشان بەرێکەوتم بەگوندەکانی خۆشناوەتی بەرەو بالیسان کە پێشتر مامۆستا بەکر لەگەڵ تیپەکەی خۆمان جە بهەی کۆپکی حەمەد ئاغایان وەرگرتبوو لەبەنی هەریر، منیش چووم بۆ لای ئەوان لەگەڵ تیپەکەی خۆمان ،بە یەکتر شاد بووینەوە دواتر بیستمانەوە کە دوو پێشمەرگەی دەستەکەی بەرێز مامۆستا بەکر لە دەشتی کۆیە بەجێ مابوون بەناوەکانی ( عبدالله ئەحمەد شەریف خەرابەیی لەگەڵ خالیدی برای عمر ژێرسە پیرداودی ) جەیش گرتبوونی دواتر لە کۆپتەر لە ئاسمانەوە فڕێ درابوونە خوارەوە، بەداخەوە تا ئێستاش تەرمی پیرۆزیان نەبینراوەتەوە . ئەنفالی دەشتی کۆیە رۆژی یەکەم و دووەم بەم شێوەیە بوو کە باسم کرد.

## ***یەك گرتنەوەمان لەگەڵ بەرێز مامۆستا بەکرو کەرتەکان من کەگەیشتمە لای ئەوان ئەم پێشمەرگانەم لەگەڵ مابوو***

دکتۆر ئازاد و دکتۆر هاوتا کە هەردووکیان برابوون.
کۆچەری عدد جیهازو موشیر عدد جیهـــــــاز .
عبدالله ئاسراغەیی ، بەرزان مـــــــوراد.
گەیلان صابر و هیدایەت حەمـــــــەد.

